شەهید سەربەست مەحموود



# سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە

کۆبەرهەم

2002
چاپی یەکەم

هەولێر - باشووری کوردستان

شەهید سەربەست مەحموود

# سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە

( کۆبەرهەم )

چاپی یەکەم ٢٠٠٢
هەولێر - باشووری کوردستان

لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی ڕێکخستنی YNDK

* سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە
* کۆبەرهەم
* شەهید سەربەست مەحموود
* تیراژ: ٥٠٠ دانە
* چاپی یەکەم: ٢٠٠٢
* لە بڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی ڕێکخستنی YNDK
* پیت چنین و نەخشەسازیو بەرگ: کۆمپیوتەری دەریا
* چاپخانە: چاپخانەی ئۆفسیتی هەولێر
هەولێر- باشووری کوردستان

**شەهید سەربەست مەحموود**

**ئەندامی مەکتەبی سیاسی**

**یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان YNDK**

**سەرنووسەری رۆژنامەی میدیا**

* سەربەست مەحموود،

ڕۆژنامەنووسێکی شارەزاو ئازاو هەق بێژبوو.

**پرۆفیسۆر د.جەمال نەبەز**

* شەهید سەربەست مەحموود

سیاسەتکارو قەڵەمێکی بوێرو هەقگۆبوو.

**غەفوور مەخمووری**

* سەربەست مەحموود، خەباتکارو سیاسەتمەدارو

ڕۆژنامەنووسێکی زۆر بەنرخی نەتەوەکەمان بوو.

**جەواد مەلا-**

**سەرۆکی KNC**

* شەهید سەربەست مرۆڤێکی تێگەیشتوو پێگەیشتوو بوو

لەسەر بیرو باوەڕ ماڵ و کەس و کاری خۆی جێهێشتبوو.

**حوسێنی یەزدانپەنا**

**سکرتێری (ی.ش.گ.ك)**

# پەیڤێکی وەفاداری

## غەفوور مەخمووری

ئەم کتێبەی بەردەستت، بەشێکی زۆری بەرهەمە هزرییەکانی شەهیدی ڕێبازی کوردایەتی شەهید (سەربەست مەحموود)ە، کە بەهزرێکی نەتەوەیی‌و لەدیدگایەکی کوردانەوە نووسراون. شەهید سەربەست زۆر بیری دەکردەوەو لێکدانەوەی وردی بۆ هەر شتێك هەبوو، کەسێك بوو دەیویست رامان و هزری تایبەتی خۆی بۆ هەر بابەتێك هەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش بەردەوام دەیخوێندەوە، لەخوێندنەوەشدا زۆر زیرەکانە بابەتەکانی هەڵدەبژرادو حەزی دەکرد کەسێکی تریش هەمان بابەتی خوێندبێتەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵیدا گفتوگۆ لەسەر بابەتەکە بکەن. زۆر شەیدای بابەتی هزری‌و فەلسەفی بوو. زۆربەی هەرە زۆری ڕێبازە هزری‌و فەلسەفییەکانی خوێند بۆوەو تێیاندا قووڵ ببۆوە. بەو پێیەی کە هەردووکمان هاوپۆل و دووبرای ئازیزی یەکتر بووین لەکۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین- هەولێرو زۆربەی کاتەکان بەیەکەوە بووین و پاشتریش لەرۆژی دامەزراندنی YNDKوە کە یەکێك بوو لەدامەزرێنەرانی YNDK تارۆژی شەهید بوونی هەر بەیەکەوە بووین و خۆشەویستی یەکتر بووین. لەسەرەتای ناسینی شەهید سەربەست-ەوە هەستم بە توانا هزرییەکانی ئەو کرد، کە سەرەتا زیاتر نزیکی باڵە مارکسییەکان بوو، هزرو بۆچوونەکانی کارل مارکس و لینین-ی باش خوێندبۆوەو تێیان گەیشتبوو، ئەو شەوانەی لای یەکتر دەماینەوە بەردەوام گفتوگۆمان لەسەر بابەتە هزرییەکان دەکردو بیرو بۆچوونی خۆمان لەسەر هەر بابەتێك دەخستە روو، پاشتر لەئەنجامی تێگەیشتنی خۆیی‌و گفتوگۆکانماندا، شەهید زیاتر لە هزری نەتەوەیی نزیك بۆوەو کەوتە خوێندنەوەی وردی ئەو بابەت و نووسینانەی کە لەم بوارەدا نووسراون بەتایبەت نووسینەکانی بیرمەندی گەورە مامۆستا جەمال نەبەز کە کاریگەری زۆریان بۆ سەرتێگەیشتنی ئەو هەبوو.

شەهید سەربەست، لەخۆوەو رەمەکییانە بڕیاری وەرنە دەگرت، بەڵکو بۆ هەر شتێك تێڕامانی هەبوو، بەباوەڕەوە نەبووا تێکەڵی هیچ شتێك نەدەبوو. چ لەنووسین و چ لە سمینارەکانیدا بەوپەڕی بوێرییەوە بۆچوونەکانی خۆی دەخستە روو، ئامادەبوو

بۆ باوەڕهێنان بە بەرامبەرەکەشی بەگیانێکی لەخۆبوردووانە گفتوگۆ بکات.

لەبواری رۆژنامەنووسیدا، رۆژنامەنووسێکی بوێرو هەقگۆبوو، بەردەوام بە بۆچوونە نەتەوەییەکانی خۆی دوژمن و داگیرکەرانی کوردستانی لەقاودەدا ئەوەی سەیری (میدیا) بکا ئەمەی بەروونی بۆ وەدەردەکەوێت.

لەبواری رێکخستنیشەوە، رێکخستنکارێکی چالاك و کاریگەری YNDK بوو ماوەیەکی زۆرو تارۆژی شەهید کردنی بەرپرسی مەکتەبی ناوەندی رێکخستنی YNDK بوو، لەسەر دەستی ئەوداو لەرێی خولە رۆشنبیرییەکانی کە رێکی دەخستن چەندین کادیری بەتوانای بۆ YNDK پەروەردە کردو هێنایە بەرهەم، لەم بوارەدا مامۆستایەکی زیرەك و دڵسۆزو کارا بوو، جێ پەنجەی بەتەواوی کارەکانی YNDKوە دیار بوو. شەهید سەربەست، بوونی کاریگەری خۆی لەگۆڕەپانی سیاسیو رۆژنامەوانی کوردستاندا سەلماندبوو، هەر ئەمەش بوو تیرۆریستان ئەوانەی ئاشنای ژیانی ئەشکەوت و جەهالەتن، چاویان بەم چرا گەشەی رێبازی پیرۆزی کوردایەتی هەڵنەهات و کوژاندییانەوە.

شەهید سەربەست، مرۆڤێکی زۆر خاکەڕاو بێ فیزبوو لەگەڵ ئەوەی کە ئەندامی مەکتەبی سیاسیو بەرپرسی مەکتەبی ناوەندی رێکخستنی YNDKو سەرنووسەری رۆژنامەی میدیا بوو، بەلام هەمووکات خۆی وەك کەسێکی سادە دەخستە روو، بەهیچ شێوەیەك چاوی لەپلەو پایەو دەسکەوتی کەسی نەبووەو کاری بۆ نەکردووە. بەڵکو تەواوی کارەکانی بۆ رێبازی پیرۆزی کوردایەتی بووەو لەخەمی بەدیهێنانی (کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادو یەکگرتوو دیموکرات)دا بووە. تیرۆریستان بواریان بدابووایە، شەهید لەداهاتوودا دەبووە یەکێك لەبیرمەندە گەورەکانی نەتەوەکەمان و خزمەتێکی زۆری پێشکەشی نەتەوە ستەمدیدەکەی دەکرد. شەهید هەرچەندە بەتەمەن لاو بوو، بەلام بەهزرو بۆچوون کەسایەتییەکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بوو، زۆر پێش تەمەنی خۆی کەوتبوو.

* ئەوەی بەوردی بابەتەکانی دووتوێی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە توانا هزریو ئایدۆلۆژییەکانی شەهیدو ئەم راستییەی بۆ بەدەردەکەوێت.

**- نەمریو سەربەرزی بۆ شەهید سەربەست و تێکڕای شەهیدانی رێی سەرخۆبوون و ئازادی کوردستان.**

**- مردن و رووڕەشی بۆ تیرۆریست و بکوژانی شەهید سەربەست.**

**هەولێر- باشووری کوردستان**

١٥ / ١٦-٥-٢٠٠٢

# کورتەیەك لەژیاننامەی
# شەهید سەربەست

* شەهید سەربەست مەحموود ناوی تەواوی (سیروان مەحموود فەتاح)ە، ساڵی ١٩٧٤ لەگوندی (مۆریاس)ی سەر بەقەزای شارباژێری پارێزگای سلێمانی لەدایك بووە.

* بنەماڵەو خێزانی شەهید سەربەست مەحموود بەشۆڕشگێڕیو وڵاتپارێزی ناسراون باوکی شەهید سەربەست بەڕێز (حاجی مەحموود) بەشدارییەکی زۆر چالاکانەی کردووە لەشۆڕشی ئەیلولی مەزندا بەسەرۆکایەتی بارزانی نەمرو، بەپێشمەرگەیەکی زۆر چەلەنگ و ئازا ناسراوە، بەردەوام دوای هەڵگیرسانەوەی شۆڕش لەساڵی ١٩٧٥دا لەپەیوەندیدا بووە لەگەڵ شۆڕش، شەهید سەربەستیش بەمنداڵی چەند جارێك لەگەڵ باوکیدا سەردانی ناوچە ئازادکراوەکان و پێشمەرگەی کرد بوو.

* خوێندنی سەرەتایی لەگوندی (مۆریاس) تەواو کردووە.

* هەردوو قۆناغی ناوەندیو دواناوەندی لەشاری سلێمانی تەواو کردووە.

* هەر لەتەمەنی قۆناغی دواناوەندیدا دەست دەکات بەخوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەو پەرتووکە جیاجیاکان.

* ساڵی ١٩٩١ دەبێتە قوتابی بەشی کوردی کۆلیژی ئادابی زانکۆی سەلاحەددین. شەهید سەربەست وەك قوتابییەکی رەوشت بەرزو خاوەن هزرێکی چەپی رادیکاڵ و ئینجاش لەڕێگەی پەرتووکەکانی بیرمەندانی نەتەوەیی لەسەرووی هەمووشیانەوە لەڕێگەی پەرتووکەکانی مامۆستا جەمال نەبەزەوە وەك مرۆڤێکی نەتەوەیی بەنێوبانگ دەبێت.

* ساڵی ١٩٩٥ بەپلەیەکی زۆر باش خوێندنی زانکۆی تەواو کرد.

* لەڕۆژانی ١٧و ١٨و ١٩٩٥/٣/١٩ وەك ئەندامێکی دامەزرێنەر بەشداری کردووە لەیەکەمین کۆنگرەی یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان YNDK کە لەشارۆچکەی عەنکاوەی پارێزگای هەولێر بەستراو دوای تەوواو بوونی کۆنگرەکە لەڕۆژی نەورۆزی ١٩٩٥دا YNDK هاتە راگەیاندن.

* شەهید سەربەست مەحموود هەر لەیەکەمین رۆژی دامەزرانی YNDKوە زۆر بەگیانێکی نەتەوەییانەوە دەستی بەتێکۆشان کرد، رۆڵێکی زۆر سەرەکی گێڕا لەڕزگار کردنی YNDK لەپاشکۆیەتیو هاوپەیمانێتی PKK کاتێك کە PKK لەشەوی ٢٥-١٩٩٥/٨/٢٦ شەڕی دژی پ.د.ك راگەیاندو هێرشی کردە سەر چەندین گوندو ناوچەی باشووری کوردستان.

* لەڕۆژانی ٥و ٦و ١٩٩٦/٥/٧ لەشارۆچکەی شەقلاوەدا زۆر چالاکانە بەشداری کرد، لەدووەمین کۆنگرەی YNDKداو، لەهەڵبژاردنێکی دیموکراتیانەدا بەئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی هەڵبژێردراو ئینجاش بوو بەئەندامی مەکتەبی سیاسیو بەرپرسی رێکخستن.

* لەدوای کۆنگرە سەرەڕای فشارو راوەدوونانی دەستەڵاتدارانی سلێمانی زۆر چالاکانە کاری رێکخستنی لەشاری سلێمانیو ناوچەی شارەزوورو هەوراماندا ئەنجام دەدا، سەرپەرشتی کاروباری رێکخستنی YNDKی دەکرد.

* لەکۆتایی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٩٨ وەك ئەندامی لیژنەی ئامادەکاری کۆنگرەی سێیەم دەست نیشان کرا، کە لەڕۆژانی ١٠و ١١و ١٩٩٩/١/١٢ لەشاری هەولێر بەسترا، بەهاوکاری هەڤاڵانی دیکەی لیژنەی ئامادەکار توانی کۆنگرەکە بکات بەکۆنگرەیەکی نموونەییو، لەکۆنگرەکەدا

بەئــەندامی کۆمیتــەی ســەرکردایەتی ئینجــاش لەیەکــەمین کۆبوونــەوەی سەرکردایەتیدا بووەوە ئەندامی مەکتەبی سیاسیو بەرپرسی مەکتەبی ناوەندی ڕێکخستن.

* وەك مرۆڤی کارە گرنگ و گرانــەکانی YNDK لـەژمارە (٥٦)ەوە، ســەرەڕای ئەرکەکانی دیکەی، بووە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (میدیا)، وێڕای بینینی ڕۆڵی سەرەکی لەدەرکردنی گۆڤاری (سەرخۆبوون) کە خۆی خاوەنی ئیمتیازی بوو.

* شەهید سەربەست مەحموود بیرمەندێکی لێهاتووی نەتەوەییو، وڵاتپارێزو کورد پەروەرێکی دڵگەرم و، مرۆڤێکی ڕەوشت بەرزو بەوەفاو سەرنج ڕاکێش و بەبەزەییو بوێرو هەق پەرست بوو.

* شـەهید سەربەسـت مـەحموود لەڕێگـەی گوتـەو کـردارو نووسـینەکانییەوە بەبەرگریکارو پارێزڤانێکی بوێرو ئازاو ڕاستەقینەی ئاسایشی نەتەوەیی کوردو حکومـەتی باشـووری کوردسـتان هـاتبووە ناسین، بۆیـەش وڵاتپـارێزان و کـورد پـەروەران خۆشـیان دەویسـت و، دوژمنـان و ناحـەزانی کـوردو کوردسـتانیش هەمیشە ڕقیان لێ هەبوو.

* مخـابن دوژمنـان تیرۆریسـتان ڕێگـەیان نـەدا شـەهید سەربەسـت مـەحموود زیاتر تێبکۆشیو خزمەتی نەتەوەکەی بکات و، لەئێوارەی ڕۆژی ٢٠٠٠/٥/٣١دا زۆر بەنامـەردیو دڕندانـەو هۆڤییانـە شـەهیدیان کـردو جەسـتە پیرۆزەکـەیان لـەنێوان هـەردوو ئۆردووگـای بنەسـڵاوەو دارەتـوی سـەر بـەپارێزگای هـەولێر فڕیدا.

* جەستەی شەهید سەربەست ڕۆژی ٢٠٠٠/٦/١ لەهـەولێرەوە برایـەوە شـارە خۆشەویسـتەکەی خـۆیو لەمەراسـیمێکی تایبـەتیدا لەگۆڕسـتانی (گـردی سەیوان)ی شاری سلێمانی بەخاك سپێردرا.

هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی شەهید سەربەست مـەحموودو گشت شـەهیدانی ڕێگەی سەربەخۆییو ئازادیو یەکگرتنەوەی کوردستان.

# کوردستانێکی سەربەخۆ

پێویستە یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان زۆر بەچڕیو بە بایەخەوە، لەسەر زاراوەی (سەربەخۆیی یاخود سەرخۆبوون) رابوەستێت و ئامانجە نەتەوەییەکانمان لەو چوارچێوەیەدا شیبکاتەوەو هەوڵی پێشڤەچوونیشی بدات، چونکە (سەرخۆبوون) یەکێکە لەئامانجە ستراتیژیو نەگۆڕەکانی (YNDK)و بۆتە سیمایەکی چەسپاویش کە پێناسینی(YNDK) بێ باس کردنی (سەرخۆبوون) کارێکی نەشیاوو پڕ لەکەم و کوڕی دەبێت. هەر لەم روانگەیەوەش هەوڵمان داوە، خوێندنەوەی زیاترو جەختی زیاتر بخەینە سەر (سەرخۆبوونی کوردستان) ئاشکرایە کە لەساڵی (١٩٩٧)دا، نامیلکەیەکمان لەژێر ناونیشانی (سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە) بلاو کردەوەو تیایدا تیشکمان خستۆتە سەر گرنگیو پڕ بایەخی ئەم ئامانجە ستراتیژیەمان، هەر بۆیە لەم وتارەماندا هەوڵ دەدەین بە شێوازێکی تر جەخت لەسەر پرسی سەرخۆبوون بکەینەوە، یاخود دەتوانین بڵێین بەهێز کردنێکی زیاتری نامیلکەی (سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە) بەلام بەرەچاو کردنی ئەوەی کە خاڵەکان و سەرخەتە گشتییەکانی نامیلکەی پێشوومان دووبارە نەکەینەوە، لەراستیدا زاراوەی (سەرخۆبوونی کوردستان) زیاتر لەوە هەڵدەگرێت کە چەندین نامیلکەی تریشی لەبارەوە بنوسین، چونکە خەباتی لەمێژینەی نەتەوەییمان دوا ئامانج و ستراتیژی سەربەخۆیی کوردستان بووەو نەگەیشتنمان بەو ئامانجە لەرابردوو.. ئێستاماندا، چەندین پرسیار دەخوڵقێنێو هەر پرسیارەش پێویستی بە وەلامێکی واقیعیو زانستیانە هەیە.

سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە وەك نەتەوە لەرووی (زمان و سنوری جوگرافیو مێژوو، پێکهاتەی کۆمەلایەتیو ئابووریو بنەمای رۆحی نەتەوەییمان) هیچ کەمو کوڕییەکمان نییەو هەموو ئەو پێناسە زانستیانەی کەبۆ بوونی (نەتەوە) کراوە، لە ئێمەی کورددا خۆی دەبینێتەوە، سەرباری ئەوەی کە داگیرکەران چەندین ساڵە لەهەوڵی سڕینەوەی سیمای نەتەوایەتی ئێمەدا بوون، بەلام ئەو کارەی داگیرکەران وای کردووە کە مرۆڤی کورد زیاتر وابەستەی پاراستنی سیما کوردانەکەی خۆی

بێت و هەمیشە خەباتی کردووە تاوەکو خۆی لەترسی سڕینەوەو، لەناوچوون ڕزگار بکات و لەمڕۆشماندا بەڕونی بەرهەمی خەباتی ڕابردوومان بەدی دەکەین، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە چەندین پرسیار ئاراستەی خۆمان بکەین و بەدوای وەلاَمێکی گونجاویشدا بگەڕێین، بۆ ئەوەی بتوانین ڕێچکەی بەرەو سەرخۆبوون، درێژە پێ بدەین و لەهەوڵی ئەوەشدا بین ڕووناکی زیاتر بەو ڕێگایە ببەخشین پرسیارێکی مەعقول هەیەو لەدەروونی سەرجەم ولاَتپارێزانیشدایە، ئەویش ئەوەیە، ئایا بۆچی تائێستا کوردستان خاوەنی کیانێکی سەربەخۆ نییە؟ سەرەڕای ئەوەی کە تاکە نەتەوەی سەر زەمینە کە ژمارەی (٤٠) ملیۆن دەبێت و تائێستاش کۆلۆنیال کراوە بۆ وەلاَمی ئەم پرسیارەو چەندین پرسیاری تر کە مێژووی نەتەوەییمانی پڕ کردووە، تاکە وەلاَمێکی سادە، ئەوەبووە، کە هەوڵمان داوە پاکانە بۆ خۆمان بکەین و لەبەرانبەر مێژوودا خۆمان بەکەسێکی بێ دەسەلاَت نیشان بدەین و بڵێین، هۆکاری ئەم سەر تا ئەو سەری شکستی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانمان ئەوەیە کە هێزی تەکنەلۆژیو ئابوری دوژمن سەدان جار لەهێزو توانای شۆڕشەکانی ئێمە بەهێزتر بووە، ئەوە لایەنێکی تارادەیەك گونجاوەو دەبێت لەهەڵسەنگاندنەکانماندا حسابی بۆ بکەین، بەلاَم دەبێت باس لەکەمو کوڕیو ناتەباییەکان و کەمی ئەزموونی سیاسیو سەربازی خۆشمان بکەین کە هۆکاری سەرەکی بووە بۆ شکستەکانمان، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئێمە هەروا بەسادەیی خۆمان لەئەرکەکانی سەر شانمان لابدەین، ئەوا ناتوانین ببینە پاڵنەرێکی ئیجابی لەقۆناغی خەباتی ئێستاماندا، لێرەوە ئێمەش زیاتر خۆمان بەوە خەریك دەکەین کە دەبێت چۆن داهاتووی نەتەوەییمان بنیات بنێین، لەبەر ئەوەی باسەکەی ئێمە خوێندنەوەی مێژووی نەتەوەییمان نییەو ناکرێت ئەوەش لەبەرچاو نەگرین کە هەر سەردەمەو تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو کاریگەری ئاستی ڕۆشنبیریو سیاسیو هەستی نەتەوەیی دەوری خۆی هەیە، بۆ نموونە ناکرێت ئێمە بڵێین سەرهەڵدانی شێخ مەحمود لەباشووری کوردستاندا کارێکی نانەتەوەییو دەرەبەگی بووە؟! چونکە ئەو سەرهەڵدانە لەکاتی خۆیدا هەر هیچ نەبێت توانیویەتی ئەوە بسەلمێنێ کە کوردستان نەتەوەی کورد خاوەنیەتیو ئامادەشە پارێزگاری لێ بکات و خاڵێکی پرشنگداریشە لەمێژووی سەرهەڵدانەکانی کورداو، ناکرێت ئێمە بڵێین ئەگەر ئێمە لەسەردەمی شێخ مەحمود دا بووینایە وامان دەکردو وامان نەدەکردو شەڕی بەردەقارەمانمان نەدەکرد، لەبەر ئەوەی هەر سەردەمەو خاوەنی خەسڵەتی خۆیەتیو هەر مرۆڤێکی نەتەوەیش بگریت بەپێی تێڕوانین و بۆچوونی

خۆی بەرەنگاری هێزەکانی دژ بە بەرژەوەندی نەتەوەییمان دەبێتەوە، هەروەها دەبێت ڕەچاوی ئەوەش بکەین کە زەمەن و ئاستی بەرەو پێش چوونی کێشەی نەتەوەییشمان کاریگەری خۆی هەیە، بۆ نموونە خۆ لەکاتی کۆڕەوەکەی بەهاری (١٩٩١) نەك هەر لەبەردەقارەمان خۆمان ڕانەگرت بەڵکو تا سەر سنوورەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات و باکوریش خۆمان ڕانەگرت، بەلام سەیر دەکەین چونکە کۆڕەوەکە لەزەمەنێکی تردا بوو، بووە دەستکەوتێکی مەزن و هێڵی (٣٦) بۆ نەتەوەی کورد دانراو بایەخێکی نێودەوڵەتی زیاتریش بەکێشەکەمان درا، کەواتە دووچاری هەڵە دەبین ئەگەر بڵێین لەسەرجەم ڕاپەڕینەکاندا دووچاری یەك هەڵەی نەگۆڕ بووینەتەوەو هیچ سودیشمان لێ وەرنەگرتووە! لەبەر ئەوەی چۆن ئێمەی کورد هەوڵی ڕزگارکردنی خۆمان دەدەین لەدەستی دوژمنان، داگیرکەرانی کوردستانیش هەمیشە لەخەمی ئەوەدان کە بۆماوەیەکی زیاتر کوردستان بە داگیرکراوەیی بمێنێتەوە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین ئەوەی کە بەنەگۆڕی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە ئێمەی کورد بەشێوازی جیاواز لەهەوڵی خۆ ڕزگارکردنداین و داگیرکەرانیش بەهەمان شێوە لەهەوڵی زیاتردان بۆ هێشتنەوەی کوردستان بە کۆلۆنیال کراوی، ئەمەش لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر گۆڕانی بەرچاوی بەخۆوەبینیوە، کەواتە بائێمە بیرێك لەئێستامان بکەینەوە، نەوەك هەر خۆمان بەڕابردوو ببەستینەوە بەشێوەیەکی وەها کە تەنیا ڕەخنە لە ڕابردوومان بگرین، لەبەر ئەوەی واقیعی ئێستامان بەرهەمی خەباتی ڕابردوومانەو پێویستیشی بە پێشڤەچوونی زیاتر هەیە بۆ نموونە ڕەوتی خەباتمان لەشۆڕشی مەزنی ئەیلولەوە تائێستا قۆناغ بە قۆناغ بەرەو پێش چووە لە (ئۆتۆنۆمی بەرەو فیدراڵی) هەنگاوی هاویشتووەو ئێستاش پێویستە بەرەو (سەربەخۆیی) هەنگاو بنێین.

سەرەڕای ئەوەی ئێمە وەك نەتەوەیەك تائێستا نەمان توانیووە، یاخود بۆمان نەگونجاوە ببینە خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی فراوان و سەرتاپاگیر بۆ خوێندنەوەی لایەنە جیاجیاکانی خەباتی نەتەوەییمان و دانانی تیۆرێکی سیاسی- کۆمەڵایەتی- ئابووری- بۆ بەرەو پێش چوونی نەتەوەییمان و بەرەنگار بوونەوەو شیتەڵ کردنی ئەو بیرو ئایدۆلۆژیا نامۆیانەی کە لەماوەکانی ڕابردوو.. ئێستاشماندا توانیوویانە زیانێکی گەورە بەبیری نەتەوەییمان بگەیەنن، لەداهاتووشداو لەپاش پێکهاتنی دەوڵەتی سەربەخۆش، بەئاشکراو بەشێوازێکی ترسناکتر ئەو ئایدۆلۆژیا نامۆیانە، هەناوی کۆمەڵگای کوردەواری دووچاری سەرگەردانی فکریو سیاسی دەکەن،

باشترین شێوازیش بۆ ئەوەی بتوانین لەو ڕێگەیەوە بیری نەتەوەیی پەرەپێبدەین و بەرەو پێشی بەرین گرتنە بەری شێوازی گفتوگۆو کۆکردنەوەی جەماوەر لەدەوری بیری نەتەوەییمان و بۆ ئەم کارەش رابردووی خەباتی نەتەوەییمان توانیویەتی ئاسانکاری مەزن بۆ ئێمە بەرهەم بهێنێ‌و ئێمەش دەتوانین لەسەر بنەماکانی بوونی سۆزێکی نەتەوەیی بەهێز لای خەڵکی کوردستان بناغەیەکی پتەوو زانستیانە بۆ بیری نەتەوەییمان دابرێژین بەشێوەیەکی گشتی هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەر ئەو فکرە سلبیانەی کە توانیوویانە کاریگەرییەکی خراپ بکەنە سەر ڕەوشی خەباتی نەتەوەییمان و لێرەشدا ئێمە لەچوارچێوەی دوو فکرەدا چڕیان دەکەینەوە، تەیاراتی مارکسی‌و لەدوای ڕاپەڕینیشەوە بەئاشکرا دەوری تەیاراتی ئیسلامی سیاسی بەدیارکەوت و بیروڕای خۆمانیان بەشێوەیەکی کورت لەسەر دەردەبڕین، چونکە سەربەخۆ نەبوونی ئێمە وەك نەتەوەیەك پێشتر باسمان کرد، تەنها بەهۆی بەهێزی‌و فاشستی داگیرکەرانەوە نەبووە، بەڵکو ڕەوشی ناوخۆشمان کاریگەری لەسەر ئەوە هەبووە، کەتا ئێستا ئێمەی کورد بەبن دەستی ماوینەتەوە، شایەنی باسیشە هەر یەك لەو دووتەیارە فکرییە بەهۆی ڕەوشێکی تایبەتەوە گەشەیان سەندووەو توانیویانە پێگەی خۆیان لەباشووری کوردستاندا جێگیر بکەن.

١-**تەیاراتی مارکسی یاخود (کۆمۆنیستی)**: سەرەتای دەرکەوتنی تەیارو ڕەوتی کۆمۆنیستی لەکوردستاندا بۆ سەرەتای ساڵەکانی چلی ئەم سەدەیەمان دەگەڕێتەوە، کەهێشتا کوردستان بەدەستی سیستەمی دەرەبەگیەوە گیری خواردبوو، وە بیری نەتەوەییمان وەك بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێز بەرەو بەسیاسی بوون و بەرێکخراو بوونی سەرتاپاگیر هەنگاوی دەنا لەم کاتەدا کە باشووری کوردستان خۆی بەبەشێکی نامۆ دەزانی لەحکومەتی تازە دروست بووی عێراقدا، لەبەر ئەوەی هێشتا لەبیست ساڵ زیاتر نەدەبوو کە بەزۆر باشووری کوردستانیان بەعێراقەوە لکاندبوو، لەم کاتەدا کۆمۆنیستە کوردەکان، خۆیان خستە باوەشی نیزامی عێراق چێتی‌و ڕەسەنایەتی نەتەوەییان کردە شتێکی لاوەکی‌و لەناو لقی کوردستانی حیزبی شیوعی عێراقدا خۆیان ڕێك خست، لێرەدا هۆی گەشەکردنی حیزبی شیوعی لەکوردستاندا هۆکاری خۆی هەیە دەتوانین بڵێین بیری کۆمۆنیزم سوودێکی مەزنی لەڕەوشی خەباتی نەتەوەییمان بینیوە، هەروەك مامۆستا (جەمال نەبەز) لەکتێبی (یەکێتی تێکۆشین) هۆکاری گەشەسەندنی کۆمۆنیستەکان لەکوردستاندا دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە، لەساڵانی چل دا (ستالین) هاوکاری شۆڕشی کوردی لەڕۆژهەلات

دەکردو پشتیوانی کۆماری مەهابادی دەکرد، هەر بۆیەش ولأتپاریزانی باشوور، بەهۆی هاوکاری ستالین بۆ کۆماری کوردستان لەمەهاباد، سۆزیان بۆ حیزبی شیوعی لەعێراقدا جولأوە، لەبەر ئەوەی حیزبی شیوعی ئەوکات (ستالین)یان بەسمبۆلی شۆڕشگێڕیو جێی شانازی خۆیان دەزانی.

جگە لەو بیروڕایەی (مامۆستا جەمال نەبەز) دەربارەی گەشەی کۆمۆنیستەکان لەباشووری کوردستاندا، دەتوانین بلێین لەشەستەکانی ئەم سەدەیەشماندا، دوای نەمانی (سەلام عادل)ی سکرتێری حیزبی شیوعی عێراقیو بوونی (عەزیز محەممەد)ی کورد زمان بەسکرتێری حیزبی شیوعی بۆ نزیکەی (٣٠) ساڵ بەبەردەوامی، کاریگەری هەبووە لەسەر راکێشانی کورد بۆ ناو ریزەکانی حیزبی شیوعی، چونکە ئاشکرایە تائێستاش لەکوردستاندا سۆز (عطف) رابەرە لەبڕیاردانی خەڵکیدا دەربارەی هەر کارێك دەنا خۆ لەنیوەی زیاتری کەسانی ئەو کات و ئێستاش لەناو حیزبی شیوعی‌دا، شارەزاییان نییە لەبارەی (سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم) ئیتر حیزبی شیوعی عێراق پاش تەمەنێکی زۆری ئەوجا بڕیاریدا کە کورد وەکو نەتەوە حسابی بۆ بکرێت. دەنا لەسالأنی (چل)دا حیزبی شیوعی بەپێی پێوەرەکەی (ستالین) سەیری کوردیان دەکردو ئەم پێوەرەش کوردی وەك نەتەوە نەدەناساند. ئەگەر بەمێژووی حیزبی شیوعی‌دا رۆبچین نموونەی لەو بابەتانەی سەرەوەمان زۆر بەدەست دەکەوێت، سەرەڕای ئەوەی لەدوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان گۆڕەپانی رێکخراو بوون جۆرە سەربەستیەکی بەرچاوو بەبایەخی بەخۆوە بینیو لەپەنا ئەو ئازادیەش، رەوتی کۆمۆنیزمی کرێکاری سەرەڕای کەمی ژمارەیان هەوڵیان دا کە خەڵکی کوردستان بکەنە دژی ئامانجە نەتەوەییەکانمان بەبێ لەبەر چاوگرتنی مێژووی خەباتی نەتەوەییمان، جۆرەها قسەو قسەلۆکی ناواقیعیان دەدا بەگوێی جەماوەردا، وەك شیعاری (ناسیونالیزم شەرمەزارییە بەبەشەریەت)و چەندین شتی ناواقعی تر. ئەگەر سەیر بکەین بزووتنەوەی کۆمۆنیستی بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر لەئاستی جیهاندا ئایدۆلۆژیاکەیان دووچاری هەرەسی یەکجاریو قەیرانی فکری بەردەوام بۆوەو، لەئاست پێشڤەچوونەکانی رەوتی مرۆڤایەتیو پرسیارەکانی زەمەنی ئێستاشماندا، بێ وەلأم و دەستە وەستان مایەوە، ئیتر لەو کاتەوە پێش هەرەسی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیش لە جیهاندا، لەباشووری کوردستاندا بەهۆی ئەو هەلو مەرجانەی کە لەئەنجامی شۆڕشی نەتەوەییمان هاتۆتە ئاراوە، کۆمۆنیستەکان توانیویانە هەناسەیەك بدەن، دەنا خۆتا ئێستاش بزووتنەوەی

کۆمۆنیستی لەکوردستاندا بەگشتی نەیتوانیوە رابەرایەتی هیچ شۆڕشێك بکات لەکوردستاندا، کەواتە تەیاراتی کۆمۆنیستی سەرەڕای ئەوەی کەنەیان توانیوە رۆڵێکی ئیجابی ببینن لەشۆڕشی نەتەوەییمان دا هەمیشەش لەهەوڵی ئەوە دابوون کە هێزو توانای لاوانی کورد لەرووی (فکریو جەستەییەوە) بە ئایدۆلۆژیایەکی خەیاڵییەوە خەریك بکەن و لەبازنەیەکی بێ ئەنجامدا بیان سوڕێننەوە، هەر بۆیەش باسمان لەم بوارە فکرییە کرد، چونکە ئەم مەسەلەیە لە رابردوو ئێستاماندا قەیرانێکەو ئەگەر نەتوانین بەشێوازێکی زانستیانە رووبەڕووی ببینەوە، ئەوا لەداهاتووشدا ناتوانین بەئاسانی (بیری نەتەوەیی) بڵاو بکەینەوەو بیکەینە ئەلتەرناتیفێکی سەرتاپاگیر بۆ چارەسەر کردنی سەرجەم ئەو کێشانەی کە رووبەڕووی نەتەوەکەمان دەبێتەوە لەناو خۆو دەرەوەدا، بەتایبەتی کە ئێمەی کورد لەئێستادا زیاتر لەهەر کاتێکی تر پێویستیمان بەوە هەیە، کە سەرجەم بیرو ئایدۆلۆژیاکانی ناو گۆڕەپانی کوردستان بخەینە خزمەت ئەم قۆناغە گرنگەی ئێستامان، کە قۆناغی رزگاری نەتەوەییمانە لەژێر دەسەلاتی کۆلۆنیالیستەکانی سەر خاکی کوردستان، لە کاتێکیشدا کە سەردەمی ئێستامان، سەردەمێکە دەبێت بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەییمان هەڵسوکەوت لەگەڵ رووداوەکان بکەین، نەك بەپێی پێوەری ئایدۆلۆژیاو بیرێکی سنوورداری چەق بەستوو، هەر بۆیەش دەبینین بونیادو ستراتیژی چەسپاو لەکرۆکی بیری نەتەوەییدا بریتییە لە(دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی)و پارێزگاری کردنی بەردەوام لەگشت چین و توێژێکی خەڵکی کوردستان، بەڵام لای کەسانی وابەستە بەئایدولۆژیای کۆمۆنیستی خاڵی گرنگ و ستراتیژی بریتییە لەهێنانەدی کۆمەڵگایەکی ناواقیعی بێ چین و هێنانەدی سۆسیالیزم و پاشتر کۆمۆنیزم، کەواتە ستراتیژی ئەو ئایدۆلۆژیایە هەوڵ دەدات بەهەر چ شێوەیەك بووە هێزی نەتەوەییمان بخاتە خزمەت بیرێکی ناواقیعی کە تەنیا هەوڵی بەدیهێنانی ئامانجەکانی یەك چین دەدات و لەم حاڵەتەش یەك ریزی نەتەوەییمان دووچاری کەرت بوون و قەیران دەبێتەوە.

**٢-ئیسلامی سیاسی یاخود ئیسلامی توندڕەو (متطرف):**

مەسەلەی ئاینی ئیسلام، کە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی سەرهەڵدانی ئیسلامی سیاسییە لەگشت شوێن و رێگایەکی ئەم جیهانە، ئاشکراشە کە بیری ئیسلامی سیاسی لەکوردستانی باشووردا مێژوویەکی کۆنی نیەو بەڵکو دەتوانین بڵێین دەرکەوتنی ئەم هێزە بەشێوەیەکی بەرچاو، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٨٨) واتە کاتی

کیمیابارانی هەڵەبجە، بەڵام پێشتریش لەئاستی تاکدا ئەم بزووتنەوە سیاسیە بوونی هەبووەو بەپێی هەلومەرجی ساڵی ١٩٨٨ ئەم هێزەش توانی وەك هێزێکی سیاسی خۆی بە گۆڕەپانی کوردستان بناسێنیّو لەراپەڕینی بەهاری ١٩٩١وە تا ئێستاش ئەم هێزە سیاسییە ئیسلامییە، توانی زیاتر جێگەی خۆی لەگۆڕەپانی سیاسی باشووردا قایم بکات، ئەوەی لێرەدا جێی پرسیارە ئەوەیە، خۆ مرۆڤی کورد سەدان ساڵ پێشی ئێستا (بەهەر چ شێوەیەك بووبێت) کەوتە شوێن دینی ئیسلام و زیاتر لەعارەبەکان هەوڵی داوە خزمەت و پارێزگاری لەئاینی ئیسلام بکات، بەڵگەشمان ئەوەیە کە لەناو نەتەوەی کوردەوە چەندین زانای ئاینیو سەرکردەی وەك (صلاح الدین ایوبی) هەڵکەوتوون، بەڵام ئایا بۆچی لەدوای راپەڕینەوە هێزە ئیسلامییەکان بەزەقی دەرکەوتن؟! ئاشکرایە کە رەوشی ناوخۆی کوردستان، بەهۆی شەڕی ناوخۆوە داروخانی دەروونی خەڵکی کوردستان بەگشتیو لەرووی ئابورییەوە بەتایبەتی، کارێکی وای کرد کە خەڵکی بگەڕێنەوە جیهانی رۆحیو لەوێشدا کەمێك هەست بەئاسوودەیی بکەن، چونکە هەر کاتێك مرۆڤ لەدونیای واقیعی بیّ ئومێد بوو ئەوا ناچار دەبێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانە پەنا بباتە بەر دونیای غەیب و رۆحانی، هەر بۆیەش لەم ساڵانەی دواییدا سەرەڕای گەشەی ئیسلامی سیاسی، دونیای سیحرو پاراسایکۆلۆژیش گەشەی بەخۆوە بینیووە، کەواتە باهەوڵ بدەین قسە لەسەر واقیعی ئێستامان بکەین و بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەییمان شیبکەینەوە، بەپێی ئەو مێژووە درێژەی کە ئاینی ئیسلام لێرە هەیەتی، شتێکی سروشتیە کە زۆر لەیاساکانی ئیسلام بووبێتە واقیعێکی کۆمەڵایەتی قبوڵ کراوی لای خەڵکی کوردستان و کاری ئێمەش دژایەتی کردنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام نیەو دژایەتی سروشت و داب و نەریتی خەڵکی کوردستانیش ناکەین، بەڵکو هەوڵ دەدەین ژیانی سیاسی لە کوردستاندا بەشێوەیەك بێت، کە بتوانین لەسایەیدا هەست بە ئاسودەییو ئازادی بکەین، چونکە لەرابردووی خەباتی نەتەوەییماندا زۆربەی سەرکردەکانی شۆڕش و راپەڕینەکانی کوردستان، کەسانی شوێن کەوتووی ئیسلام بوون و بەهۆی ئەو پلەو پایە کۆمەڵایەتیەشیان توانیویانە جەماوەرێکی فراوان بەرەو شۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان رێك بخەن، کەواتە دەبێت ئێمەش بەپێی گۆڕانکاریەکانی سەردەم و پێشڤەچوونی کۆمەڵگای کوردیو واقیعی سیاسی نێو دەوڵەتی، هەوڵی خزمەت کردن و هێنانەدی ئامانجە نەتەوەییەکانمان بدەین، دەتوانین بڵێین کەهەموو ئایدۆلۆژیایەك هەوڵی دەست بەسەراگرتنی دەستەلات دەدات، بۆ پیادەکردنی

ئامانجەکانی خۆی، ئیسلامی سیاسیش لەهەوڵی گەیشتن بەدەسەڵات دایە، سەیر دەکەین کە کابینەی سێیەمی حکومەتی کوردستانیش لەکارە خزمەتگوزاریەکانیدا خزمەتکردنی ئاینی ئیسلامی پشت گوێ نەخستووەو بەپێی یاسا لەڕێگەی وەزارەتی ئەوقافەوە هەوڵی دروست کردن و نوێ کردنەوەی چەندین مزگەوت و تەکیەی داوە، سەرەڕای ئەوەی کە پەرلەمانی کوردستان ئاینی ئیسلامی بە ئاینی رەسمی دەوڵەت ناساندووە، واتە حکومەتی کوردستان کە حکومەتی شەرعی سەرجەم خەڵکییە، تائێستا بەتەواوی ئاینی لەدەوڵەت جیا نەکردۆتەوە، بەڵکو بە لەبەرچاو گرتنی واقیعی ئێستامان هەوڵی گونجاندنی داوە لەنێوان دین و سیاسەت دا. بەڵام دەبینین کە بڕیارە سیاسیەکانی تەیاراتی ئیسلامی وەك شێوازی دەسەڵاتێك لەناو دەسەڵاتێکی تردا دێتە پێش چاوو جیاوازییەك دەبینین لەنێوان موسڵمانێکی نەتەوەییو کەسێکی ئیسلامی، چونکە موسڵمانێکی ولاتپارێز ئاین بۆتە پاڵپشتێك بۆ هێمن کردنەوەو دان بەخۆ داگرتنی، کەچی ئیسلامێکی سیاسی هەمان ئایین هەستی گرژیو توند رەویەتی تیادا چاندووە. لێرەوە هەست دەکەین کە لەکوردستانی فیدراڵدا، کە هێشتا ئیسلامی سیاسی نەگەیشتۆتە دەسەڵات، جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی- سیاسی خەڵکی کوردستاندا. لەبەر ئەوە دەبێت کەسانی ولاتپارێز هەوڵی دۆزینەوەی رێگە چارەی گونجاو بدەن و ئەو راستیەش بسەلمێنن کە ئاینی ئیسلام و ئیسلامی سیاسی دووشتی لەیەك جوودان و کلیلی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت و خوا پەرستی لای مرۆڤی کورد زۆر لەمێژە دۆزراوەتەوەو ئێستاش لەقۆناغێکی گرنگتر دایە کە قۆناغی بنیات نانی قەوارەی سەربەخۆی نەتەوەییە، خاڵێکی تری گرنگ بۆ پاڵپشتی کردنی بیروڕاکانمان و بۆ ئەوەی بیسەلمێنین کە ئیسلامی سیاسی، هەڵوێستەکانیان لەگۆڕەپانی سیاسیەوە سەرچاوە دەگرێت، نەك لەبیرو باوەڕێکی ئاینیەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئیسلامی سیاسی بۆ هەر فکرو ئایدۆلۆژیایەك بەدیلێکی ئیسلامیانە دەدۆزنەوەو بەم کارەشیان لەقودسیەتی ئاینی ئیسلام کەم دەکەنەوە، چونکە ئاینی خوا دەخەنە ناو گۆڕەپانی ئەو ململانێیە فکرییانەی کە بەرهەمی فکری مرۆڤایەتییە، بۆ نموونە بەرانبەر بەبیری (سۆسیالیزم) دەڵێن ئیسلام (زەکات)ی داناوەو بەرانبەر بەشێوازی دیموکراتیو پەرلەمانی دەڵێن ئیسلام (شورا)ی هەیە، کەواتە ئیسلامی سیاسی تەنیا ئامانجی گرتنە دەستی دەسەڵاتە، لەرێگەی ئاینی ئیسلامەوە.

بەلاّم ئەگەر سەیر بکەین کەسانی ولاّتپاریزو نەتەوەیی لەریزەکانی (YNDK) دەتوانن وەلاّم و چارەسەری گونجاو بۆ سەرجەم پرسیارو گرفتیك بدۆزنەوەو پاراستنی قودسیەت و داب و نەریتی خەلّکی کوردستانیش بەئەرکێکی نەتەوەییانە دەزانین، هەر بۆیەش دەتوانین لەچوارچیوەی دەولّەتیکی نەتەوەیی- دیموکراتدا، خزمەت بەکیشەی رەوای نەتەوەییمان بکەین و خەلّکانی موسلّمانیش ریزو پایەی دیاریان هەبیت، لەچوارچیوەی ئەو سیستەمە دیموکراتیەشدا دەکریت ئیسلام ئاینی رەسمی بیت و ریزیش لەسەرجەم ئایین و ئاینزا (مذهب)ەکانی تریش بگیریت، چونکە لەسیتسەمی دیموکراتیدا هیچ کەسیك مافی ئەوەی نیە کە ئازادی کەسانی دەرووپشتی پیشیل بکات، کەواتە سیستەمی دیموکراتی دژی ئایین نیەو بەلّکو سەربەستی تەواویش دەداتە هەموو کەسیك کە مومارەسەی فکری یاخود ئاینی خۆی بکات، بەلاّم بەمەرجیك ئەو فکرو ئایینە سەروەری کەسانی تریش پیشیل نەکات، واتە نابیت لەناو دەسەلاّتی پەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا، کەسیکی تر لەمزگەوت یاخود کەنیسەوە بریاری (حەرام و حەلاّلْ و ژیان و مردنی) خەلّك دیاری بکات، دەبینین ئیسلامی سیاسی سەرەرای ئەوەی لەواری نیو دەولّەتیدا دووچاری قەیران بۆتەوە، لەهەمان کاتدا هەولّی کەرتکردن و لیك دابرانمان دەدات لەناوخۆی کوردستاندا، جا ئەم سیاسەتەش کە پەیرەوی دەکەن هەر لەشیوازی توونـد رەوی لەبریارەکانیان دا تا شیوازی ئیصلاحیو نەرمی نواندن لەکارەکانیان دەگریتە خۆی، واتە سیاسەتیکی سەرتاپاگیرییان هەیە بۆ ئەوەی کە بیری نەتەوەییو ژیانی هاوبەشی نیوان ئاینە جیاوازەکان لە کوردستان وا لیْ بکەن کە گرفتی دەولّەتی کوردیو رزگاری نیشتمانی بکاتە گرفتی پلە دوو، لەبەر ئەوە باکەسانی ولاّتپاریز خۆ بەهیچ بیرو ئایدۆلۆژیایەك نەبەستنەوە کە سەرەرای ئەوەی ناتوانیت گرفتەکانمان چارەسەر بکات، کەچی دیت رووبەرووی هەندیْ کیشەو گرفتمان دەکاتەوە (لەناوخۆو دەرەوە) کە لەمیژووی فەرهەنگی خەباتی نەتەوەییماندا هیچ کات بوونی نەبووە، کەواتە بائیمە هەولْ بدەین لەروانگەیەکی نەتەوەییانەوە، سەیری سەرجەم بیرو ئایدۆلۆژیا ئامادەکانی سەر گۆرەپانی سیاسی کوردستان بکەین، چونکە ئەگەر بەو شیوەیە نەبین ئەوا ئەستەمە بتوانین ببینە نوینەری جەماوەری ولاّتپاریزو سەربەخۆ خواز لەکوردستاندا. لەکۆتایشدا دەگەینە ئەو بروایەی کە ئاینی ئیسلام تیکەلّی کیشەو گرفتە سیاسیەکان نەکەین و ئاین جیاواز بکریتەوە لەململانییی دەسەلاّت و بریارە سیاسیو کۆمەلاّیەتیەکانی ناو گۆرەپانی کوردستان، بۆ ئەوەی ئاینی ئیسلام

قودسیەتی خۆی لەدەست نەداو ئێمەش بتوانین زیاتر لەخزمەت کێشەی ڕەوای نەتەوەییماندا بین.

لەپاش ئەوەی بە کورتی تێڕوانینی خۆمان دەربارەی ئەو دوو ڕەوتە فکریو سیاسییەی سەر گۆڕەپانی خەباتی کوردستان دەست نیشان کرد، هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەر چەند لایەنێکی تر کە کەسانی نەتەوەیی لێی بەرپرسیارن و دەکرێت ئێمەش وەك ڕێکخراوێکی نەتەوەیی لەچوارچێوەی (YNDK)دا هەوڵی خۆ ئامادەکردن بدەین بۆ ئەوەی لەئایندەدا بتوانین ئەو کێماسییانە پڕ بکەینەوە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئێمە لێرەدا داگیرکەرانی کوردستانمان لەیاد کردووەو زیاتر لەخەمی گرفتە ناوخۆییەکاندابن، چونکە بەڕاستی داگیرکەرانیش لەباشووری کوردستاندا توانیویانە لەڕێگای بزووتنەوەی غەیرە قەومیو وابەستە بە ئایدۆلۆژیای غەیرە نەتەوەیی هەوڵی جێبەجێ کردنی ئامانجەکانیان بدەن، هەر بۆیەش ئێمەی کورد تاوەکو خۆمان یەك ڕیز نەکەین، زەحمەتە بتوانین نەخشەو پیلانی داگیرکەران بسڕینەوە، کەواتە دەبێت نەتەوەییەکان لەهەوڵی بەدی هێنانی دەوڵەتی نەتەوەییدا بن، واتە شێوازی بەڕێوەبردنی ئەو دەوڵەتە (بەرانبەر ناوخۆو دەرەوە) بەبیرێکی نەتەوەییانە دەتوانێت ئاسودەیی بەخەڵکی کوردستان و ئاسایشی نەتەوەییمان ببەخشێت.

لێرەوە تیشك دەخەینە سەر هەندێك لایەنی تری تایبەت بەکەسانی نەتەوەییو وڵاتپارێز، چونکە تا ئەمڕۆش بیری نەتەوەیی نەیتوانیووە ببێتە خاوەن یەك ڕێکخراوی سەرتاسەری لەباشووری کوردستانداو هەروەها چەندین حیزب و گروپی نەتەوەیی دروست بوون و پاشتر دووچاری توانەوە هاتوون، بەهەر حاڵ (YNDK) دەبێت لەپێناو سەربەخۆیی کوردستان، نەك تەنیا سوود لەئەزموونی خۆی وەربگرێت، بەڵکو دەبێت سوودیش لەئەزموونی ڕێکخراوو حیزبە نەتەوەییەکانی پێشی خۆی وەربگرێت و هەوڵی ئەوە بدات کە ڕای گشتی بەرەو بنیات نانی سەربەخۆیی بۆ کوردستان ئامادە بکات، لە حاڵەتێکدا ئەگەر لەتوانادا نەبوو ڕاستەوخۆ کەسانی وڵاتپارێز لەناو (YNDK) ڕێك بخات، هەروەها بوونی چەندین گروپ و ڕێکخراو لەئێستاماندا کە سەرجەمیان خۆیان بەخاوەن گوتارو بیری نەتەوەیی دەزانن، کارێکی وا سلبی کردووە کە نەتوانرێت بە ئاسانی سەربەخۆ خوازان لەدەوری یەکدا کۆبکرێنەوە، کەواتە دەبێت لەناوخۆدا لەهەوڵی ئەوەدا بین کە (YNDK) خۆی بکاتە خاوەنی ڕاستەقینەی هەڵگری بیری نەتەوەییو سەربەخۆبوونی

کوردستان، لەبەر ئەوەی خەڵکی کوردستان بەگشتی لەوە دڵنیایە کە ئەگەر حکومەتی هەرێمی کوردستان توانیبێتی رەوشێکی پڕ ئاسوودەو ئازاد بێنێتە ئاراوە، ئەوا دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەییمان لەتوانایدا دەبێت زۆر زیاتر لەخزمەتی دابین کردنی پێداویستیەکانی خەڵك دا بێت، ئاشکراشە کە هەموو ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی داگیرکەران سەرەڕای قوربانی دان، بەرنامەو نەخشەی کاریگەری پێویستە، بۆ نموونە سیستەمی ئازادیو دیموکراتی لە ئەوروپا خوێن و خەباتێکی زۆری بۆ رژاوە، تاوەکو بۆتە سیستمێك بۆ دارشتنی یاسا کۆمەلایەتیو سیاسییەکانی خەڵکی ئەوروپا، دیارە کە سەرخۆبوونی کوردستانیش ماندووبوونێکی زیاتری لەولاتپارێزان دەوێت، واتە شۆڕشی رزگاری کوردستان پرۆسەیەکە هەڵگری بنەماو سیستەمێکی مرۆڤانەیە، هەر بۆیەش بەپێی رەوشی کوردستان شێوازی رووبەڕوو بوونەوەی داگیرکەران گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بۆ نموونە لەباشووری کوردستاندا لە قۆناغی چەکدارییەوە ئێستا رووەو قۆناغی دبلۆماسیو کاری سیاسییانە هەنگاو دەنێت، ئاشکراشە کە سەرجەم قۆناغەکانی رزگاری نەتەوەییمان، بە هەرچ شێوازێك درێژەی پێ درابێت و لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە پشتیوانی لێ کرابێت، هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بووە کە ژیانی خەڵکی کوردستان لەچەوسانەوەی نەتەوەییو کلتووریو ئابووری رزگار بکات، واتە بەپێی پێویستی قۆناغی رزگاری نەتەوەییمان دەبێت لەهەوڵی سەرلەنوێ دارشتنەوەی شێوازی کارکردندا بین، بۆ ئەوەی نەبینە هێزێکی نامۆو نا واقیعی لەبەرانبەر رەوشی سیاسیو دبلۆماسی لەواری نێو دەوڵەتیدا.

لێرەشدا پرسیارێك دێتە پێشەوەو پێویستی بە وەلامێکی دروست هەیە، کە ئایا چۆن (YNDK)ی سەربەخۆ خواز پشتگیریو پشتەوانی لەسیستەمی فیدرالیزم دەکات لەباشووری کوردستاندا؟ لەوانەیە پرۆسەیەکی لەم جۆرە پێویستی بە وەلامێکی چڕو پڕ هەبێت و جگە لەوەی کە هەمیشە وتوومانە، ئێمە لە (YNDK) فیدرالیزم بەقۆناغێکی گرنگ دەزانین بۆ سەربەخۆیی کوردستان، باشترە لەم چوارچێوەیە دەرچین و هەوڵ بدەین وەلامێکی فیکریو پڕماناتر بەو پرۆسەیە ببەخشین، ئاشکرایە کە دەسەلاتی دەوڵەتی پێویستیەکی گرنگی بەئیدارە کردن هەیەو دەبێت نەخشەی کورت و درێژخایەن دابرێژێت بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان و بەرەو پێش بردنی رەوشی کوردستان بەگشتی، بۆ ئەوەی لەم بوارەشدا سەرکەوتوو بین پێویستمان بەوە هەیە کە قۆناغ بەقۆناغ ئەزموونی بەرێوەبردن و پێشڤەچوونمان پێش بخەین، لەبەر ئەوەی داگیرکەرانی کوردستان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بوون

کوردستان لەهەموو روویەکەوە بەدوا کەوتوویی بمێنێتەوە، هەر بۆیەش ئێمە لە (YNDK) سیستەمی فیدراڵی بەتاکە رێگایەکی شارستانیانە دەزانین بۆ ئەوەی بتوانین کەسانی شیاوو بە ئەزموون بهێنینە مەیدانی کارکردنەوە، چونکە سەربەخۆیی کوردستان چەند قۆناغێکی گرنگ و چارەنووسسازە، زیاتر لەوەش بەرێوەبردن و پاراستنی ئەو کیانە سەربەخۆیە گرنگ ترە، سەرەڕای ئەوەی لەواری نێو دەوڵەتیشەوە سیستەمی فیدراڵی پشتگیرییەکی فراوانی بەدەست هێناوە، کەواتە سەربەخۆبوونی کوردستان حەقیقەتێکی حەتمییەو تاوەکو کوردستان سەربەخۆ نەبێت ناتوانین لەوە دڵنیابین کە کارەساتێکی تری وەك هەڵەبجەی کیمیاباران کراوو ئەنفال بەسەر خەڵکی کوردستاندا دووبارە نابێتەوە، بێگومانین لەوەی کە هەموو کارێك ئەگەر بیری نەتەوەیی دارێژەری بنەماو ئامانجەکانی بێت، ئەوا لەخزمەت ئاسوودەیی خەڵکی کوردستاندا دەبێت و ئاسوودەیی‌و ئاشتی سەرتاپاگیریش لەناوچەکەدا لەکاتێکدا دەبێت کە نەتەوەی کورد بەمافەکانی خۆی بگات کە خۆی لەچوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەییدا دەبینێتەوە، چونکە ئەگەر کێشەی کورد بەگەرمترین و سەرەکی ترین گرفتی نەتەوەیی دابنرێت لەسەدەی بیستەمدا، ئەوا دەبێت سەدەی بیست و یەك سەدەی چارەسەری بنەڕەتی گرفتەکان بێت و کوردیش وەك زۆرترین نەتەوەی بێ ماف و بێ دەوڵەت لەجیهاندا بگاتە دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ.

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە:

١-معادلة في علم الثورة، د.رجب بودبس، المركز العالمي للدراسات والبحوث كتاب الاخضر، ١٩٩١.
٢-حوار حول العلمانية، د.فرج فودة، ١٩٩٢، مطابع الهيئة المصرية العامة للكتاب.
٣-نامیلکەی "سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە" سەربەست مەحموود، لەبڵاوکراوەکانی مەکتەبی ناوەندی رێکخستنی (YNDK)، ١٩٩٧.
٤-بەرەو رێکخستنێکی پتەو لەریزەکانی (YNDK)دا، سەربەست مەحموود، لەبڵاوکراوەکانی م.ن رێکخستن-ی (YNDK)، ١٩٩٨.
٥-گۆڤاری رەهەند، ژ٥/ ١٩٩٨، وتاری دەسەڵات و بەرگری، فاروق رەفیق.
٦-گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتی تێکۆشین (١٩٤٤-١٩٤٥)، بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر، ستۆکهۆڵم، ١٩٩٨، جەمال نەبەز.

تێبینی:
* ئەم بابەتە لەلایەن نووسەرەوە، پێشکەش بەکۆنگرەی سێیەمی YNDK کراوە، دوای خوێندنەوەی گفتوگۆیەکی تێرو تەسەلی لەسەر کراوەو پەسەند کراوە.
* ئەم بابەتە لەژمارە (١)ی گۆڤاری سەرخۆبوون- لەهاوینی ساڵی ١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.

# لەهەزارەی سێیەمدا لەخەباتی رۆشنبیرییەوە.. بەرەو ستراتیژی سیاسیمان

لەکاروباری سیاسیدا ئەگەر بنەمای (گۆڕاوو نەگۆڕ- الثوابت و التغير) بنەمای لێکدانەوە سیاسییەکان بێت، ئەوا کورد لەهەزارەی رابردوودا مانەوەی لەڕەوشێکی کۆلۆنیالدا بەنەگۆڕی ماوەتەوە، ئەوەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە تەنیا تاکتیکی داگیرکاران بووە، بۆ پاراستنی سیاسەتی نەگۆڕی شۆڤێنییان، کەچی کوردیش لەبەرانبەر ئەم سیاسەتەدا نەیتوانی بەیەکگرتووی بنەما (گۆڕاوو نەگۆڕ)ەکانی سیاسەتی کوردی دابڕێژێت. هەر بۆیەش بەبندەستی پێی نایە ناو هەزارەی سێیەمەوە، کەواتە دەبێت سیاسەتی کوردی چی بێت بۆ ئەوەی هەزارەی سێیەم هەزارەی رزگاری ولاتی کوردان بێت، دەتوانین بلێین کورد بەگشتیو پارتە سیاسییەکان بەتایبەتی دەبێ تاکتیك و ستراتیژ یاخود بنەما (گۆڕاوو نەگۆڕ)ەکانی سیاسەتی کورد لەناوخۆدا یەکبخات ئەوجا دەتوانی هەڵسووکەوتێکی کوردانە لەگەڵ ئەم هەزارەیەدا بکات.

با ئەوەشمان لەیاد نەچێت هەزارەی سێیەم هەزارەی گۆڕانی رەوشی مرۆڤایەتی نییە لەشەوو رۆژێکدا، بەڵکو چۆن مانای بەردەوامی ژیانی مرۆڤایەتییە، ئاواش رەوشی سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتیو فەرهەنگی.. هەزارەی سێیەم، تەواوکەری رەوش و ژیانی هەزارەی رابردووە بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر، واتە سەدەی بیست و سەدەی بیست و یەك لێکدابڕاو نین، بەڵکو دە توانین بلێین لەوەدا جیاوازن کە هەزارەی سێیەم هەزارەی بچوکتر کردنەوەی جیهان و ئەنجامدانی پێوەندی خێرانییە لەنێوان سەرجەم مرۆڤایەتیدا.

دەبێ بۆ ئێمەی کوردیش هەزارەی سێیەم ماناو دەلالەتی خۆی هەبێت لەبەر ئەوەی بەبێ بۆنیاتنانی دەوڵەتی کوردی هاتینە ناو ئەم هەزارە پڕ لەگۆڕان و پێشکەوتنە خێرایانە، کەواتە دەبێت واقیعیانە هەڵسوکەوت بکەین و بزوتنەوەی کوردایەتیش بەگشتی ناتوانێت ئاسۆی روونی رزگاری نیشتمانی بدۆزێتەوە، ئەگەر بەچاوێکی واقیعیانەوە سەیری ئەزموونی دیموکراتیو حکومەتی باشووری کوردستان نەکات، لەبەر ئەوەی سەرەڕای ئەوەی کە درێژترین حکومەتی ماوە درێژی

کوردییە، لەهەمانکاتدا بەهەوڵی دبلۆماسیەتی کوردی توانراوە بەخۆڕاگرییەوە حکومەتی باشووری کوردستان لەهەزارەی دووەمەوە، بەرەو هەزارەی سێیەم هەنگاو بنێت، بەڵام لەهەمان کاتدا دەبێ هەوڵی جدی بدرێت بۆ نەهێشتنی ئەو دیاردە سلبیانە کە لەهەزارەی دووەمدا ریزی بزوتنەوەی کوردایەتی دووچاری هاتبوو، وەك دیاردەی شەڕی یەکتر کردن، کە هەر نەبێت ئەگەر رەوشی ئێستامان بۆ هاوکاریکردنی راستەوخۆی یەکتر گونجاو نەبێت، ئەوا دەبێت ستراتیژی بزوتنەوەی کوردایەتی لەناو خۆماندا لەهەزارەی سێیەمدا بریتی بێت لەوەی کە دژایەتی یەکتر نەکەین و، ئەمەش بۆ داگیرکاران بسەلمێنرێ کە بوون و بەردەوامی حکومەتی باشووری کوردستان واتە سەقامگیر بوونی ئارامی لەناوچەکەدا هەروەها لەهەزارەی سێیەمدا کارێکی گرنگ و بایەخدار چاوەڕێی وڵاتپارێزانی کوردستان دەکات، کە ئەو کارو بەردەوامییەی رابردووی بزوتنەوەی کوردایەتی بۆتە رێخۆشکەرێکی مەزن بۆ ئەنجامدانی کاری سەردەمانەو نەتەوەییانە لەئایندەدا، ئەوەش لەو کاتەوە بەتەواوی هاتە واری کرداریيەوە، کە حیواری (کوردی- عەرەبی) لەقاهیرە ئەنجامدراو پاشان بەشێوەیەکی گەرموگووڕ هاتوو چۆو بیرورا گۆڕینەوە لەنێوان رۆشنبیرانی (باشوور و رۆژهەڵاتی) کوردستان لەئارادایەو، هەر بەهۆی ئەو پردە رۆشنبیرییەوە بوو کە کۆماری ئیسلامی ئێران (ئەگەر مەبەستی سیاسیو فکری خۆشی لەپشتەوە بووبێت).

پێشنگای کتێبی لە (هەولێرو سلێمانی) کردەوە، ئاشکراشە کە کردنەوەی بەشی رۆژهەڵات بایەخی سیاسیو فەرهەنگی خۆی هەیە..

دیارە لەباکووری کوردستانیش دا ئێستا لەهەموو کات زیاتر لەسەر دەستی سیاسەتمەدارانی تورکدا باس لەچاککردنی رەوشی کورد دەکرێت.. لەئاستی نێودەوڵەتیشدا پشتگیرییەکی بەرفراوان لەکێشەی کورد دەکرێت و هەوڵی زیاتر ناساندنی دەدرێت هەر لە (کردنەوەی مەڵبەندی مستەفا بارزانی نەمر لەئەمریکاو بوونی کورد بەوانەیەکی خوێندن لەزانکۆی ئەمریکاداو..)، کەواتە کێشەی نەتەوەییمان لەو قەوارەیە دەرچووە کە داگیرکارانی کوردستان بتوانن بەرێککەوتنێکی ئیقلیمی چارەنووسی نەتەوەییمان دیاری بکەن و سەرکوتی بکەن، بەڵام تائێستاش داگیرکارانی کوردستان کە دێنە سەر باسی کورد ئەوا بەچاوێکی ترسەوە لەئەزموونی باشووری کوردستان دەڕوانن و بەوردیش چاودێری پێشڤەچوونەکانی دەکەن، کەواتە لەهەزارەی تازەدا پێویستە حکومەتی کوردستان بەپێی رەوشی سیاسی ناوچەکە هەوڵی لێك نزیککردنەوەی سەرجەم باڵە سیاسیو

رۆشـــنبیرییەکانی پارچـــەکانی کوردســـتان بـــدات، ئەمـــەش دەکرێـــت لەســـەرەتادا بەپێکهێنانی گروپی (رۆشنبیری‌و کلتووری‌و هونەری..) هاوبەش دەستی پێبکرێت، تاوەکو بتوانین لەم رێگەیەوە وشیارییەکی (رۆشنبیری- نەتەوەیی) سەرتاپاگیر دروست بکەین، بۆبارودۆخی ئێستاشمان ئەم کارە زۆر ئەستەم نییە، چونکە ئێستا سەرەڕای ئەوەی لەسنووری حکومەتی باشووری کوردستاندا چەندین گۆڤارو رۆژنامەو کتێب.. چاپ و بڵاو دەکرێتەوە، لەوانەش گرنگتر ئەوەیە کە خاوەنی تەلەفزیۆنی ئاسمانین (سەتەلایتی کوردستان)و دەتوانین ئاسانتر لەدەرگای هەموو ماڵە کوردێك بدەین، هەر بۆیەشە یەکخستنی رۆشنبیری نەتەوەیی دەخەینە پێش (ستراتیژی سیاسیمان) لەم قۆناغەدا، چونکە ئەمڕۆ زیاتر دەرگاکان لەڕووی خەباتی رۆشنبیری ئاوەڵایەو بۆ ئێمەی کوردیش ئاسانترە لەم دەرگایەوە بچینەوە سەر رێچکەکانی ستراتیژی نەتەوەییمان و، لەهەمان کاتدا دەبێت هەوڵی زەمینەسازی بدەین بۆ خۆنزیککردنەوە لەسەرجەم پارت و باڵە سیاسییە کوردییەکان و سازدانی کۆڕو سیمناری هاوبەش بۆ پارتە جیاجیاکانی بەشەکانی تری کوردستان، تاوەکو شەپۆلێکی جەماوەری وشیار دروست ببێت کە لەسەرجەم بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردی تێبگات، هەروەها پێویستە پارتە سیاسییەکان لەهەزارەی سێیەمدا بەجدی گفتوگۆ لەسەر لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەکانی بیرمەندان و کەسانی ئەکادیمی کوردی بکەن و چیتر لەدیدگایەکی تەسکی حزبییەوە بڕیارەکانی خۆیان رانەگەیەنن، چونکە دوور نییە بڕیارێکی هەڵەی پارتێکی سیاسی لەهەزارەی سێیەمدا باجەکەی بەسەر لەنوێ دروست بوونەوەی ئاژاوەی ناوخۆیی تەواو ببێت لەڕیزی بزاڤی رزگاریخوازییماندا.

هەروەها لەهەزارەی رابردوودا خەباتی چەکداری‌و شەڕی پارتیزانی بۆ کورد بنچینەی پتەوی خەباتی رزگاریخوازی بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی داگیرکارانی کوردستان دەوڵەتەکانیان پێکهاتەیەکی عەسکەرتاری‌و شۆڤێنیان هەبووەو هەموو گۆڕانکارییەکی سیاسیش لەدەستی هێزەکانی سوپادا بوو، هەر بۆیەش شۆڕشی چەکداری نەیتوانی ئامانجە نەتەوەییەکانمان بهێنێتەدی (هەرچەندە هۆیەکانی مانەوەی کورد بەداگیرکراوەیی زۆر فراوانترە، بەڵام لێرەدا مەبەستمان تیشك خستنە سەر نەخشەو پیلانی خەباتی کوردایەتی‌یە لەهەزارەی سێیەمدا)، کەواتە گونجاوترین شێوازی خەبات لەهەزارەی سێیەمدا خەباتی سیاسی‌و دبلۆماسییە لەدەرەوەی کوردستان و یەکڕیزی‌و خەباتی کلتووری‌و رۆشنبیری هاوبەش لەناوخۆداو زەمینە ساز کردن بۆ خەباتێکی سیاسی- سەربەخۆ خوازی لەسەرتاسەری کوردستاندا.

* ئەم وتارە لەژمارە (٦٠)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم رۆژی ٢٠٠٠/٢/١ بڵاو کراوەتەوە.

# YNDK و دیموکراتیەت

تێگەیشتن لەدیموکراسیەت و پیادە کردنی لەکۆمەڵگادا کارێك نیـیە بەئاسانی بێتە بەرهەم، بێ گیرو گرفت و خەبات و قوربانی دان نایەتەدی. بەڵام ئەوەی جێی رامانە بەدرێژایی مێژووی خەباتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد دیموکراسیو پیادەکردنی دیموکراسی لەناو ریزەکانی حیزبداو بەرابنەر بەجەماوەریش قسەو باسی زۆری لەسەر کراوە، (بەڵام سەردەمی خەباتی شاخ و شۆڕشی چەکداری چیاکان و بڕیارە شۆڕشگێرییەکان زەروورەت هێنابوونیە ئاراوەو جێگای شانازی بزوتنەوەی رزگاری خوازی نەتەوەییە).

دیارە راپەڕینە جەماوەرییەکەی نەتەوەی کورد لەساڵی (١٩٩١)، تەنها راپەڕینێ نەبوو لەدژی زوڵم و ستەمی رژێمی کۆلۆنیالیست و کۆنە پەرستی عێراقی، بەڵکو راپەرینێکی فکریو ئازادیخوازو تەقینەوەیەکی دیموکراتیانەشی هێنایە نێو ژیانی خەڵك، پێویستیش بوو کۆمەڵگایەکی تینووی ئازادیو دیموکراسی ممارەسەی ئەو دیموکراسیەتە بکات و راشکاوانە بڕیارو پەیوەندی حیزبیو سیاسیو فیکری خۆی رابگەیەنێت و خەباتی لەپێناودا بکات، ئەمەش بووە هۆی دروست بوون و هاتنە ئارای جۆرەها تێڕوانینی جیاوازو فکری جیاواز بۆ کێشە نەتەوەییو چینایەتیو گرفتە کۆمەڵایەتیەکان..و چەندین رێکخراوی سیاسیو جەماوەری بۆ دەربڕینی بیروڕاو بۆچوونی جیاوازو پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنە فکریو سیاسیو کۆمەڵایەتیانە هاتنە مەیدان کە پێشان لەلایەن رژێمی بەعسی عێراقیەوە سەرکوت کرابوون، ئاشکراشە لەئەنجامی ئەم ئازادییە بیری رەخنە گرانەو پێشکەوتنخوازانە زیاتر گەشەی سەندوو بووە هۆی هەنگاونان بەرەو کۆمەڵگایەکی دیموکراتیخوازو لەئەنجامدا ململانێی فکریو دیموکراتیانە گەشەی سەندوو بایەخی پێ دراو چەندین رێکخراوی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو فکریو سیاسیو.. لەئامێز گرت.

جا ئەگەر رێکخراوێك هەوڵی دابێت گەشەی زیاتر بەکۆمەڵگای کوردستان بدات و لەهەوڵی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگادا بێت، ئەوا لەلایەن هێزە کۆنە پەرستانەکانەوە بەر بەرەکانیەکی ناشارستانیانەو نامرۆڤانە بەرانبەر بەهەوڵ و تێکۆشانی ئەو رێکخراوە پێشکەوتنخوازە کراوەو ئەوپەڕی توندو تیژی رووبەڕوو بۆتەوە.

ئاشکراشه که هاتنه‌مه‌یدانی YNDK له‌ئه‌نجامی په‌ره‌سه‌ندنی شه‌ڕی ناوخۆو دروست بوونی که‌لێنێکی فکری‌و سیاسی له‌کۆمه‌ڵگای کوردستاندا هاته‌مه‌یدانی خه‌باتکردن بۆ پڕ کردنه‌وه‌ی ئه‌و که‌لێنه فکری‌یه‌ی که له‌ئارادابوو، به‌ڵام YNDK وه‌ك هێزێکی شۆڕشگێری دیموکراتخواز له‌ئه‌نجامی بڕوای پته‌وی به‌کێشه‌ی نه‌ته‌وه‌ی کورد زۆر چاو نه‌ترسانه به‌ره‌و ڕووی خیانه‌تکاران و دوژمنانی نه‌ته‌وه‌و نیشتمان ده‌بێته‌وه، YNDK له‌ئه‌نجامی چه‌ندین هه‌وڵ و تێکۆشان ویستی خیانه‌تکاران و هه‌ڵپه‌رستان بێنه‌وه ریزی ولاتپاریزی‌و له‌پێناو ئه‌وه‌ی که YNDK بتوانێت سیاسه‌تێکی راست و سه‌ربه‌خۆ په‌یره‌و بکات له‌پێناو به‌رژه‌وه‌ندی بالای نه‌ته‌وه‌که‌مان، به‌ڵام به‌داخه‌وه چه‌ند که‌سێك هه‌ر له‌هه‌وڵی تێکدانی ریزه‌کانمان دا بوون، ناچار سه‌رجه‌م رێکخستنه واقیعیه‌کانی YNDK له‌رۆژی ١/١٠/١٩٩٥ بڕیاری ده‌رکردن و پاککردنه‌وه‌ی ریزه‌کانی خۆی‌دا له‌خیانه‌تکاران و ئه‌وانه‌ی وابه‌سته‌ن به‌جێگه‌ی ترو خاوه‌نی بڕیاری سیاسی سه‌ربه‌خۆی خۆیان نین.

به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و چه‌ند که‌سه به‌جێماوه‌ی دووره په‌رێز له‌و شه‌پۆله فکری‌و سیاسی‌و دیموکراتیه‌ی که راپه‌ڕینه جه‌ماوه‌رییه‌که‌ی گه‌لی کوردستان هێنابوویه به‌رهه‌م و دووربوون له‌گیانی هاوکاری‌و دیموکراتیانه‌و گۆش کرابوون به‌بیرێکی شاخاوی دیکتاتۆریانه‌ی دوور له‌بیرو بۆچوونی کۆمه‌لایه‌تی نه‌ته‌وه‌ی کورد. ئه‌وه‌بوو له‌هه‌وڵێکی دژ به‌مرۆڤایه‌تیدا سه‌ر له‌ئێواره‌ی (٢٠\٢١/١٠/١٩٩٥) ویستیان هه‌ڤاڵ (غه‌فوور مه‌خمووری) سکرتێری گشتی YNDK تیرۆر بکه‌ن، ئه‌م هه‌وڵه نه‌زۆکه‌شیان به به‌رچاوی حاکمانی ئه‌و کاته‌ی شاری هه‌ولێری پایته‌ختی حکومه‌تی هه‌رێم ئه‌نجامدا، چونکه وایان ده‌زانی که هه‌ڤاڵ (غفوور مه‌خمووری)و سه‌رجه‌م ئه‌ندامانی YNDKیش وه‌ك ئه‌وان به‌بیرێکی تیرۆریستانه‌ی هه‌ڵپه‌رستانه‌ی ناشارستانیانه په‌روه‌رده کراون و دوای ئه‌و هه‌وڵه‌یان چرای پێشکه‌وتنخوازی ده‌کوژێته‌وه، یاخود YNDK وه‌ك ئه‌وان خۆی رسواده‌کات و ده‌ست به‌کاری تیرۆریستانه ده‌کات، به‌ڵام نه‌یانزانی که رێکخستنه‌کانی YNDK به‌گیانێکی وا په‌روه‌رده کراون که زۆر له‌وه گه‌وره‌ترن بکه‌ونه داوی تیرۆریستان و هاوپه‌یمانانیان.

ئاشکراشه ته‌نها په‌یامی سکرتێری گشتی هه‌ڤاڵ (غفوور مه‌خمووری) دوای ئه‌و کاره‌ساته‌ش وه‌ك هه‌ڵوێستێکی دیموکراتیانه ئه‌وه‌بوو که به‌شێوازێکی فکریانه‌و شارستانیانه وه‌ڵامی کاری تیرۆریستان بدرێته‌وه‌و به‌شێوازێکی دیموکراتیانه هه‌وڵ بدرێت کێشه‌که روون بکرێته‌وه‌و هه‌ر له‌و رێگه مرۆڤانه‌یه‌وه هه‌ره‌سی به‌بیری

کۆنەپەرستانەی تیرۆریستان بهێنرێت و وایان لێ بکرێت لە گۆڕەپانی سیاسیدا جێگایان نەبێتەوە، هەر ئەو بیرو فکرە هاوچەرخە وای کرد کە هەڤاڵانی YNDK نە کەونە ناو هەڵەی تیرۆریستان و کاری نامرۆڤانە ئەنجام نەدەن، ئەم جۆرە هەڵوێست و شێوازی کارەی هەڤاڵان سەلماندی کە YNDK ڕێکخراوێکی دیموکراتی پێشکەوتنخوازە، بۆ راستی ئەو مەسەلەیەش سەرجەم هەڤاڵان لەوپەڕی حالەتی هەڵچووونداو لەکاتی ئەنجام دانی کارە تیرۆرستانەکەش بەرانبەر هەڤاڵ (غفوور مەخمووری)و دواتریش بەگیانێکی دیموکراتیانەو مرۆڤانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ڕووداوەکان کردو هەوڵیان دا بەعەمەلی بۆ جەماوەری کوردستان و حیزبە سیاسییەکانی بسەلمێنن کە سەرکەوتن و بەردەوامی تەنها بۆ ئازادیخوازان و پێشکەوتنخوازانەو هەرەس و نەمان و رسوابوون بۆ گشت تیرۆریستان و هاوپەیمانەکانیانە.

لێرەشدا تێروانینێك لەسەر چەمکی دیموکراتیەت و زەروورەتی دیموکراتیەت دەخەینەڕوو وە جێگەو شوێن و زەمەنی دیموکراتیەت دیاری دەکەین:

دیموکراسیەت دەبێت لەدەوڵەتدا پیادە بکرێت و بکرێتە بالاترین جێگا لەکۆمەڵداو بەپێی بڕیارە دیموکراتیەکان دەسەلات دابڕێژرێت و پەیڕەو بکرێت، کاتێك مرۆڤ و کۆمەڵگا هەست بەزەروورەتی دیموکراتیانە دەکەن کە ناکۆکیو ململانێیەکی دیکتاتۆریانەو چەوسانەوەیەکی سەرتاپاگیر ڕووبەڕوویان بۆتەوەو بەرەو خاڵی (کۆتایی بوون- مردن) کێشیان دەکات و دەیان کاتە کۆیلەی دەسەلاتی بالاو حوکمەکەی، واتە دیموکراتیەت پاراستنی بەرژەوەندی گشتییەو لەئەنجامی عەقڵی مرۆڤ لەگەڵ نیزامە سەرکوت کەرەکان هاتۆتە مەیدان و بۆتە شێوازێکی خەباتکارانە بەمەبەستی کەم کردنەوەی گرفتە کۆمەڵایەتیو ئابووریو رۆشنبیرییەکان..

دیارە مەسەلەی دیموکراتیش لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی ساردی نێوان وڵاتانی سەرمایەدارىو یەکێتی سۆڤیەت، بەفراوانی جیهانی گرتەوە لەژێر ناونیشانی (نەزمی نوێی جیهانی). هەر چەندە زاراوەی دیموکراتیەت یاخود (دەسەلاتی گەل) مێژوویەکی کۆنی مرۆڤایەتی داگیر کردووەو هەر لەمێژە لەکۆمەڵگای کۆنی گریکەوە باسی کراوەو بەچەندین قۆناغدا تێپەڕیووە، بەلام تائێستاش سەیردەکەین پیادەکردنی دیموکراسیەت لەلایەن رژێمە کۆنە پەرست و دیکتاتۆریەکانەوە شێوێنراوەو بەپێی بەرژەوەندی رژێمەکانیان هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەن، وەك دەبینین هەندێکیان پەرلەمانی کارتۆنیو رووکەش و بێ ئیرادەو دوور

لەخواستی گەل دادەمەزرێنن، کە هیچ کاریگەرییەکیان نی یە لەسەر دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکەو هەندێکی تریان ڕێگە بە کەمێك ئازادی رۆشنبیریو ئابووری دەدەن بەمەرجێك کارنەکاتە سەر گۆڕینی رەوتی سیاسیو ئالوگۆری سیاسی لەوڵاتدا، دیارە ئەو گۆڕانکاریانەش لەئەنجامی هاتنەمەیدانی ئەو شەپۆلە فراوانەیە کە دیموکراتیەت هەیەتی بەسەر سەراپای جیهان و کاریگەری ئەو شێوازی ژیانە بەسەر عەقڵی چ وەك تاك (فرد) چ وەك کۆمەڵ، دەتوانین بڵێین دیموکراسیەت واتە سەربەستی خەڵك تا ئەو رادەیەی کە نەبێتە پێشێلکردنی مافە ئابووریو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتییەکانی کەسانی تر، واتە مرۆڤ با ئازاد بێت تا ئەو رادەیەی ئازادیو مافی کەسانی تر پێشێل نەکات، ئاشکرایە لێرەدا باس لەئازادیش کرا چونکە بنەمای پتەوی دیموکراتیەت لەسەر ئازادی بنیات نراوە، لەبەر ئەوەی ئازادی سیاسیو رۆشنبیریو ئالو گۆڕی ئابووری.. مەرجی سەرەکی کۆمەڵگای دیموکراتین، واتە بەسەر کووتکردنی ئازادی خەڵك دیموکراتیەت هیچ مانایەکی نامێنێت.

لێرەشدا (ژان پۆل سارتەر) سنوورێك بۆ ئازادی مرۆڤ دەست نیشان دەکات و دەڵێت: (ئازادی تۆ لەو شوێنەدا کۆتایی دێت کە ئازادی منی تیادا دەست پێدەکات)، لەبەر ئەوە دیموکراتیەت بۆتە خاسیەتێکی گشتی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەم سەردەمەدا، واتە دەبێت شێوازی ژیانی خەڵك و هەڵسوکەوتە کۆمەڵایەتیەکانیش گۆڕانی بەسەردا بێت و رێگای بەرەوپێش چوون و رزگاری مرۆڤایەتی کە کۆت و بەندەکان بەپێی چاکسازی لەگشت بوارێکدا و قۆناغ بەقۆناغ روویدات، کەواتە ئەگەر لەسەردەمەکانی پێشوودا گۆڕانکارییەکان لەرێگای خوێن رشتن و شۆڕشی چەکداریو کودەتای سەربازیو توندو تیژییەوە کۆتایی هاتبێت، ئەوا خاسیەتی گۆڕانکاری ئەم سەردەمە بەهۆی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو بەرژەوەندی ئابووریو عەقڵی مرۆڤەوە گۆڕاوەو شێوازێکی نەرم و هێمنی بەخۆوە گرتووە کە ئەویش لەپەرلەمان و هەڵبژاردنی ئازادی چەند ساڵ جارێك دا خۆی دەنوێنێ، بەڵام بەداخەوە لەم رەوتی شارستانیەت و مەدەنیەتە کۆمەڵگای کوردی لێی بێ بەش بووە بەهۆی نەبوونی گیانی سەربەخۆو چەوسانەوەی نەتەوەییو دەوردانی سنورەکانی لەلایەن داگیرکەرە شۆڤینەکانەوە کە تائێستا بەعەقڵی سەدەکانی ناوەراست بیردەکەنەوە.

بەڵام ئەگەر بەوردی سەیری دیموکراتییەت و شێوازی پەرلەمانی بکەین دەبینین بەبێ خەوش نی یە، ئەگەر سەیر بکەین مرۆڤێکی رۆشنبیری عەقڵانی خاوەن ئەزموون لەگەڵ مرۆڤێکی کە سۆز رابەرە لەبڕیارداندا لەیەك ئاستدان و یەك رەنگیان هەیە،

یاخود ڕێگەدان بەهەندێ حیزب و ڕێکخراوی سیاسی کە بەشداری لەهەڵبژاردندا بکەن، ئەگەر کۆمەڵگاو هەلومەرج ڕێگەیان پێبدات (بەتایبەتی لەکۆمەڵگای رۆژهەلاتدا) ئەوا پێشێلی گشت بنەما دیموکراتیەکان دەکەن و خاوەنی ئەو بڕیارو راگەیاندنانەی پێشووی خۆیان نین، چونکە ئەم گروپە سیاسیانە لەبنەڕەتدا بڕوایان بەئازادیو دیموکراتیەت نییەو لەگەڵ ستراتیژیاندا ناتەبایە، بەڵکو بەناچاریو لەژێر فشاردا هاتوونەتە ژێرباری ئەوەی کە دیموکراتیەت قبوڵ بکەن چونکە ناچارن تادەگەنە دەسەلآت ڕێز لەئیرادەو فکری کۆمەڵ بگرن، کەواتە باشترە بەشداری کردن لەپرۆسەی هەڵبژاردندا تەنها ئەو حیزب و گروپە سیاسیانە لەخۆ بگرێت کە دیموکراتیەت ستراتیژو ئامانجیانە، نەك دیموکراتیەت وەك تاکتیك سەیر بکەن تادەگەنە دەسەلآت و ئەگەر هەلومەرجیشیان بۆ رەخسا دەست بکەن بەسەر کووت کردن و پێشێلی دەستکەوتەکانی جەماوەر بکەن، دەبێت ئەوەش لەیادنەکەین کە دیموکراتیەت واتە دەسەلآتی زۆربەی خەڵك و ڕێزگرتنی مافی ئازادی کۆمەلآیەتیو ئابووریو رۆشنبیری تاك (فرد)و کەمایەتیەکان و پێشێل نەکردنی مافی هیچ کەسێك لەژێر هەر چ بڕوبیانوویەکدا بێت، کەواتە لەبەر ئەوەی پێکەوە ژیانی دیموکراتیانە لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری کۆمەڵەوە شەرعیەتی پێدراوەو مێژوویەکی درێژی مرۆڤایەتی بەمەبەستی گەیشتن بەو ئامانجانە لەهەوڵ و تێکۆشاندا بووەو چەندین قوربانیو شۆڕش لەپێناو دیموکراتیەتدا هاتۆتە مەیدان و تائێستاش دیموکراتیەت سەرکەوتوو ترین و گونجاو ترین و واقیعترین شێوازی ژیانە، دەبێت گشت حیزب و ڕێکخراوێکی سیاسیو جەماوەری گەر خۆی بەنوێنەری گەل و هەڵقولآوی کۆمەڵ بزانێت ڕێز لەخواست و ئامانجەکانی گەل بگرێت کە لەدیموکراتیەتدا خۆی بەرجەستەدەکات.

ئەو تیشك خستنە سەر چەمکی دیموکراتیەتە دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە باشترین ڕێگا بۆ دەرباز بوون لەو قەیران و ئالۆزییەی ئەمڕۆی کۆمەڵگای کوردستان و چارەسەرکردنی کێشەی کەمە نەتەوەکان و بیروڕا جیاوازەکان و ئاینە جیاوازەکان.. تەنها دیموکراتیەتی راستەقینەیەو هەر ئەم شێوازی بیر کردنەوەیە دەتوانێت خزمەتێکی واقیعیانەی کۆمەڵگای کوردستان بکات و هیچ جۆرە پچڕانێك و لێك ترازانێك دروست نەبێت لەنێوان خواستی خەڵکی کوردستان و دەسەلآتی حوکم دا، کەواتە کۆمەڵگای کوردستان تەنها لەسایەی دیموکراتیەتدا دەتوانێت ئەوە بسەپێنێت کە نابێت هیچ جۆرە مانگرتنێك و خۆپیشاندانێك لەپێناو چارەسەر

کردنی کێشە ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەلآیەتی‌یەکانی خەڵکی کوردستان بەهەڕشەو خیانەت دابنرێت بۆ سەر سیاسەتی ئەو وڵاتەو دەسەلآتی فەرمانڕەوا، وە لانی کەم داوای بیمەی کۆمەلآیەتی (التأمین الاجتماعی) بکات ئەگەر لەمرۆشدا نەتوانرێت وەك پێویست بیمەی بێ کاری واتە کاری پێویست و گونجاو بۆ گشت ئەو کەسانەی توانای کارکردنیان هەیە دابین بکرێت، کەواتە لایەنێکی هەرەباشی دیموکراتیەت ئەوەیە کە حیزبێك لەماوەی دەسەلآتی حوکمی‌دا ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر مایەوە کارە چاکەکانی‌و سیستەمە کۆمەلآیەتی‌یەکانی‌و ئابووری‌و سیاسی‌یە ئیجابیەکانی، دەبێتە بەشێك لەژیانی خەڵك، واتە لەعەقلی خەڵکدا جێگیردەبێت و حیزبی دوای ئەویش کە دەسەلآت دەگرێتە دەست ناتوانێت ڕەتی بکاتەوە چونکە کۆمەڵگا شەرعیەتی پێ داوەو بەشێکیشە لەژیانی‌و لەسەری ڕاهاتووە، وە ئەو حیزبەش لەپێناو بەرژەوەندی خۆی‌دا بێت، یاخود لەبەرژەوەندی کۆمەڵدا بێت لەپێناو مانەوەی دەسەلآتی خۆی درێژەی پێدەدات و هەوڵی بەرەوپێشەوە بردنی دەدات.

هەر لەبەر ئەوەی دیموکراتیەتیش پەیوەندی پتەوی لەگەڵ ناخی مرۆڤدا هەیەو دەبێت ئاستی فکری مرۆڤ ژیانی دیموکراسیانە قبوڵ بکات و ناتوانرێت بەزۆر بسەپێنرێت، کەواتە دەبێت هێمن هێمن دەست بەگۆڕان بکرێت، چونکە زۆر کەسی ئاسایی‌و لێپرسراویش هەن لەروو دیموکراسیەت قبوڵ دەکەن بەلآم کاتێك پراکتیك دەکرێت دژی دەوەستن چونکە ئاستی فکری‌و دەروونیان نەگەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە هەزمی دیموکراتیەت بکەن بەشێوازێکی واقیعی، چونکە ئەوانە وادەزانن پیادە کردنی دیموکراتیەت واتە نەمان و لاوازبوونی دەسەلآتی ژیان، بەلآم لەراستیدا پیادە کردنی دیموکراسیەت واتە بەرهەم هێنانی شێوازێکی نوێ‌و شێوەیەکی باشتر لەدەسەلآت، ئەم شێوازە نوێیەش لەدەسەلآت واتە هاتنەمەیدانی بیروڕای جیاواز کە هەموویان سەرەڕای جیاوازی فکریان و شێوازی بەڕێوەبردنی ئابووری‌و کۆمەلآیەتیان لەسەر ئەوە ڕێك و تەبان کە ڕیز لەدیموکراتی‌و ئازادی تاك و کۆبگرن، وە جیاوازییەکی تری دیموکراسی لەگەڵ دیکتاتۆری‌و دەسەلآتی تاکە کەسی‌دا ئەوەیە کە شێوازی بەڕێوەبردنی خەڵك و یاسا گشتی‌یەکان لەدەسەلآتی دیموکراتیدا ناتوانرێت لەسەر بنەمای فکری تاکی دەسەلآتدار دابمەزرێت، کەواتە بواری کارکردن فەراهەم دەکرێت و گشت کەسێك دەتوانێت بەشوێن خۆشبەختی خۆیەوە بێت، واتە لەنیزامی دیموکراتیدا بەرژەوەندی تاك و گشت پارێزراوەو یەکیش دەگرنەوە، وە

مەعریفەی دەسەلأت لێرەدا ملکەچی زۆربەیە نەك زۆربەی خەڵك ملکەچی دەسەلأتی چەند کەسانێك بن.

هەروەك پێشتر باسمان کرد کە دیموکراتی شێوازێکی ژیانەو لەدەوڵەتدا دەبێت پیادە بکرێت، کەواتە بۆ ئەوەی ئاستی هۆشیاری خەڵك بگاتە ئاستی فکری دیموکراسی دەبێت لەئێستاوە خەباتی بۆ بکرێت و کێشەکانی ناوخۆی پێ چارەسەر بکرێت و هەر لەم رێگە شارستانیەشەوە حزب و رێکخراوەکان هەیکەلی تەنزیمی خۆیان رێك بخەن، بۆ ئەوەی ئەم شێوازەی خەبات لەداهاتووی حوکمیشدا بسەپێنرێت جا چ لەچوارچێوەی دەوڵەتانی داگیرکەردا بمێننەوە یاخود هەر لەم رێگە شارستانیەوە بتوانین مافەکانی نەتەوەی خۆمان بەدی بهێنین کە لەپێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆدا خۆی دەبینێتەوە، کەواتە دیموکراسی دروست کەری رۆحی پێکەوە ژیانە بۆ ئەو میللەتە جیاوازانەی کە لەچوارچێوەی دەوڵەتدا دەژین.

# سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە

بۆ ئەوەی ڕێکخراوێکی سیاسی بتوانێ ئامادەیی خۆی نیشان بدات لەگۆڕەپانی سیاسیداو بوونی خۆی بسەلمێنێ، ئەندامی کارامەو ڕێکخستنێکی پتەو دەبنە خاڵێکی گرنگی گشت ڕێکخراوێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، هەر لەڕێگەی دڵسۆزی ئەو ئەندامانەوەو کاریگەریان لەسەر ڕێکخستنی جەماوەر بەبڕوایەکی پتەو بەوەی کە ئەمڕۆ مرۆڤی کورد بێ ناسنامەیەو لەژێر هەڕەشەی سڕینەوە دایە لەرووی وجودی نەتەوەییەوە، پێویستە هەموو کوردێك وشیار بکرێتەوە بۆ ئەوەی لەنەمان ڕزگاری بێتو بتوانێ بەشێوەیەکی هاوچەرخانەو ژیانێکی شایستە بەمرۆڤ مارەسەی پێداویستیەکانی ژیانی خۆی بکات.

بۆ ڕێکخراوێکی ئازادی خوازو پێشکەوتن خوازی وەك یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان (YNDK) ئەندامانی هەمیشە دەبێت لەهەوڵی ئەوە دابن پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە YNDK بەرگری لەدەسکەوتەکانی جەماوەر دەکات و ئەو کەس و ڕێکخراوو حیزبانەی کە هەنگاوێك بەدژی دەسکەوتەکانی جەماوەرەوە دەنێن کە لەدیموکراسیو ڕزگاری تەواوی خاکی کوردستاندا خۆی دەبینێتەوە، بەتووندی ئیدانەو مەحکومی کارەکانیان دەکەن، دەبێت گیانی ئازادی خوازانەی مرۆڤی کورد زیندوو بکرێتەوەو پەرەی پێ بدرێت کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست کردنی ئیلتزام و بەگەڕ خستنی عەقڵ بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو کارو کردەوانەی کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، بۆ نموونە:

ڕۆڵی خراپی ڕژێمی فاشی بەعس بۆ سەر جەماوەری کوردستان و دروست کردنی شلەژانی دەروونی لای مرۆڤی کورد، چونکە هەموو ڕژێمە یەك لەدوایەکەکان کە حوکمی عێراقیان کردووە هیچ بایەخێکی ئابووریو کۆمەڵایەتیان بە کوردستان نەداوە، وەك (نەبوونی کارگەی پێویست، بایەخ نەدان بە کەرتی کشتوکاڵ..) بۆ ئەوەی مرۆڤی کورد هەمیشە چاوی لەدەسەڵاتی مەرکەزی بێت.

هەرچەندە ماوەی چەند ساڵێکە ڕژێمی دیکتاتۆر کوردستانی بەجێ هێشتووە، چونکە عەقڵی مرۆڤی کوردی داگیرکرد بوو، هەتا ئێستاش دەورو کاریگەری هەر بەردەوامە لەسەر ژیانی خەڵك، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە حیزبە باڵادەستەکانی کوردستان واتێگەیشتوون دەسەڵات هەر ئەوەندەیە کە پاشە کشەیەك بەهێزەکانی ڕژێمی عێراقی بکەن و کوردستان لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بێت، بەڵام ئاشکرا بوو کە

دەسەلاّتی راستەقینە تەنها خۆسەپاندن نییە، بەڵکو دەبێت ژیانی خەڵك دابین بکریّو ئاسەوارە خراپەکانی دیکتاتۆریەت بسڕێتەوە، ئازادی خەڵك بپارێزریّو بایەخ بەگەشەسەندنی کۆمەڵگا بدات و.. بەلاّم بەداخەوە تائێستا حکومەتی هەرێم نەیتوانیووە ئەم ئەرکە بەپەلانە بەتەواوی بەجێبهێنێت کە یەکێکە لەئەرکە پێویستەکانی دوای راپەڕینی (١٩٩١)، چونکە بۆ خەڵکی هیلاکی دەستی رژێمی بەعس و زوڵم و زۆری ئەو رژێمە، شەڕی ناوخۆیان کردە دیاریو بۆ نەمانی دیکتاتۆریەتیش بەپێی توانا رێگە لەئازادی سیاسیو چالاکی رێکخراو بوون دەگیرێت.

زیاد لەو خالاّنەش هەوڵی زۆربەی حیزبە کوردستانیەکان لەگۆڕەپانی کوردستانی ئازاد کراودا بۆ ئەوەبوو کە هێزو توانای خەڵکی کوردستان بۆ رزگاریو پاراستنی کوردستان بەکارنەیەت، بەڵکو بەپێچەوانەوە هێزو توانای خەڵکی کوردستانیان بۆ فراوانکردنی دەسەلاّتی تاکە حیزبی شەڕی ناوخۆ بەکاردەهێناو پاراستنی ئاسایشی حیزبی خۆیان هێندە بایەخ پیّ دەداو فراوان دەکرد، وە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی ئاسایش و خۆشگوزەرانی خەڵکی کوردستان لەفەرهەنگی سیاسیاندا هیچ ئامادەبوون و وجودێکی نەبوو.

سەرەڕای ئەوەی کە (یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان- YNDK) پەنجە لەسەر کەم و کورتیەکان دەدانێت و دەست نیشانیان دەکات لەهەمان کاتدا چارەسەرێکی واقیعیانەی بۆ دیاری دەکات لەرێگای بڕوابوون بەپەیڕەو پرۆگرامی خۆی هەوڵ دەدات بۆ چەسپاندنی بەشێوازێکی پەیووەست بەعەقڵی سەردەم.

لەبارەی گەورەترین گرفتی میللەتی کورد قوربانی بۆ داوەو تائێستاش بیّ چارەسەر ماوەتەوە ئەویش چارەسەرێکی ریشەیی چەوساندنەوەی نەتەوایەتیە لەسەر گەلی کوردستان، ئاشکرایە رژێمە دواکەوتووە کۆلۆنیالیستەکانی کوردستان کۆمەڵێك بیری کۆنەپەرستی زالّ بووە بەسەریانداو وای کردووە کە نەتوانن لەگەلّ نەتەوەی کورددا بەیەکسانی لەمافەکانیاندا بژین، دیارە ئەمەش بەرهەمی عەقڵی دواکەوتووی میللەتانی ناوچەکە بووە، چونکە ئاشکرایە کە دەوڵەت و دەسەلاّت بەپێی گۆڕانی عەقڵی کۆمەلّ و ئاستی رۆشنبیری خەڵك دەگۆڕێت، کە لێرەشدا هەر رژێمە دواکەوتووە حاکمەکان بەرپرسیارن، چونکە وەك ئاشکرایە ئەو رژێمانە نەیان ویستووە مافە ئینسانیو دیموکراتیو ئابووریو رۆشنبیریو کۆمەلاّیەتیەکانی

خەڵکی کوردستان دەستەبەر بکەن و لەئەنجامدا مرۆڤی کورد تووشی جۆرەها چەوسانەوە هاتووە.

هەر لەبەر ئەوەی چەند میللەتێك بتوانن پێکەوە بژین لەچوارچێوەی دەوڵەتێکدا دەبێت چەند زەروورەتێکی مادی یاخود رۆحی (مەعنەوی) بەیەکەوە گرێیان بدات بۆ کەم کردنەوەی کەم و کورتیەکانی خۆیان، وەك:

یەکەم: لایەنی ئابووری دووەم: لایەنی دینی (ئاینی)

# یەکەم: لایەنی ئابووری

هەندێك نەتەوە لەدونیادا هەن کە زەروورەتی ئابووری وەك (نەوت و کەرەسەی خاوی پیشەسازیو ئاو..) وایان لێ دەکات لەبەر بەرژەوەندی گشتی پێکەوە بژین، بەڵام کوردستان لەڕووی ئابوورییەوە دەتوانێت گەشە بەئابووری خۆی بدات لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆداو پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە رێك بخات بەپێی بەرژەوەندی هاوبەشی ئابووری، چونکە لەڕووی کشتوکاڵ و کەرەسەی خاوی پیشەسازیو ئاوو پترۆل و کارەباو خزمەتگوزاریەکانی تر دەتوانێت پێویستیەکانی خەڵکی کوردستان تێر بکات. روون و ئاشکرایە کە کۆنترۆڵ کردنی ئابووری لەهەر جێگەیەکدا واتە کۆنترۆل کردنی دەسەلات، وە تەواوی داهاتی کوردستانیش دەستی بەسەردا گیراوە، لەبەرانبەر ئەم کارەشدا بیمەی کۆمەلأیەتی (التأمين الاجتماعي) پێویست بۆ خەڵکی کوردستان دابین نەکراوە (هەرچەندە بەشێکی باشووری کوردستان رزگار کراوە، بەڵام شوێنە ستراتیژیو گرنگەکانی داهاتی کوردستان هەر بەداگیرکراوی ماوەتەوە).

هەرچەندە دەزانین نەمانی چەوسانەوەی ئابووری مانای ئەوە نی‌یە کە گشت جۆرە چەوسانەوەکانی دیکە ریشەکێش بوون چونکە چەوساندنەوەی نەتەوەی کورد تەنها لەڕووی ئابووریەوە نەبووە، بەڵکو شێوازی جیاوازو نەخشەی جیاوازو ستراتیژی جیاواز هەبووە بۆ بەرگرتن لەگەشەی کۆمەلأیەتی کوردو توند کردنی ستەم و چەوسانەوەی نەتەوەیی لەسەر خەڵکی کوردستان.

کەواتە گەشەپێدانی کوردستان لەڕووی ئابووریو رۆشنبیریو چاککردنی باری گوزەرانی خەڵکی کوردستان هەنگاوێکی جدیو عەمەلیە بۆ سەربەخۆییو

سەلماندنی توانای نەتەوەی کورد لەرووی بەڕێوەبردن و توانای پێك هێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی پێشکەوتنخوازو ئازاد کە ئیرادەی خەڵکی کوردستان پشتگیری لێ بکات.

## دووەم- لایەنی ئاینی:

هەندێك وڵات لەدنیادا سەرەڕای جیاوازی نەتەوەییان دەتوانن پێکەوە ژیان بەسەر بەرن، بەمەبەستی پڕکردنەوەی کەم و کوڕییەکانی ژیانی ئابووری‌و سوودی هاوبەشی نەتەوە جیا جیاکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە مەرکەزییەی کە لەباوەشی‌دا کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی بتوانن لەگرفتی ناوخۆیی‌و هێرشی دەرەوە خۆیان بپارێزن چەند بنەمایەکی فکری‌و رۆحی دروستی دەکەن لەناخی دانیشتوانەکەیاندا، یەك لەو لایەنە بەهێزانەش ورووژاندنی هەستی رۆحی‌و ئاینی‌یانە کە پێکەوە گرێیان بدات و بتوانن بە بەردەوامی چوارچێوەی دەوڵەتەکەیان بپارێزن، بەڵام ئەم شێوازە گرێ دانەش بەهەر چ شێوازێك بێت سەرکەوتوو نابێت و ناتوانن بەشێوازێکی هاوچەرخانەو گونجاو ئاسایش و بەرابەری نەتەوەکان بپارێزن، بەتایبەتی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چونکە لەم نموونانە لەمێژوودا بەکردەوە سەلمێنراوە وەك جیابوونەوەی بەنگلادیش لەپاکستان، سەرەڕای نەبوونی کێشەی ئاینی، بەڵام کێشە نەتەوەییەکانیان هەر بەچارەسەر نەکراوەیی مایەوە تا جیابوونەوەی بەنگلادیش، بەپشتیوانی‌و داوای هاوکاری کردن لەهیندستان، هیندستانێك کە لەڕووی ئاینی‌و نەتەوەییشەوە جیاوازییان هەیە.

هەروەها بنەما فکرییەکانی سەردەمیش نەیان توانی چارەسەری ریشەکێشی پێکەوەژیانی نەتەوەکان بکەن بەشێوازێکی ئاشتی‌یانەی دوور لەدیکتاتۆری‌و زۆرەملێ، لێرەشدا یەکێتی سۆڤیەتی جاران باشترین نموونەیەو وە ئاژاوەو نائارامی وڵاتانی کۆلۆنیالیستی هەر یەك لە (عێراق و ئێران و سوریاو تورکیا) بکەینە نموونەیەکی بەهێزی ئەم باسەمان، هەر چەندە نەتەوەی کورد لەڕووی ئاینی‌یەوە مێژوویەکی کۆنی لەگەڵ نەتەوەی عەرەب و نەتەوەکانی تری دراوسێ هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم لایەنی ئاینییە نەبۆتە لایەنێکی بەهێزو پێویست بۆ گرێدانی نەتەوەی کوردو نەتەوەکانی تری وەك (تورك و عەرەب و فارس) بۆ ئەوەی پێکەوە

ژیان بەسەربەرن، هەر لەبەر ئەمەش ناتوانن ئازادانەو بێ چەوسانەوە پێکەوە بژین، چونکە ناتەبایی‌و ململانێ لەجێگەیەکی ترەوە سەرهەڵدەدات کە داگیرکاری ئابووری‌و چەوساندنەوەی نەتەوەییە، ئاشکراشە کە نەتەوەی کورد وابەستەی نەتەوەی زۆر بەهێزترە لە وابەستەی ئایینی، کەواتە خەڵکی کوردستان کامڵ بوونێکی سەرتاپای هەیە بۆ ئەوەی بتوانێ لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆدا بژی چ لەڕووی ئابووری‌و گرنگی جوگرافی‌و لایەنەکانی تریش.

بۆ ئەوەی نەتەوەی کوردو نەتەوەی عەرەب و تورك و فارس وەك دوو میللەتی تەباو بەشێوازێکی هاوچەرخانە ژیان بەسەربەرن، پێویستە سەربەخۆیی کوردستان بکرێتە ستراتیژو ئامانجی هێزە رزگاری خوازەکانی کوردستان، YNDKش وەك رێکخراوێکی سەربەخۆ خوازو پێشکەوتنخواز بەشکلێکی مەبدەئیانەو هاوچەرخانە هەوڵی رزگاری‌و یەکگرتنەوەی کوردستان دەدات لەرێگای وشیار کردنەوەی جەماوەری‌و رێکخستنیانەوە لەپێناو ئەوەی کە نەتەوەی کورد وەك سەرجەم نەتەوەکانی تری ناوچەکەو مرۆڤایەتی بەشێوازێکی هاوچەرخانەو لەژێر سیستەمێکی ئازاددا ژیانێکی شارستانیانەو هاوچەرخانە بەسەربەرن.

وە چەند لایەنێکی گرنگی تر هەن کە یارمەتی دەرو زەرورەتێکی حەتمین بۆ ئەوەی گشت نەتەوەیەك بتوانێ ئازادانە داوای سەربەخۆیی‌و پێکهاتنی دەوڵەت بکات و بتوانێت بەشێوازێکی سەرکەوتووانەو دیموکراتیانە پارێزگاری سنوری جوگرافی‌و کاروباری ناوخۆی خۆی بکات، وەك: ١.زمان، ٢.خاك، ٣.پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، ٤.مێژوو، چونکە هەر نەتەوەك لەدونیادا گەر داوای سەربەخۆیی کردبێت، جگە لەتووندو تیژی کۆلۆنیالیستەکان و داگیرکەران لەوانەیە چەندین گرفتی مادی‌و مەعنەویان بۆ دروست بووبێت کە رێگربووە لەئاست دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەییان و دروست کردنی گرفتیش بۆ پاشی رزگاربوونیان لەژێر دەستی دەوڵەتانی کۆلۆنیالیست، وەك دیار نەبوونی تەواوی سنوری جوگرافی‌و جیاوازی ئاستی هۆشیاری لەنێوان ناوچەکاندا کە بۆ رێکخستنی جەماوەری‌و گرێدانی خەباتی گشت ناوچەکان بەیەکەوە کارێکی قورس دەبێت، کەواتە ئەو لایەنانە گەر چارەسەر نەکرابوون هەموویان پێکەوە دەبنە گرفت لەرێگەی بنیات نانی ئاسودەیی‌و رزگاری بۆ نەتەوەیەك لەژێر ستەمی نەتەوەییدا رزگاری نەبووبێت، تەنانەت گەر رزگاریشی بووبێت هەر دووچاری گرفت دەبێت.

سەرەڕای ئەوەی لەسەرەتادا باسی دوو خاڵمان کرد (لایەنی ئابووریو ئاینی) ئەگەر یەکلانەبوویێتەوە دەبنە دروست کردنی گرفت لەڕێگەی سەربەخۆبوونی نەتەوەیدا، لێرەشدا تیشکێك دەخەینە سەر هەندێك لایەنی زۆر گرنگ کە ئەمانیش یارمەتی دەرن بۆ ئەوەی نەتەوەی کورد سەربەخۆی بکاتە تاکە ئامانج و حیزب و ڕێکخراوە ئازادیخوازەکانیش سەربەخۆیی کوردستان تاکە ستراتیژیان بێت، واتە تاکە ڕێگا لەبەردەم نەمانی چەوسانەوەی نەتەوەییو رزگاربوونی نەتەوەی کورد لەزۆر گرفتی ئابووریو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری سایکۆلۆژیو.. تەنها سەربەخۆیی کوردستانە.

لێرەشدا بەکورتی باسی هەریەکە لەو لایەنە گرنگ و بەرچاوانە دەکەین:

## ١-زمان:

سەرەڕای بوونی هەموو لایەنە پێویستەکانی نەتەوەیەك بۆ ئەوەی بتوانرێت دەسەڵاتێکی پتەو بنیات بنرێت و پارێزگاری لەئاسایشی نەتەوەیی (الامن القومي) خۆی بکات و بەپێی گۆڕانی بارودۆخی سیاسیو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو ئابووری پارێزگاری دەسەڵاتی یاسایی خۆی بکات، بوونی زمانێکی یەکگرتوو خاڵێکی بنەڕەتیو گرنگەو دەتوانین بڵێین رۆح و بەردەوامی مانەوەی ژیانی نەتەوەیە، بەڵام بۆ پارێزگاری کردن لەم لایەنە گرنگە لەوجودی نەتەوەدا پێویستیمان بەبوونی ئیرادەیەکی یەکگرتووی بەهێز هەیە، بۆ دروست کردنی ئەو ئیرادەیەش پێویستیمان بەوە هەیە کە لەعەقڵی مرۆڤی کورددا وەك زەروورەتێك ئەوە بچەسپێنین و پەرەی پێ بدەین کە هەستێکی ناوەکی (داخلي) لای مرۆڤی کورد هەیە کە وابەستەی دەکات بەپاراستنی زمان و خاکی خۆیو هەوڵدان بەرەو گەشەسەندنی یەکێتی نەتەوەیی (وحدة القومي) گەلی کوردستان، کەواتە لەکوردستاندا هەوڵدان بۆ پێکهێنانی زمانێکی یەکگرتوو لەپێناو پاراستن و گەشەسەندنی زمانی کوردی کە ئەمەش هیچ بایەخێکی پێ نادرێت و تەنانەت دووچاری سڕینەوەش هاتووە لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی وەك (تورکیاو سوریاو ئێران و عێراق)، ئەم کارە ناشارستانیانەی دەوڵەتانی داگیرکەر، هۆکارێکی گرنگە بۆ هاتنەکایەی هێزی رزگاری خوازی خەڵکی کوردستان.

کەواتە زمان تەنها شێوازێك نییە بۆ لەیەکتر گەیشتن، بەڵکو شێوازێکە بۆ گرێدانی کۆمەڵی مرۆڤ و دروست کردنی هەستێکی ناوەکی وەها بەهێز کە بتوانن پارێزگاری

لەوجودی مادیو مەعنەویو یەکتر بکەن و خۆشەویستیەکی رۆحی بەهێز وابەستەی یەکتریان دەکات، کە ببێتە هۆی دروست کردنی سنورێکی جوگرافی بەهێز.

## ٢-خاك:

لایەنێکی گرنگ و پێکهاتەیەکی زەروورە بۆ ئەوەی نەتەوەیەك بتوانێت بڕیاری پێکهاتنی دەوڵەت بدات، ئاشکرایە بەبێ بوونی سنورێکی جوگرافی دیاری کراو هیچ نەتەوەیەك ناتوانێت بیر لەدروست بوونی دەوڵەت بکاتەوە، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین خاك موقەدەسترین و پایەدارترین وجودە لای نەتەوە، چونکە هەر لەرێگای داگیرکردنی خاکەوە داگیرکەران دەتوانن سیمای نەتەوەییمان بەتەواوی بشێوێنن و ئەو کلتورو کەلەپوورو بەرهەمە ئابوورییانەی کە بەرهەم هێنراوە لەناوی بەرن و بەپێی بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بهێنن، وەهەر لەرێگەی داگیرکردنی خاکەوە دەتوانرێت زمانی نەتەوەییمان لێ قەدەغەبکرێت و جۆرەها چەوسانەوەمان بەسەردا بسەپێنرێت، کەواتە رزگارکردنی تەواوی ولات لەژێر دەستی داگیرکەراندا ئامانجی سەرەکیمانە دەبێت، تەنانەت ئەگەر لوتکە شاخێك یاخود گردۆلکەیەکیش کە هیچ سودێکی ئابووریشی نەبێت، نابێت چاوی لێبپۆشرێت، چونکە ئەگەر بەداگیرکراوی مایەوە مانای وایە بەشێکی قوودسیەتی نەتەوەییمان داگیرکراوەو سوکایەتی پێ دەکرێت، ئەمەش لەداهاتوودا کاریگەرییەکی پتەوی دەبێت لەسەر ئاسایشی نەتەوەییمان (الامن القومي).

سیفاتی گرنگی نەتەوە ئەوەیە کە وابەستەییەك هەبێت لەنێوان تاك و خاکدا، ئەم کارەش بەدرێژایی مێژوو هاتۆتە مەیدان و وای لێهاتووە کە هەستێکی رۆحی لەنێوان مرۆڤ و خاکدا دروست ببێت، کەواتە کاری گرنگی بزوتنەوەی نەتەوەییمان لەم قۆناغەدا پاراستنی یەکێتی خاکی کوردستانە لەپێناو پاراستنی یەکێتی نەتەوەیی (وحدە القومي)و سەروەری نیشتمانیدا.

هەر لەپێناو پاراستنی یەکێتی خاك و پتەوبوونی ژیانی کۆمەلایەتیدا دەبێت بەشێوازێکی دیموکراتیانە رێگە بەگشت بزوتنەوە سیاسیو کۆمەلایەتیو ئابووریو رۆشنبیرییەکان بدرێت، لەپێناو هاتنە مەیدانی نەخشەیەکی نەتەوەیی پێشکەوتنخواز بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆو هێرشەکانی دەرەوە کە مەبەستیان تێکدانی ئاسایشی نەتەوەییمانە، کەواتە بۆ پاراستنی خاك پێویستیمان بە بایەخ

دان بەلایەنی ئاشتیانەو بەهێزکردنی لایەنی سەربازی بۆ پاراستنی سنوری جوگرافی نەتەوەییمان.

## ٣- پێکهاتەی کۆمەڵایەتی:

گشت میللەتانی دونیا شێوازی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیان دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی شێوازی ژیانیان، واتە بەرەوپێش چوونی ئابووریو شێوازی دەسەلات و کاریگەری ئاین لەسەر بیروڕای خەڵکیو ئاستی رۆشنبیری کۆمەڵ و.. ئەمانە گشت پێکەوە ئاستی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی نەتەوە دیاری دەکەن و ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتیەش دەبێتە هۆی دەست نیشان کردنی شێوازی دەسەلاتی دەوڵەت، بۆ نموونە لەکاتێکدا عەقڵی خەڵك نەگەیشتبووە ئەو رادەیەی دیکتاتۆریەتی نازیو فاشیەتی ئیتالیا رەفز بکاتەوە، کە مرۆڤایەتیان دووچاری کێشەو کارەساتی زۆر گەورە کردبوو، بەلام ئاشکرایە کە ئێستا لەئەوروپا دیکتاتۆریەت لەلایەن ئاستی هۆشیاری خەڵکەوە قبوڵ نیەو ئەلتەرناتیڤی دیموکراتیەت جێگەی پڕکردۆتەوە، لەبەر ئەوە زۆر مەحاڵە جارێکی تر نیزامێکی سەرکووتکەر لەرۆژئاوادا سەرهەڵبدات، چونکە ئاشکرایە کە حیزب و رێکخراوی سیاسی بەرهەمی ئاستی هۆشیاری خەڵکی ئەو ولاتەن کە خەباتی تیادا دەکەن و رابەرانی میللەتیش هەڵقولاوی کۆمەڵگای خۆیانن لەبەر ئەم هۆکارە دەڵێین مەحاڵە جارێکی تر دیکتاتۆریەت باڵ بەسەر ئەوروپادا بکێشێت. بەلام لەبەر ئەوەی کۆمەڵگای رۆژهەلات بەگشتیو کوردستان بەتایبەتی تائێستا ئاستی فکری گشتی نەگەیشتۆتە ئەو رادەیەی بتوانێت بەتەواوی لەرێگای عەقڵەوە بڕیارە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی خۆی بدات و یاخود هەندێك جار لەرێگەی بیر کردنەوەیەکی هەڵەی وابەستە بەسۆز (عطف)وە بڕیار دەدات، وە کێشە گرنگ و چارەنووس سازەکان لەم ناوچانەدا زۆر کەم لەرێگای دان و ستانەوە دەگاتە ئەنجام بەڵکو زیاتر توندو تیژیو پەلاماری سەربازیو کاری تیرۆریستی رابەرە لە بەئەنجام گەیاندن و رێگاچارەی کێشەو گرفتەکان، بۆ نموونە (کێشەی بۆسنەو هەرسك و ئیسلامیەکان لەئەفغانستان و جەزائیرو شەڕی ناوخۆی کوردستان و..) کەواتە سەرکردە سیاسیەکان لەم ناوچانەشدا بەرهەمی عەقڵ و ئاستی هۆشیاری خەڵکن و هەڵقولاوی ناخی کۆمەڵگای خۆیانن، بۆیە دەتوانن ئامانجە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانیان لەسنووری دەسەلاتی خۆیاندا پیادە بکەن، کەواتە بۆ ئەوەی دیموکراتیەت و دانوستان ببێتە ئەلتەرناتیڤی کاری تیرۆریستیو سەربازی دەبێت

هەوڵ بدرێت بەپێی زەمەن بیری تیرۆریستیو توندوتیژی لەعەقڵی خەڵکدا بسڕینەوە تاوەکو کۆمەڵگایەکی شارستانی مەدەنی بنیات بنرێت، کەواتە لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەلایەتیدا ئەو مەعریفەیەی کە دەسەلاتی دەوڵەت پیادە دەکات گۆڕانی بەسەردا دێت، چونکە بۆ ئەوەی دەسەلاتی دەوڵەت لەگەڵ ئاستی هۆشیاری خەڵکدا بگونجێت دەبێت لەگەڵ ئاستی فکریو پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی خەڵکدا لەیەك ئاستدا بن و تەواوکەری یەکتری بن، لەبەر ئەوەی پێکهاتەی کۆمەلایەتی بنەمایەکی مێژوویی هەیەو گۆڕان بەسەر شێوازی ژیانی کۆمەڵدا دێت و بەرەو پێشەوە دەچێت و لەبەرانبەر ئەمەشدا دەبێت وەك شتێکی حەتمیو زەرووری شێوازی دەسەلاتیش گۆڕانی بەسەردا بێت و خۆی لەگەڵ کۆمەڵدا بگونجێنێت، بۆ نموونە (لەدەسەلاتی تاکە کەسیو بڕیاری فەردییەوە بۆ پەرلەمان و بڕیاری گشتی).

کەواتە گۆڕانی پێکهاتەی کۆمەلایەتیو بەسەردەم کردنی ژیانی کۆمەڵ مانای تێکچوون و نەمانی دەسەلات و شیرازەی کۆمەڵ نییە، کە هەندێك وای بۆ دەچن، کە لەرێگەی پێشکەوتنی کۆمەلایەتییەوە شیرازەی پەیوەندییە خێزانیو کۆمەلایەتیەکان لەبەر یەك بترازێت.

پێکهاتەی کۆمەلایەتی کوردستانیش چەندین بوارو لایەنی جیاجیا لەخۆ دەگرێت و چەندین هۆکاریش کاریگەرییان بەسەرییەوە هەیە وەك (لایەنی ئابووری، شێوازی ژیانی کۆمەلایەتیو رۆشنبیریو ئاینیو..) لەبەر ئەوەی لە کوردستانێکدا کە تائێستا بەدەست داگیرکارییەوە دەناڵێنیو لەڕووی نەتەوەییەوە چەوساوەو ئابووریو کلتوورو زمانی دەستی بەسەر داگیراوەو پارچە پارچە کراوە بەسەر چوار دەوڵەتی جیاواز لەڕووی فکرو رەگەزو شێوازی ژیان، دەبێت لەسایەی ژیانێکی لەم جۆرەدا پێکهاتەی کۆمەلایەتی خەڵکی کوردستان چەندە شێواوبێت کە زەمەنێکی مێژووی زۆرە بەدەست ئەم دابەش کردن و چەوسانەوەیەوە دەناڵێنێت.

بەشێوەیەکی گشتی سەرەڕای چەوسانەوەیەکی توندی نەتەوەییو ئابووری لەکوردستانێکدا کە داهاتێکی نەوتیو گشتوکاڵیو ئاوی زۆری هەیەو چەوسانەوەیەکی رۆشنبیری ئەوەندە بەهێز کە تەنانەت نەخوێندەواری زۆر پەرەی سەندووەو ئەوەشی کە دەخوێنرێت دوورە لەمێژوو و جوگرافیاو کلتوری رەسەنی کوردی، کەواتە لەژێر سایەی ئەم دەستبەسەریو چەوسانەوەیەدا دەبێت پێکهاتەی کۆمەلایەتیو ئاستی رۆشنبیریو سایکۆلۆژی مرۆڤی کورد دوچاری چ دوا کەوتنێك و تێکچوونێك بووبێت، کە لەپاش رزگاری نەتەوەیش چارەسەری ئەو بوارە جیا

جيايانە زەمەنێکی زۆری پێویستە. بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو چەوسانەوە فراوانەی کە سەرتاپاگیرییەکی لەکوردستاندا دروست کردووە، سەیر دەکەین جۆرە پەیوەندییەکی بەهێزی ماددیو مەعنەوی لەنێوان مرۆڤی کورددا هەیە کە ڕێگە دەگرێت لەوەی کە پێکهاتەی رەسەنی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا بەتەواوی لەبەر یەك هەڵبوەشێتەوە، بۆ نمونە سەرەڕای ئەو هەموو چەوسانەوە رۆشنبیریو زمانیو ئابوورییە، مرۆڤی کورد پارێزگاری لەزمانی رەسەن و کلتووری نەتەوەی خۆی کردووەو خەباتی لەپێناوی رزگاری نەتەوەیدا درێژە پێ دەدات و جەماوەری کوردستانیش دووچاری رەشبینیەکی وەها نەهاتووە، کە بەشێوازێکی گشتیو مەبدەئی دەست بەرداری خەباتی رزگاری خوازی خۆی ببێت، وە بوونی دیالەکتیکی جیاو ئاین و مەزهەبی جیاواز کاری نەکردۆتە سەر پچڕانی رۆحی نەتەوەیی لەنێوان ئایینە جیاوازەکان و دیالیکتەکان، کەواتە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەکوردستاندا هەر چەندە دووچاری شێواوی بووبێت و هەر بەدواکەوتووی مابێتەوە، جۆرە وابەستەییەك لەنێوانیاندا هەیە کە هەموو بتوانن خەباتی رزگاری نەتەوەییو سەربەخۆی تەواوی کوردستان ستراتیژیان بێت، بەپێی ئەو قۆناغ و بارودۆخەی ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرەکانیان، چونکە ئاشکرایە کە هەر دەوڵەتێکی داگیرکەر شێوازو نەخشەی جیاوازی چەوساندنەوەی پیادە کردووە، لەبەر ئەوە پیادەکردنی شێوازی خەبات لەهەر ناوچەیەکدا شێوازی تایبەتی خۆی هەیە تاوەکو بتوانین بەشێوەیەکی واقیعیانەی سەرکەوتوو سەراپای نەتەوە بەرەو رزگاری تەواوو نەمانی چەوساندنەوەی نەتەوەیی بەرێ بخەین.

## ٤-مێژوو:

مێژوو بەگشتی واتە ململانێی نێوان هێزە جیاوازو دژەکان، هاوکاری کردنی نێوان هێزە هاوپەیمانەکان، گۆڕانی یەك لەدوای یەکی دەسەڵاتەکان، وە تۆمارکردنی تراژیدیاو کۆمیدیای ژیان، وە مێژووش سەلمێنەری وجودی دەسەڵاتە، ئەگەر خۆت ئیدارەی خۆت نەکەیت دەسەڵاتێکی تر دەسەپێت بەسەرتدا، کەواتە مێژوو سەلمێنەری ئەوەیە کە بوونی دەسەڵات زەروورەتێکی حەتمیە، یاخود دەتوانین بڵێین مێژوو ململانێیە لەنێوان هۆشیاریو هۆشیاری هەڵەدا، لەنێوان خۆشەویستیو رق و تۆڵەدا..، بەگشتی مێژوو لایەنی چاك و خراپیمرۆڤایەتییە..، با بزانین مێژووی نەتەوەی ئێمەی بن دەست لەناو گێژاوی مێژووییدا دووچاری چ جۆرە ئومێدو

ڕەشبینیەك بووە بەپێی گۆڕانی سەردەم و هەل و مەرجەکان، مێژووی نەتەوەی کورد مێژووی شەڕو ململانێ بووە لەپێناو مانەوەی نەتەوەییماندا، دەتوانین بڵێین نووسینەوەی مێژووی نەتەوەی کورد واتە نووسینەوەی تراژیدیایەکی سەختی درێژخایەن، چونکە نەتەوەی کوردی هەمیشە چەوساوە ناچار بووە بەخوێن رشتن و قوربانی دان بەرگری مانەوەی خۆی بکات، ئاشکرایە ئەوەش نیشانەی ئەوە نییە کە مرۆڤی کورد شەڕخواز بووە، بەڵکو شەڕ سەپێنراوە بەسەری‌داو شەڕی لەپێناو ئازادی‌و رزگاری‌دا دەست پێ کردووە، بەڵام لێرەدا تەنها بواری ئەوە هەیە ئەو هێڵە گشتی‌یانە دەست نیشان بکەین کە مێژووی کوردی لەسەر ڕۆیشتووەو تائێستاش دووبارە دەبێتەوەو لەپاڵ ئەوەشدا هاوبەشی مێژووی نەتەوەییمان دەست نیشان بکەین، کە لایەنێکی گرنگ و پێویستە بۆ بنیات نانی وڵاتێکی سەربەخۆ.

زۆر نەتەوەو ئیمپراتۆرە باڵادەستەکانی مێژوو بەپێی گۆڕانکاری‌و تێپەڕینی زەمەن لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوە، وە زۆر لەمیللەتان پارچە پارچە بوون و لەڕۆژگاری ئێستاماندا هەریەکەو سنوری جوگرافی خۆی جیاوازە لەویتر، بەڵام نەتەوەی کورد کە خاوەنی شۆڕشی میدیاو ئیمپراتۆری میدیایەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٢٧٠٠) ساڵ پێش ئێستاو لەو سەردەمەدا ئیدارەی فراوانترین ناوچەی کردووە، لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئێستاماندا، کەچی خاسیەتی نەتەوەیی خۆی ون نەکردووەو سنورێکی جوگرافی خۆی هەیەو کە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت بەخاکی دەوڵەتێکی داگیرکەر دابنرێت.

ئەگەر سەیر بکەین زۆربەی شۆڕش لەکوردستان گەر لەناوچەیەکدا سەری هەڵدابێت ئەوا شۆڕش لەناوچەکانی تردا دەستی پێ کردووەو یاخود بەلای کەمەوە پشتیوانی خۆیان بۆ دەربڕیووە، وەك شۆڕشی (شێخ مەحموود) لەباشووری کوردستان و شۆڕشی (سمکۆخانی شکاك) لەڕۆژهەڵاتی کوردستان لەیەك کات و سەردەمداو هاوکاری‌و پەیوەندی پتەوی نێوانیان، وە شۆڕشی (قازی محەمەد)و دروست کردنی کۆماری کوردستان لەڕۆژهەڵات و پشتگیری‌و پشتیوانی (بارزانی) لەڕووی مادی‌و مەعنەوییەوە، وەك نوێنەرو پشتیوانی کوردستانی باشوور بۆ کۆماری کوردستانی ڕۆژهەڵات.

هەروەها ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ی کوردستانی باشوور بووە هۆی جوڵەو بووژانەوەی شۆڕشی پارچە داگیرکراوەکانی تری کوردستان، وە هاوکاری کوردەکانی باکورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەکۆڕەوە ملیۆنیەکەی بەهاری (١٩٩١)ی باشووری

کوردستان، ئەم مێژووە درێژە پڕ لەهاوکاریو قوربانی دانە هاوبەشەی گشت پارچەکانی کوردستان بووە هۆی چاندنی ترس و دڵەراوکێیەکی زۆر لەدڵی دوژمنانی نەتەوەی کورددا، ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە نەتەوەی کورد لەگشت جێگایەکی کوردستاندا بەپێی هەل و مەرج پشتیوانی تەواوی یەکتربوون، ناچار دوژمنانیش بۆ هێشتنەوەی دەسەلاتی خۆیان لەم ناوچانەدا سەرەڕای جیاوازی بیروڕاو کێشەی خۆیان هەمیشە چوون یەك بوون لەسەر ئەوەی کە بەهاوبەشی بەرەنگاری بزووتنەوەی رزگاری خوازی نەتەوەی کورد ببینەوە، لەم بارەوەش نموونەمان زۆرە، چەندە شۆڕشمان هەیە ئەوەندە زیاتریش پیلانگێری دوژمنانمان لە ئارادایە، وەك (پەیمانی لۆزان و جەزائیر و کۆبوونەوەکانی دوای راپەڕینی ١٩٩١ (دیمەشق و ئەنقەرەو تاران..) کەواتە هەڵسوکەوت و هاوکاری یەکتری داگیرکەران بۆ ئەوەی بسەلمێنین کە نەتەوەی کورد لەهەر چوار پارچەدا مێژوویەکی هاوبەش و هەستێکی مێژووی هاوبەشیان هەیە، ئاشکرایە کە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست کردنی رۆحی پتەوی نەتەوەییمان و دروست کردنی رۆحی سەربەخۆخوازی نەتەوەییمان.

دەبێت وەك حەقیقەتێکی مێژوویش ئەوە بڵێین سەرەڕای هاتنی تراژیدیای یەك لەدوای یەك بەسەر نەتەوەی کورددا، ئەو گەشبینیو رۆحی شۆڕشگێرییە لەناخی نەتەوەکەماندا وای لەداگیرکەران کردووە کە هیچ کاتێك لەسەرکەوتنی خۆیان دڵنیانەبن و هەمیشە حیسابات و سەرمایەیەکی زۆر بۆ لەناوبردنی رۆحی نەتەوەییمان تەرخان بکەن و خەباتی هاوبەشی مێژووییمان کارێکی وای خوڵقاندووە کە بتوانین تا سەردەمانێکی زۆر دوور هەڵسوڕێنەرو داینەمۆی شۆڕشی ئێستاو ئایندەشمان مسۆگەر بکەین، کەواتە رابردووی نەتەوەییمان چەندە جێی شانازییە زیاد لەوەش دەینەمۆی بۆ هەڵگیرسانەوەی شۆڕشی نوێ لەکاتی شکست دا، مێژووش ئەوەی سەلماندووە کە شۆڕشی کوردی دووچاری شکستی یەکجاری نایەت، بەهۆی ئەو رۆحە هاوبەشە مێژووییەی کە نەتەوەکەمان خاوەنییەتی، بۆ نموونە گەر لەرۆژهەلات شۆڕشی نەتەوەییمان دووچاری کزی بێت ئەوا شۆڕشی باشووری کوردستان دەبێتە مژدە بەخش و یارمەتی دەری شۆڕشی رۆژهەلاتی کوردستان، واتە سەرکەوتن و بەردەوامی شۆڕشی هەر پارچەیەکی کوردستان تەواو کەرو یارمەتی دەری شۆڕشی رزگاریخوازی نەتەوەییمانە لەپارچە داگیرکراوەکانی تر تا گەیشتن بەسەربەخۆیی، وەبوونی شۆڕشی میدیاش لەمێژووماندا جێگەی شانازیو

پشتیوانی مەعنەویمانە بۆ دروست کردن و بنیات نانی (کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادو یەکگرتوو دیموکرات).

بەم لێکدانەوەو شیکردنەوەیەی باری گشتی کۆمەڵگای کوردستان لەڕووی پێکهاتەی جوگرافی‌و ئابووری‌و مێژوویی‌و زمان.. گەیشتینە ئەو بڕوایەی کە خەباتکردن لەپێناو کوردستانێکی سەربەخۆداو بەکردنە ستراتیژی بۆ YNDK کارێکی زۆر واقیعیانەو خەباتگێرانەیەو تائێستاش سەرەڕای ئەو هەموو شکست و کارەساتەی کە بەسەر میللەتی کورددا هاتووە، نەیتوانییوە بڕوابوون بەسەربەخۆیی بکاتە یۆتۆپیا لەفکری نەتەوەییماندا، چونکە کاتێك کارێك دەبێتە خەیاڵ و یۆتۆپیا کە لەکاتی هەنگاونان بەرەو بەواقیعی کردنەوەی تووشی وەستان بێت و بگاتە بن بەست، بەڵام ئاشکرایە لەگەڵ بەرەوی پێشچوونی خەباتی رزگاری نەتەوەیی گەلی کوردستان (ئۆتۆنۆمی- فیدراڵی) گرفتە کۆمەڵایەتی‌و سایکۆلۆژییەکان بەرەو چارەسەر دەڕۆن و راپەڕینە جەماوەرییەکەی ساڵی (١٩٩١) باشترین نموونەیە، چونکە هەل و مەرج و ئالوگۆڕو هەنگاونان بەرەو دابین کردن و سەندنی مافی نەتەوەییمان تا سەربەخۆیی یەکجاری دەبێت لەناوخۆوە دابین بکرێت و بکرێتە ستراتیژی خەباتی هێزە رزگاریخوازەکانی وڵات و پاشان دەتوانرێت پشتیوانی ئازادیخوازانەی جیهانی بۆ دابین بکرێت، کەواتە رێکخستنی جەماوەر لەچوارچێوەی بیری سەربەخۆییدا دەبێت ببێتە زەروورەتێکی حەتمی ئامادەکراو، هەر چ کاتێك هەل و مەرج لەبار بوو دەتوانرێت شۆڕشی سەربەخۆیی سەراپای وڵات رابگەیەندرێت، جا چ لەڕێگەی‌شۆڕشی چەکدارییەوە بێت یاخود لەڕێگەی پەرلەمان و ریفراندۆمی جەماوەرییەوە بێت.

* پێکهاتەی کۆمەڵایەتی: مەبەست لەپێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئاستی بیروڕای سیاسی‌و ئەخلاقی‌و ئاستی مافی مرۆڤ و ئاستی رۆشنبیری‌و ئاینی‌و هونەری‌و ئەدەبی.. کۆمەڵە.

* وتاری (YNDK و دیموکراتیەت)و (سەرخۆبوون تاکە چارەسەرە) لەدووتوێی نامیلکەیەك لەساڵی ١٩٩٧ لەلایەن نووسەرەوە بڵاوکراوەتەوە.

# سیاسەتی بەعەرەب کردن و هەوڵدان بۆ سڕینەوەی بوونی نەتەوەییمان

لەباشووری کوردستاندا سیاسەتی بەعەرەب کردن (تەعریب) لەلایەن داگیرکارانی عێراقەوە، مێژوویەکی دووری هەیەو بەشێوەیەکی بەربلاویش زیاتر لە (٣٠) سی ساڵ دەبێت ئەم پرۆسەیە، دژی بنەماکانی مرۆڤ و سیستەمی دیموکراتییە لەجیهاندا، لەهەمان کاتدا رژێمی بەعسی عێراقی دوای ئەو هەموو ریسواییەی کە لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا رووبەڕووی بۆتەوە لەناوەخۆشدا لەهەموو کاتێك زیاتر بەدەستی ئۆپۆزیسیۆنەوە دەناڵێنێ، لەهەمان کاتدا زۆر دەمارگیرانە لەهەوڵی پێڕەو کردنی ئەم سیاسەتە ناڕەوایە دایە، بەئاشکراش دیارە ئەم کارەشی لەپێناو ئەوەدایە کەبوونی نەتەوەییمان لەباشووری کوردستاندا بسڕێتەوەو دڵنیاییەکی زیاتریش بۆ ئایندەی داگیرکاری خۆی لەباشووری کوردستان بچەسپێنێت، ئەم هەڵسوکەوتانەی رژێمی عێراق زیانێکی زۆر بە ئاسوودەیی‌و پێکەوە ژیانی هەردوو نەتەوەی دراوسێ (کوردو عەرەب) دەگەیەنێت، چونکە ئاشکرایە نەتەوەی کورد دەست بەرداری سنووری راستەقینەی باشووری کوردستان نابێت و بەردەوام لەخەباتی (سیاسی‌و عەسکەری)دا دەبێت بۆ رزگارکردنی کوردستان، لەهەمان کاتدا ئەو عەشایرە عەرەبانەی کە دێنە سەر خاکی باشووری کوردستان، هەمیشە لە دڵە راوکێ‌دان و هەست بە ئاسایش و ئاسوودەیی ناکەن و هەمیشەش وەك داگیرکارو میوانی سەرخاکی کوردستان تەماشا دەکرێن دەرکەوت کردەوە ناڕەواکانی رژێمی عێراق لەرابردوودا نەیانتوانیوە بوونی نەتەوەییمان بسڕنەوەو بێگومان لەئایندەشدا ئەم کارەی بۆ ناچێتە سەر، چونکە شۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان لەناوەخۆو دەرەوەی کوردستاندا بەرەو لوتکەی سەرکەوتن هەنگاو دەنێت، ئەمەش لەسایەی دروستی

سیاسەت و کاری دبلۆماسی پەرلەمان و حکومەتی کوردستان و هەنگاوانی ئەم دوو دەسکەوتە نەتەوەییە (پەرلەمان و حکومەتی کوردستان)، بەرەو ئاوەدان کردنەوەو پێش خستن و زیندوو کردنەوەی بیری کوردایەتی لەدەروونی سەرجەم نەتەوەی کورد.

بەلاّم دیارە حکومەتی عێراقی دەخوازێت کە دوژمنایەتییەکی قووڵ لەدەروونی نەتەوەی کورد و عەرەبدا دروست بکات لەبەرامبەر یەکتریداو لەونێوانەشدا سیاسەتە نارەواکانی خۆی پیادە بکات، کەواتە دەبێت نەتەوەی عەرەب بەگشتیو ئەو خێڵە عەرەبانەی هاتوونەتە سەر خاکی باشووری کوردستان بەتایبەتی ئاگاداری ئەوەبن کە خۆیان نەکەنە سووتەمەنی سیاسەتەکانی بەعسی عێراقی، چونکە ئەو سیاسەتانە خزمەتی هیچ یەك لە نەتەوەی کورد و عەرەب و ئاسایشی ناوچەکە ناکات.

هەروەها هەنگاوێکی تری رژێمی عێراقی بۆ سڕینەوەی بوونی نەتەوەییمان، بەعەرەب کردنی پرۆسەی خوێندنە لەقوتابخانەکانی ژێر دەسەلاّتیدا لەباشووری کوردستان، کە دەیەوێت لەم رێگەیەوەش زمانی نەتەوەییمان لەکەدارو دووچاری سڕینەوەی بکات، چونکە زمان پێکهاتەیەکی گرنگی بوونی هەر نەتەوەیەکە لەجیهاندا هەر نەتەوەیەك زمانی رەسەنی خۆی لەدەست دا ئەوا کارێکی زۆر ئاسانە، کە داگیرکاران بتوانن بۆ هەمیشەیی بوونی بسڕنەوە لەناو نەخشەی ژیانی مرۆڤایەتیدا.

بەلاّم لەم سەردەمەی تەکنۆلۆژیاو خێرایی گەیاندنەدا، ئەستەمە رژێمی عێراقی ئەم کارەی بۆ بچێتە سەر، چونکە لەسایەی حکومەتی کوردستاندا، دەزگاکانی راگەیاندن زیاتر لەدەزگاکانی ژێر دەسەلاّتی رژێم پەرەیان سەندووە، ئەم چالاّك بوونەی راگەیاندنی باشووری کوردستان گشت بوارەکانی (بیستراو، بینراو، نووسراو) دەگرێتەوە، کە ئەمەش بەئاسانی کاریگەری کردۆتە سەر ئەو ناوچانەی هێشتا ئازاد نەکراون، چونکە ئەگەر رۆژنامەو گۆڤارەکانیش بەشێوەیەکی بەربلاّو نەگاتە دەستی جەماوەری ئەو ناوچانە، ئەوا پەخشی چەند کەناڵێکی تەلەفزیۆنیو چەند رادیۆیەکی ژێر سایەی حکومەتی کوردستان دەگەنە ئەو ناوچانەو جەماوەریش زۆر بە خۆشحاڵییەوە گوێ بیستیان دەبن ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی هۆشیاری نەتەوەییمان بەئاستێکی بالاّ بگات و سیاسەتەکانی (تعریب)یش زۆر ساویلکانەو دڕندانە بێنە پێش چاوی جەماوەری کوردستان.

سیاسەتێکی ناڕەوای تری ڕژێم دژ بە گەلانی کوردستان بەگشتیو نەتەوەی کورد بەتایبەتی سیاسەتی قڕکردن و کۆمەڵ کوژییە، ئەم کارە نامرۆڤانەیەش کیمیا باران و ئەنفال و سوتاندنی گوندو شەهید کردنی رۆشنبیرانی نەتەوەکەمانی گرتۆتەوە، دیارە لەروانگەی ڕژێمی عێراقییەوە ئەم سیاسەتانەی دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی نەتەوەکەمان دەستبەرداری خۆی ببێت و ئاسانتر بچێتە خزمەت سیاسەتی گۆڕینی ڕەگەزنامەو راستی خۆی لەدەست بدات، بەڵام دەرکەوت بەرامبەر بەو هەموو شێوازە نامرۆڤانەیەی ڕژێمی عێراقی لەپێناو نەهێشتنی نەتەوەکەماندا، شۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان رۆژ بەرۆژ زیاتر بەهێزتر دەبێت و کردەوەکانی ڕژێمی عێراقیش زیاتر ئەو ڕژێمەی لەکۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیدا ریسوا کردو دۆسیەی ئەو ڕژێمەش لەمێژووی گەلانی عێراق و کوردستاندا زیاتر لەکەدارتر بووە.

کەواتە هەوڵەکانی ڕژێمی عێراقی بۆ لەناو بردنمان بەشێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراوو گشتگیرە، بۆیە دەبێت لەبەرامبەریدا سەرجەم حیزب و لایەنە سیاسییەکانی کوردستان ، رووبەڕووی ببنەوەو بایەخێکی زیاتر بە ڕێکخستنەکانیان بدەن هەوڵ بدەن زیاتر پەرە بەوشیاری نەتەوەییمان بدەن، لەو ناوچانەی کە تائێستا لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقیدا ماوەتەوە، لێرەدا پێویستە بۆ مێژوو بڵێین کە YNDK سەرەڕای ناردنی ئەدەبیاتی خۆی بۆ ئەو ناوچە داگیرکراوانەو ئاگادار بوونی لەرەوشی ناوچەکە بەوردی، هەر لەسەرەتاوەش سەرجەم ئەو گۆڤارە فکریو سیاسیو ئەدەبییانەی حکومەتی کوردستان دەری دەکات و سوودی بۆ وشیاری نەتەوەییمان هەیە گەیاندۆتە دەست ڕێکخستنەکانی خۆی لەو ناوچانە، ئەمەش زیاتر هاوسۆزی ئەو ناوچە داگیرکراوانە بۆلای حکومەت و پەرلەمانی کوردستان رادەکێشێت.

* ئەم وتارە لەژمارە (١)ی گۆڤاری قەرەچووغ- بەهاری ١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.

# با هەموو لایەکمان کار بکەین بۆ دامەزراندنی مەڵبەندێك بۆ بەرگرتن لەسیاسەتی تەعریب

تەعریب یاخود (بەعەرەبکردنی کورد) دیاردەیەکی تاڵی مێژووییە لەمێژووی کوردو کوردستاندا،و هەر سەردەمە لەژێر چەتری سیاسەت و تاکتیك و هزرێکدا خۆی خزاندۆتە نێو ماڵ و هزری کورد، بەلاّم هەموو ڕێگاکانی چۆتەوە سەر ئەوەی کە بوونی کورد لەکوردستاندا بسڕێتەوە، هەر بۆیەش دەبینین دیارەدەی (بەعەرەبکردن) مێژوویەکی زۆر لەوە کۆنتری هەیە، گەر بڵێین (بەعەرەبکردن) لەو کاتەوە لەباشووری کوردستاندا دەستی پێ کردووە کە بەزۆر و بەپێی بڕیارێکی نێو دەوڵەتی ناڕەواو لەپەیماننامەی (لۆزان) دا باشووری ولاّتمان بە عێراقی عەرەبییەوە لکێنرا.. ئیتر لکاندنی مۆرکی عێراقی بە (کورد)ەوە بۆ هەر مەبەستێك بووبێت (جا چ بۆ ڕاگرتنی پارسەنگی شیعەو سوونە بێت لەعێراقدا.. یاخود بۆ سەقامگیر نەبوون و بەردەوامی ئاژاوە بووبێت لەناوچەکەدا بۆ بەرژەوەندی زلهێزەکانی ئەو کاتی جیهان..) کارێکی نامرۆڤانەو زاڵمانە بووە، بەلاّم دیارە لەرووی پێکهاتەی کۆمەلاّیەتیو ئایینیشەوە زەمینەیەکی لەبار هەبووە بۆ ئەوەی کە داگیرکەرانی ئەوکات سوودی لێ وەربگرن و کورد بکەنە (عێراقی یاخود سوری)ی، کەواتە دەتوانین بڵێین کورد وەکو (تورك و فارس) نەبوون کە بەهۆی بوونە ئیسلامیان، ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتیان دروست کرد، کەچی کورد بوونە ئیسلامیبووە هۆی ئەوەی کە زەمینە بۆ داگیرکەران خۆش ببێت کە وردە وردە فکری کوردی (تەعریب) بکەن و دواتریش بە بیانووی ئاینییەوە، ئەم

داگیرکـاره هزرییـه، بـۆ داگیرکـاری خـاك و زمـان و سـڕینەوەی بوونـی نەتـەوەییمان بگوازنـەوە لەسـالآنی بیسـتەکانی سـەدەی بیسـتەمەوە، ئـەم پرۆسـە نامرۆڤانەیـە بەردەوامی هەیەو تاچەند سالێك بەر لەئێستاش لەئاستی نێودەوڵەتیدا بەکێشەیەکی ناوخۆیی عێراق لەقەڵەم دەدراو چاویشی لیّ دەپۆشرا، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە دیاردەی (تەعریب) کۆنترین و سەرتاپاگیرترین دیاردەیە کە دەیان ساڵە وەك کارێکی دزێوو نامرۆڤانە بەرانبـەر نەتەوەکـەمان ئـەنجام دەدرێـت و تـا رۆژانـی ئـەمڕۆشمان لەسەر دەستی هەردوو (داگیرکاری عێراقی و سوری) بەردەوامی هەیە، بەڵام کە ئەمڕۆ لەباشـووری کوردسـتاندا، کـە پەرلـەمان و حکومـەتی کوردسـتان بەشـێکی زۆری باشووری کوردستان بـەڕێوە دەبات، پێویسـتە هـەوڵی ئـەوە بـدات، کـە مەڵبـەندێکی زانستیو فکریو ئەکادیمیانـەی بەرفراوان دابمـەزرێنێت بۆ دیراسـەکردنی پرۆسـەی تەعریب و چۆنیەتی نەخشە دانان بۆ بەرگرتن بەم دیاردە ناشارستانیەو هەوڵدان بـۆ سـڕینەوەی ئـەو ئاسـەوارە خراپانـەی کـە (تـەعریب) لەسـەر شـعوری کـورد دروسـتی کـردووە. کـە تـا رۆژانـی ئـەمڕۆشمان رژێمـی داگیرکـاری عـێراقی لەناوچـەکانی ژێـر دەسـەلآتیدا بەشـێوەیەکی بـەرفراوان و بەبـەرچاوی کۆمـەڵگای نێودەوڵەتیـەوە لـە (کـەرکوك و خانـەقین و مـەخموورو شـنگار..) زۆر دڕندانـەو سـەرگەرمانە خـەریکی جیّبەجیّ کردنی پیلانەکانیەتی.

* ئەم وتارە لەژمارە (٤)ی گۆڤاری سەرخۆبوون– بەهاری ٢٠٠٠ بلاّوکراوەتەوە.

# بەرەو ڕێکخستنێکی پتەو لەڕیزەکانی (YNDK) دا

## بەشی یەکەم

دیارە کە بۆ دروست کردنی ڕێکخستنێکی پتەو دەبێت ئەو حیزبە یاخود ئەو ڕێکخراوە، خاوەنی بیرێکی ئەوتۆ بێت کە لەگەڵ ئاستی بەرەوپێش چوونی کۆمەڵگادا بگونجێت و خاوەنی چەند خاسیەت و چەمکێك بێت کە ببێتە هۆی گرێدانی جەماوەر بەڕێکخراوە سیاسییەکەوە، واتە حیزب یاخود ڕێکخراو گەربیەوێت گەشە بکات و نەمرێت، دەبێت هەڵقولاوی گرفتە ئابووریو سیاسیو کۆمەلایەتیو فەرهەنگیو.. تد کۆمەڵگا بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بەوردی کێشەکان شیتەڵ بکات و هەستی جەماوەر بۆ لای خۆی کێش بکات، چونکە ئاشکرایە هەر کاتێك حیزب نەیتوانی هەستی جەماوەر رابکێشێت ئەوا ئەو کاتە شڵەژانی فکریو ئیداری باڵ بەسەر سەرجەم دەزگاکانی حیزبدا دەکێشێت و بەرەو لێوارەکانی سستیو پاشان بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێت.

بائێمەش لەم ڕوانگەیەی سەرەوە سەیرێکی YNDK بکەین، بزانین ئایا YNDK دەتوانێت ببێتە خاوەن ڕێکخستنێکی پتەوو پایەیەکی بەهێز بۆ بەرەو پێش چوونی نەتەوەی کورد لەبوارە جیاجیاکانی ژیاندا، ئاشکراشە کە YNDK هەڵقولاوی ئەو بەرەوپێش چوونەیە کە نەتەوەی کورد لەباشووری کوردستاندا، لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ وە بەخۆیەوە بینیووە، کەواتە YNDKش، چونکە هەڵقولاوی ڕەوشێکی دیموکراتە دەتوانێت وشیارانە مامەڵە لەگەڵ ئەو دیموکراتیەتە بکات و لەپێناو دامەزراندنی بناغەیەکی پتەو بۆ وشیاری نەتەوەییمان سیستمی کارەکانی دابڕێژێت، YNDKش لەئەنجامی تێڕوانینێکی وردی بۆ هەر سێ زەمەنی (ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو) سیستەمی کاری خۆی دیاری کردووە، تاوەکو گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە جگە لەبیری نەتەوەییو شۆڕشی ڕزگاری نەتەوەییمان هیچ بیرو ئایدولۆژیایەکی (هێنراو) خزمەت بە نەتەوە زوڵم لێکراوەکەمان ناکات و ناتوانێت ڕەوتی گەشەی

کۆمەڵگای کوردەواریمان بەرەوپێشەوە بەرێت، لەبەر ئەوە YNDK هەمیشە خۆی بە بەرپرسیار زانیووە بەرانبەر بە ئەو رووداوانەی کە لەکۆمەڵگای کوردییدا رووی داوەو زۆر لێهاتوانەش هەڵوێستی شۆڕشگێرانەی خۆی بەرانبەر بەداگیرکەرانی کوردستان و هەڵگیرسێنەرانی شەڕی ناوخۆ دەربڕیووەو پشتگیریو پشتیوانی خۆی بۆ پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان دەربڕیووە.

کەواتە دەبێت چەند خاڵێکی بنەڕەتی هەبێت کە دەبێتە بناغە بۆ دروست کردن و بنیاتنانی رێکخستنێکی پتەوو جەماوەریی لەکات و زەمانی ئێستاو داهاتوودا، کە لێرەدا هەوڵ دەدەین بیانخەینە روو:

## ١-کۆمەڵ سەرچاوەی بیرورای بێت:

دیارە YNDK لەبارودۆخێکدا هاتۆتە مەیدان کە نەتەوەی کوردمان دووچاری رەشترین و ناخۆشترین رەوش بووە، کە ئەویش هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆیە، هەر لەسەرەتادا YNDK پێی وابووە کە دەبێ (پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی) بەگفتوگۆ چارەسەری کێشەکانی خۆیان بکەن، بەلأم پاش هەوڵێکی زۆر کەهیچ ئاکامێکی نەبوو، شەڕیش هەر بەردەوام بوو، دەستی داگیرکەرانی کوردستان راکێشرایە سەر خاکی کوردستان و بەهاوکاری داگیرکەران جەولەکانی شەڕ تابێت گەرمتر دەبوو YNDKش دراسەیەکی وردی شەڕی ناوخۆی کوردستانی کردوو، بەرەسمی لایەنی شەڕخوازی دەست نیشان کرد، ئەویش (YNK) بوو کە شەڕی هەڵگیرساندووەو هیوادارین لەداهاتوودا عەقڵی گفتوگۆو دانوستان ببێتە رێگە چارە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانمان.

کەواتە YNDK لەئەنجامی زەروورەتێکی سیاسی- کۆمەلأیەتی هاتۆتە مەیدان و دەتوانێت لەگەڵ هەموو گۆرانکارییەکدا خەباتی خۆی پەرەپێبدات، واتە سەرهەڵدانی YNDK لەکاتێکدا بووە کە نەتەوەی کورد دەیپرسی (شەڕ بەرەو کوێمان دەبات؟!) کاتێك شۆڕشگێرانی سەردەمی شاخ کە هاتبوونەوە شارەکان شەڕیان بەدژی خەباتی رابردووی خۆیان دەکرد، لەو کاتەدا هەوڵمان دا جەماوەر بگاتە بڕوایەکی ئەوتۆ کەبیری نەتەوەیی خاوەن بنەمایەکی ئەوتۆیە کە دەتوانێت چارەسەری رەوشی نالەباری کوردستان بکات، بەپشت گوێ خستنی بیری نەتەوەیی کورد، کەبیری سەرجەم ولأتپارێزانی کوردستانە، کۆمەڵگای کوردی بەرەو نەمان دەچێت و راستیەکان لەچاو ون دەبن.

شایەنی باسە کە YNDK ئاگاداری رەوشی مێژووی نەتەوەی کورد بووە، کەبیری نەتەوەیی جولێنەری هەستی خەڵکی کوردستان بووە لەگشت شۆڕش و راپەڕینەکانی کوردستاندا، بیری نەتەوەیی لەکۆمەڵگای کوردیدا بۆتە هۆی زیاتر پتەو کردنی پەیوەندی لەنێوان تاکەکانی کورد، هەر لەبەر ئەوەش بووە کە چەندین ساڵە زوڵمی داگیرکەران نەیتوانیوە بوونی نەتەوەییمان بسڕێتەوە، کەواتە لەکۆمەڵگای کوردیدا پەیوەندییە ئابووری‌و ئایینی‌و چینایەتی‌یەکان، نەیان توانیووە جێگەی پەیوەندی نەتەوەیی بگرنەوە لەدروست کردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی- سیاسی لەناو خەڵکی کوردستاندا، هەر لەبەر ئەو راستیانەش بیری نەتەوەیی بۆتە سەرچاوەی فکری YNDK.

## ٢-هەوڵی زەمینە خۆش کردنی بدات بۆ بەرەو پێش چوونی کۆمەڵ:

ئاشکرایە کە (بەرەو پێش چوون) چەندین بواری فراوانی لەخۆ گرتووە، هەر لەبەرەوپێش چوونی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فکری.. تد، بەڵام کەسی کوردی ناتوانێت لەگشت بوارەکاندا ئەزموونی خۆی بخاتە گەڕ، تاوەکو کوردستانێکی سەربەخۆو ئازاد نەیەتەدی (هەرچەندە لەڕوانگەی YNDKوە فیدرالیزم و حکومەتی هەرێم بەهەنگاوێك دادەنرێت بۆ سەربەخۆی کوردستان)، ئەو رەوشەی کە حکومەتی باشووری کوردستان دروستی کردووە، سەرجەم خەڵکی کوردستان دەتوانن خزمەتی رەوتی خەباتی رزگاری نەتەوەییمان بکەن لەگشت بوارەکاندا، بەڵگە نەویستیشە کە (بەرەو پێش چوون) لەکاتێکدا دێتەدی کە گیانی دیموکراسی‌و لێك گەیشتن جێگەی شەڕو توندو تیژی بگرێتەوە، هەر بۆیە YNDK لەهەوڵی بەردەوام دایە کە ئاستی فکری کۆمەڵ بگاتە ئەو رادەیەی کە بتوانێت خاوەن بیر کردنەوەیەکی ئەوتۆ بێت تا لەناوخۆدا دیموکراتیەت بنیات بنرێت و هەر لەسەر ئەم بنەمایەش سیستەمی کارەکانی لەدەرەوە رێك بخات، بەڵام لەکاتێکدا کە داگیرکەرانی یاخود خیانەتکارانی ناوخۆ هەوڵی شێواندنی کۆمەڵگای کوردی‌و تێکدانی ئەزموونە دیموکراتیەکەی باشوور بدەن، لەم کاتانەدا جەماوەر دەبێت توندو تیژی شۆڕشگێرانەو زوڵم و زۆری داگیرکەران لەیەك جیا بکاتەوە.

کەواتە YNDK لەهەوڵی ئەوەدایە کە ئاستی فکری‌و بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگای کوردی ببێتە بناغەی بەرپابوونی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی لەدژی دەسەڵاتە سەرکوت کەرو خیانەتکارەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی، ئاشکراشە بۆ ئەوەی هەموو گۆرانێك بە (پێشکەوتن) لەقەڵەم نەدرێت و خەڵکی پێ چاو بەست نەکرێت. YNDK

بەپێی خاسیەت و سیفاتی نەتەوەییانە سەیری گشت ڕووداوەکان دەکات و لەگەڵ بەرژەوەندی نەتەوەییمان بەرانبەر ڕایدەگرێت و شیتەڵ و کاریگەری ئەو ڕووداوە بۆ وڵاتپارێزان و نەتەوە پەروەرانی کوردستان ڕوون دەکاتەوە واتە (پێشوە چوون) لەڕوانگەی YNDKوە ئەوەیە کە ئەو گۆڕانکارییە تاچەند لەخزمەت کێشەی نەتەوەییو جەماوەری بوونی بیری نەتەوەیی دایە، کەواتە YNDK ناتوانێت بەگشت گۆڕانەکانی کۆمەڵگا بڵێت (پێشوە چوون).

## ٣-بوونی سەرکردایەتیو جەماوەر:

جەماوەر لەکاتێکدا شوێن سەرکردایەتییەك، یاخود ڕێکخستنێکی سیاسی دەکەوێت کە بزانێت سەرکردایەتییەکەی لەپێش ئەودا هەست بەگرفتەکان دەکات و لەهەمان کاتدا جەماوەر بەشکڵێکی زانستیانە ڕێك دەخات، بە لەبەر چاو گرتنی کات و شوێنی خەبات و تێکۆشان جەماوەر ڕووەو دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو ئاراستە دەکات،و دەبێت سەرکردایەتی لەتوانایدا هەبێت کەسە پەرش و بڵاوەکانی کۆمەڵ لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە ئەویش بەشێوازی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ، چونکە دەکرێت لەئەنجامی بەرەوپێش چوون و فراوان بوونی ڕیزەکانمان بتوانین بەسەر داگیرکەراندا سەرکەوتن بەدەست بێنین، بەڵام خۆ مەرج نییە گرفتە کۆمەڵایەتیو ئابووریو فەرهەنگییەکانمان کۆتایی پێ بێت، کەواتە دەتوانین بڵێین جەماوەر کاتێك شوێن سەرکردایەتییەك دەکەوێت، کە بزانێت ئەو سەرکردایەتییە لەتوانایدا هەیە لەهەموو کات و شوێنێکدا گرفتەکانی جەماوەر لەئامێز بگرێت و چارەسەریشیان بکات، بەڵام ئاشکراشە کە هەندێك جار گرفتێکی گەورە دووچاری ڕێکخراوە نەتەوەییەکان دەبێتەوە لەکۆمەڵگای کوردیدا، ئەویش ئەوەیە کە بەهۆی لاوازی ئاستی بیر کردنەوەو فراوانی ڕاگەیاندنی چەواشەکارانە، جەماوەر دڵسۆزانی نەتەوەییو خیانەتکارانی نەتەوەیی تێکەڵ بەیەکتر کردووە، ئەم کارەش بۆتە هۆی ئەوەی کە گرفتە ناوخۆییەکان و شەڕی ناوخۆ تائێستا بەردەوام بێت کەواتە گرفتەکان بەتەنها بەگوتاری (الخطاب)ی سەرکردەکان چارەسەر ناکرێت، تاوەکو جەماوەریش نەگاتە ئەو ڕادەیەی گوتاری نەتەوەییانەو غەیری نەتەوەییانە لەیەك جیا بکاتەوە، یاخود ئاستی بیر کردنەوەی نەگاتە ئەو ڕادەیەی کە لەناوەڕۆکی گوتار (خطاب)ی سەرکردەکانەوە بەرژەوەندی باڵای نەتەوەییمان درك پێ بکات، بەڵام سەرکردایەتیش نابێت وابزانێت کاری ئەو تەنها پەخش کردنی گوتارە بۆ جەماوەرو کارو ئەرکی جەماوەریش تەنیا گوێ گرتنە لەسەرکردایەتی، چونکە لەم کاتەدا لێك

دابڕان دروست دەبێت لەنێوان حیزب و جەماوەردا، وە YNDKش دەبێت هەوڵی دروست کردن و پەیووەست کردنی بیری سەرکردایەتییەکەی بدات بەبیری ولاتپارێزانی نەتەوەکەمان، واتە لەپێناو بەرەوپێش چوونی کێشەی نەتەوەییمان دەبێت کە نەتەوەپەروەران بە YNDK، وابەستە بکەینەوە، کەواتە YNDK وابەستە بوونی خۆی بەجەماوەری ولاتپارێز بەیەکێك لەبنەما نەگۆڕو ستراتیژییەکانی دەزانین، کە بەهیچ شێوەیەك رێگەی نادرێت دووچاری دابڕان بێت، واتە دەتوانین شێوازی رێکخستنی YNDKو بیری سەرکردایەتی YNDK بەم شێوەیە بناسین، کە هەستان بەم شێوازە لەرێکخستن پەرەپێدانە بەکارێکی جەماوەری رێکخراو، واتە دەربڕی خواست و ئیرادەی جەماوەری سەربەخۆ خوازە بەشێوەیەکی رێکخراو (منظم)و ئاراستە کردنی ئەو جەماوەرە بەرەو پێکهێنانی لەشکری جەماوەری سەربەخۆ خواز بەرەو بەحەقیقەت کردن و بەواقیعی کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی کوردی.

بۆ زیاتر ناسین و دەرخستنی گرنگی ئەو پەیووەندییەی کە لەنێوان جەماوەرو سەرکردایەتیدا دەبێت هەبێت، دەتوانین بڵێین کە سەرکردایەتی دیموکراتیخواز، دەبێت خاوەن ئیرادەیەکی ئەوتۆ بێت کە لەکاتی گیرۆدەی جەماوەردا بەگرفتێکی کۆمەلایەتی یاخود سیاسی- ئابووری.. تد بتوانێت بەرەنگاری هێزە خراپەکان ببێتەوەو کاریگەری ئەو رووداوانەش لەدەروونی جەماوەردا بسڕێتەوە، بەلام لێرەدا مەبەست بەخەیاڵ (یۆتۆپی) کردنی عەقلی سەرکردایەتی نییە، تاوەکو جەماوەر یاخود رێکخستنەکانی YNDK بگەیەنینە ئەو قەناعەتەی کە سەرکردایەتی قودسییەتی تایبەتی هەیە، بەڵکو مەبەستمان لەناو گشت گروپ و رێکخراو حیزبێکی سیاسیدا کە بیەوێت بەڕاستی لەخزمەتی بەرژەوەندی نەتەوەیی دابێت.

## ٤-بوونی ئەندامی چالاك و جەماوەری:

دەتوانین بڵێین ئەندامی چالاك دەبێتە ئاوێنەی سەرکردایەتیو رێکخراوە سیاسییەکەی لەناو جەماوەردا، هەر لەم روانگەیەوە، دەتوانرێت پێشکەوتنی فراوان و پراکتێکی سیاسەتی حیزب یاخود رێکخراوەکە بێتەدی لەناو ولاتپارێزانی کوردستاندا، کەواتە بەئەندام بوونی جەماوەر لەناو رێکخراوێکی سیاسی نەتەوەییدا شێوازێکی گونجاوە لەکۆمەڵگای چەوساوەی کوردیداو دەبێت هەندێك بیرو بۆچوونی نەتەوەیی ئەندامەکان وابەستە بکاتەوە بەرێکخراوەکەوە، بۆ ئەوەی شێوازی وابەستەی پەیوەست بوونی کەسانی نەتەوەیی بە YNDK وە جودا بێت لەپەیووەست بوونی کەسانی جیا لەفکری نەتەوەیی بەرێکخراوو حیزبە

نانەتەوەییەکان (غیر القومی)ی تر، بۆ نموونە ئەگەر مارکسییەکان و کۆمۆنیستەکان جوڵێنەرو داینەمۆی بزوتنەوەکانیان لەسەر شانی (پرولیتاریا) یەو رزگاری کۆمەڵگا بەسەرکەوتنی پرولیتاریا دەزانن و هەروەها بزوتنەوە ئایینیو مەزهەبیەکانیش، جوڵێنەرو هێزی ئەوان لەهێزێکی غەیبییەوە سەرچاوە دەگرێت، بەشێوەیەکی روونتر دەتوانین بڵێین کە کۆمۆنیستەکان کۆمەڵگا دەکەنە دوو بەش (پرولیتاریاو بورژوازیەت)و بزوتنەوە ئاینییەکانیش بەهەمان شێوە کۆمەڵگا دەکەنە دوو بەش (دینداروبێ دین)، ئەمە ستراتیژی ئەم دوو رەوتەیە لەکوردستان و دنیادا، بەڵام بابزانین لەبەرانبەر ئەو دوو بیرو ئایدولۆژیایەی کە لەکۆمەڵگای کوردیدا بڵاوە، بزوتنەوەی نەتەوەی کورد بەگشتیو YNDK بەتایبەتی دەبێت خاوەنی چ بیرو تێروانینێك بێت بۆ رزگاری نەتەوەییمان، کە چەوسانەوەی نەتەوەیی سەرچاوەی گشت نەهامەتییەکانی گەلی کوردستان بووە، ئێمەش بۆ ئەوەی رزگارمان بێت لەچەوسانەوەی نەتەوەییو نەتەوەی کوردیش خاوەنی بیرو بۆچوونی خۆی بێت، دەبێت لەقوناغی ئێستاماندا هەست بەوە بکەین کە واقیعێك لەکۆمەلگای ئێمەدا هەیە ئەویش ئەوەیە کە دانیشتوانی کوردستان دابەش دەکاتەوە سەر دوو رەوت، ئەو دوو رەوتەش لەڕوانگەی YNDKوەو لەپێناو بەرژەوەندی باڵای نەتەوەییمان و وەك واقیعێکی چەسپاو بریتیە لە (نەتەوەییەکان و غەیرە نەتەوەییەکان)، ئەمەش بۆیە هاتۆتە ئاراوە کە لەکوردستاندا ئایدولۆژیای جیاواز هەیە، کەواتە ململانێش دەبێت، ئاشکراشە کە هەر ململانێی دیموکراتیانەو بیرو راگۆڕینەوە کۆمەڵگای کوردی لەو سەرگەردانیە رزگار دەکات و بەئامانجێکی باشی دەگەیەنێت، چونکە ئەگەر بەم شێوازە لەکارەکانماندا بیر نەکەینەوە ناتوانین بەرەنگاری دوژمنانی ناوخۆو دەرەوە ببینەوە، لێرەشدا بەپێی ئەم دابەشکردنە مەبەستمان ئەوە نییە کە ململانێیە ناوخۆییەکان گرژ ببنەوە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو ململانێیانە رێچکەیەکی شارستانیانە بگرێتە بەر، تاوەکو لەخزمەت بەرەو پێش چوونی بیرۆی نەتەوەییماندا بێت و بتوانین بەئاشکرا بانگەوازی بیری نەتەوەییمان رابگەیەنین و سەرجەم نەتەوە پەروەران، کە زۆربەی خەڵکی کوردستان پێك دێنن لەدەوری YNDK کۆبکەینەوە، بەم شێوەیە دەتوانین رێکخستنێکی پتەو کە لەخزمەتی رەوتی نەتەوەییماندا بێت لەسەر بنەمای کەسانی (نەتەوەیی- غەیرە نەتەوەیی) دابمەزرێنین، واتە YNDK دەبێتە جێگەی حەسانەوەو ئۆقرە گرتنی وڵاتپارێزان و دڵسۆزانی نەتەوەکەمان، لێرەدا پێویستە ئاماژە بە بۆچوونێکی گرنگ بکەین، کە مەبەست لەزاراوە یاخود هاوکێشەی

(نەتەوەیی‌و غەیرە نەتەوەیی)، جیاوازی زمان و کلتور نی‌یە لەنێوان نەتەوەی کوردو کەمایەتییەکانی تر کە لەکوردستاندا دەژین، چونکە ئەو جیاوازی زمان و کلتورە ئاشکراو روونە، بەڵکو زیاتر مەبەستمان لەخەمخۆرانی‌بیری نەتەوەیی‌و کەسانی جیاوازی بیری نەتەوەیی‌یە، واتە مەرج نی‌یە کە کەسانی (غەیرە نەتەوەیی) دژ بەئامانجە نەتەوەییەکان بن بەشێوەیەکی راستەوخۆ، بەڵکو ئامانجە نەتەوەییەکان بەکارێکی لاوەکی دادەنێن و هەوڵی بەدیهێنانی نادەن، بەلام لەتێڕوانینی YNDK هێنانەدی ئامانجە نەتەوەییەکان ستراتیژێکی نەگۆڕە لەئێستاو داهاتووشدا.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە، کە ئایا بیری نەتەوەیی‌و نا نەتەوەیی کامیان پێشتر هاتنە بوون؟!

ئاشکرایە کە هەست کردن بەپەیدابوونی بیری‌نانەتەوەیی لەسەردەمانێکی زۆر کۆنەوە لەئارادا بووە لەچوارچێوەی جۆرەها فیکری (مادي و مثالي)دا خۆی پیشان داوەو لەئەوروپاش لەگەڵ سەرهەڵدانی بیری بورژوازی، بیری نەتەوەیش سەری هەڵداوە، بەلام لەکاتێکدا بیری نەتەوەیی لەکوردستاندا سەری هەڵداوە کەهێشتا کورد لەسەردەمی دەرەبەگایەتیدا بووە، نەك بورژوازییەت (لەم بارەوەش بەڵگەی زۆر لەبەر دەستدایە)، کەواتە بیرو بۆچوونێکی هەڵەیە کە بیری نەتەوەیی کورد وابەستە بکرێتە وە بەقۆناغی سەرهەڵدانی بورژوازییەت لەکوردستاندا، لەکاتێکدا گەر سەیر بکەین تائێستا لەکوردستان پاشماوەی دەرەبەگی لەهەندێك ناوچەدا بەئاسانی هەست پێ دەکرێت، بەلام دەیان ساڵە شۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان بەردەوامە.

کەواتە بیری نەتەوەیی کۆنترین بیرە لەکوردستاندا، وەك تاکە ئەلتەرناتیڤ (بدیل)یك وایە بۆ گشت بیرو بۆچوونەکانی تر، چونکە هەڵقولاوی دەروونی کۆمەڵگای کوردی‌یە، خەڵکانی رۆشنبیرو بەئاگا لەگرفتەکانی نەتەوەی کورد، پەنایان بردۆتە بەر گەشەپێدانی بیری نەتەوەیی لەناو جەماوەردا.

ئاشکراشە کە هەر لەڕوانگەی بیری YNDKوە، رۆشنبیرانیش دەبنە دوو پارچە: یەکەمیان رۆشنبیرانی وابەستە بەبیری نەتەوەیی‌و گرفتە کۆمەلایەتییەکانی نەتەوەیی کورد لەپێناو دۆزینەوەی رێگە چارەی رزگار بوون، دووەمیان: رۆشنبیرانی وابەستە بەبیری داگیرکەران، کە لەخزمەت بیرو ئایدلۆژیایەکدان، کە خزمەت بەکێشەی رەوای نەتەوەییمان ناکات، بەلام لێرەشدا مەبەستمان لەوە نییە کە ئەم ململانێیە تەنها لەنێو رۆشنبیراندایە، بەڵکو مادام بیری نەتەوەیی لەهەموو شوێنێکی کوردستاندا لەناو گشت چین و توێژێکدا کەسانی خۆی هەیە، ئاشکراشە لەبەرانبەر ئەو بیرەدا کەسانی

تاریك بین و ئایدولۆژیاو بیری نانەتەوەیی پەرست پەیدا دەبن، کەواتە لەکوردستاندا ڕەوشێکی وەها خولقاوە کە هیچ کەسێك سەر بەهەر چین و توێژێك بێت ناتوانێت لەدەرەوەی ئەو هاوکێشەیە دابێت کە پێشتر باسمان کرد، واتە (هاوکێشەی بیری نەتەوەییو غەیرە نەتەوەیی یاخود نانەتەوەیی). ئاشکراشە کە تەنها کەسانی نەتەوەییو حیزب و لایەنە نەتەوەییەکان بەتووندی لەپشت سەربەخۆبوونی کوردستانەوەن و پشتگیری لەبنیات نانی دەوڵەتی کوردی دەکەن، وە لەبەر ئەوەی سەربەخۆبوونیش بۆتە پێویستیەکی کۆمەڵایەتی- سیاسیو باو لەکۆمەڵگای کوردیداو پشتیوانیەکی فراوانی لەناو جەماوەردا بەدەست هێناوە، بۆیە بەناچاری بۆ مەبەستی تایبەتی بیرو ئایدولۆژیاکانی تریش جار بەجار باس لەدەوڵەت و سەربەخۆی کوردستان دەکەن، بەڵام دیارە کە ئەو لایەنە نانەتەوەییانە هەر دەیانەوێت لەچوارچێوەی دەوڵەتی کوردیدا ئایدولۆژیاو بیرێکی نانەتەوەییانە پراکتیك بکەن، کە هیچ خزمەت بەزمان و کلتوورو ئاسایشی نەتەوەییمان ناکات، کەواتە تەنها ڕێکخراوە نەتەوەییەکان دەتوانن لەخزمەتی ڕەوشە کۆمەڵایەتیو بەرژەوەندییە ئابووریو سیاسییەکانی نەتەوەی کورددا بن.

لایەنێکی تری گرنگ کە دەبێت لەکەسانی نەتەوەیی بەگشتیو ئەندامانی YNDKدا بەدی بکرێت و جودابێت لەکەسانی (غەیرە نەتەوەیی)، ئەویش چۆنیەتی (کەسایەتی)یە الشخصیە-، کە ئەویش لایەنێکی گرنگی کۆمەڵایەتییە کە دەتوانرێت کەسانی نەتەوەیی پێ بناسرێتەوە، کەواتە باسەرەتا سەرخەتێك لەسەر کەسایەتیو چۆنییەتی دروست بوونی باس بکەین، دەتوانین بڵێین کە (کەسایەتی) بریتیە لەهەڵسوکەوت و خورەوشتی مرۆڤ لەکۆمەڵداو کاریگەری بڕیارەکانی تاك لەبەرانبەر هەر ڕووداو گرفتێکدا کە کۆمەڵگا دووچاری دەبێتەوە، ئاشکراشە کە دیاردە کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئاینیو.. تد کۆمەڵگا، کاریگەری تەواویان دەبێت لەسەر سایکۆلۆژیەت و ئاستی فکری تاك لەناو کۆمەڵدا، کە ئایا تاکێکی سوودبەخش یاخود شەرەنگێز دێتە بەرهەم؟!

گەر لەو ڕوانگەی سەرەوە سەیرێکی کەسایەتی کوردی بکەین، دەبینین کە مرۆڤی کورد لەئەنجامی جۆرەها سەرکوت و چەوسانەوە بەدەستی داگیرکەرانی کوردستان دووچاری ڕەشبینیەکی تەواوو کەسایەتییەکی شێواو بۆتەوە، تارادەیەکی وەها کە لەئاست ڕووداوەکانی کۆمەڵگای کوردیدا خۆی بەبێ دەسەڵات دێتە پێش چاو، لەم ساڵانەی دوایشدا شەڕی ناوخۆی کوردستان زیاتر بۆتە هۆی داڕمان و کەرتکردنی

کەسایەتی کوردی، دیارە گەر پێشتر کەسایەتی کوردی لەسەر دەستی داگیرکەران شێوێندرا بوو، (کە تائێستاش لەباکوورو رۆژهەلاّت و رۆژئاوای کوردستاندا بەردەوامە)، بەلاّم لەباشووری کوردستاندا شەڕی ناوخۆ کەسایەتی کوردی زیاتر بەرەو دارمان بردووەو تائێستاش نەمان توانیووە ئاسەوارو جێ دەست رژێمی عێراقی لەسەر کەسایەتی کوردیدا بسڕینەوە، راستیەکی تریش هەیە کە دەوڵەتانی داگیرکەری دراوسێ‌و حکومەتی عێراقی هەر چەندە لەدەرەوەی سنووری حکومەتی باشووری کوردستانن بەلاّم لەهەوڵی ئەوە دان کە سایکۆلۆژییەتی مرۆڤی کورد زیاتر بەرەو لاوازی بەرن و هەر بەدارماوی‌و سەر لێ شێواوی بمێنێتەوە.

کەواتە لەناو ئەو زەلکاوەی کە مرۆڤی کوردی تێکەوتووە، کە چەندین ساڵە داگیرکەران و خیانەتکاران هەوڵ دەدەن کەسایەتی کوردی تیادا بکوژن، دەبێت کەسانی نەتەوەیی بەفکرو ئایدولۆژیایەکی شۆڕشگێرانە رووبەڕووی ببنەوە، بەلاّم لێرەدا ئەرکی کەسانی نەتەوەیی گەلێك قورسترو فراوان تر دەبێت، لەلایەکەوە دەبێت نەیەڵن کە چیتر راگەیاندن و ئیدعاو بیری داگیرکاری، کاریگەری بکاتە سەر مرۆڤی کوردو لەلایەکی تریشەوە، هەوڵی سڕینەوەی ئەو ئاسەوارانەش بدەن کە داگیرکەران و خیانەتکاران لەمێشکی مرۆڤی کورددا چەسپاندوویانەو بەهۆیەوە دەتوانن زیاتر جێ پێ خۆیان لەکوردستاندا قایم بکەن، کەواتە دەبێت ئێمە وەك (YNDK) هەمیشە ئاسۆو ستراتیژی دوارۆژمان کە (کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادو یەکگرتوو دیموکرات)ە لەبەرچاو بێت و هەر چ بەرەو پێش چوونێکی حکومەتی باشووریش هەیە وەك بناغەیەکی پتەو سەیر بکەین بۆ خزمەت ستراتیژی نەتەوەییمان، کە دامەزراندنی (دەوڵەتی نەتەوەیی کوردییە)، کەواتە ئەگەر مرۆڤی کورد خاوەن کەسایەتی خۆی نەبێت، کە ئەو کەسایەتیەش هەڵقوڵاوی خورەوشتی کوردانەی پێشکەوتنخوازو بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانمان نەبێت، ناتوانێت پارێزگاری لەئاسایشی نەتەوەییمان بکات، دیارە کە ئەو کەسایەتیش دەبێت پارێزگاری کردن لەخاك و زمان و کلتوورو ئابووری‌و بەرژەوەندی سیاسی کورد لەسەرو هەموو بەرژەوەندییەکی ترەوە دابنێت، ئەگەر بەم شێوەیە لەکار کردندا بەردەوام نەبین، ئەستەمە بتوانین رووبەڕووی ئەو هەموو گرفت و شکستانەی کۆمەڵگای کوردی ببینەوە، کە لەرابردوودا دووچاری بووین ئەگەر خۆشمان رێك نەخەین، ئەوا لەداهاتوویشدا دووچاری کارەساتی خراپتر دەبین، کەواتە دەتوانین بڵێین، مادام کورد نەتەوەیەکی بن دەستە، دەبێت لەرێگای گۆڕانکارییەکی ریشەیی‌و چڕو پڕەوە بکرێتە

نەتەوەیــەکی سەردەســت و ئــازاد، دیــارە کــە ئــەم گۆڕانــەش لەســـەرەتادا دەبێــت سەرلەنوێ بونیادی کەسایەتی کوردی بۆ ئامادە بکرێت، تاوەکو بتوانرێت لەگەڵ هەر گۆڕان و پێشوە چوونێکدا ئامادەی خۆگونجان و ڕۆیشتن لەهاوشانی ئەو بەرەو پێش چوونە لەکەسایەتی کوردیدا بەرجەستە ببێت.

# بەشی دووەم:

لەبــەر ئــەوەی YNDK خــاوەن بــیرێکی جەماوەری‌یــەو بــەگیانێکی نەتەوەییانــە هەڵسوکەوت لەگەڵ دەستکەوتەکانی جەماوەر دەکات و بایەخ بەگشت ئـەو بوارانـە دەدات کە کاریگەری بـاش و خـراپ دەکاتـە سـەر لایـەنی سـایکۆلۆژی‌و پـەروەردەو کۆمەڵایەتی‌و ئابووری..

مرۆڤی کورد، ئاشکراشە کەدەبێت بەچاوێکی فراوان و پڕ بایەخ سەیری ئاستی ڕۆشنبیری‌و وزەی ئامادە بۆ کارکردن بکات لەناو جەماوەردا، هەر لەم ڕوانگەیـەوە YNDK بۆ ئەوەی بتوانێت زیاتر لەخزمەتی بیری نەتـەوەییماندا بێت و زیـاتر پـەرە بەوشیاری نەتـەوەیی بدات لـەناو جـەماوەردا، دوو ڕێگـەی سـەرەکی دەگرێتەبـەر بـۆ کۆکردنەوەی جەماوەری ولاتپارێز لەدەوری خۆیدا، ئەویش:

یەکەم: ڕێکخستنێکی ڕاستەوخۆ سەر بە YNDK (ڕێکخستنی حیزبە):

دووەم: ڕێکخستنی جەماوەری:

## یەکەم:ڕێکخستنێکی ڕاستەوخۆ سەر بە YNDK ڕێکخستنی حیزبە-:

ئاستی ڕۆشنبیری تاکەکانی کۆمەڵ و چۆنییەتی بیر کردنەوەیان هەموو وەك یەکو لەیەك ئاستدا نی‌یە، لەبەر ئەوەیە کە ئەو کەسانەی بایـەخ و گرنگی بەرنامـەو پێڕەو ستراتیژی YNDK بەباشی تێدەگەن، هەوڵ دەدەن لەناو کەسایەتی خۆیان و بەرانبەر بەکۆمەڵگاش پراکتیکی بکەن، دەتوانن لەناو ڕێزەکانی YNDKدا خۆیان ڕێك بخەن، دیارە کە ئەم خۆ ڕێکخستنەش چەند سیفاتێکی بنەڕەتی هەیە تاوەکو بتوانین ئاستی بەرەو پێش چوون لـەناو هەڤـەلاندا هەست پـێ بکـەن، یـەك لەوانـە بوونـی دەسـەڵاتە (وجود السلطة) لـەناو حیزبدا، کە بنـەمای ڕاگرتنـی حـیزب و ئیـدارە کردنـی گشـت گرفتەکانـە، تادەگەینـە چارەسـەری بنـەڕەتی سـەرجەم ئـەو گرفتـە ناوخۆییانـەی کـە بەئاگایی‌و لێزانانە دەخزێنرێتە ناو ریزەکانی حیزب یاخود بە نائاگایی (لاشعور) ئەو

گرفتانە دروست دەبن، کەواتە لەبەر ئەوەی YNDK ڕێکخراوێکی (سیاسی-کۆمەڵایەتییە)، بوونی دەسەڵات بەو مانایە نییە کە تەنیا بڕیار دەربێت بێ گوێدان بەواقیعی کۆمەڵایەتی ئەندامانی دەوروپشتی،و دەگەینە ئەو بڕوایە بوونی دەسەڵات لەناو YNDK دانابێتە هۆی دروست بوونی کەسانی باڵاو دەرکردنی بڕیاری چەسپاوو دیکتاتۆرانە، بەڵکو دەبێتە هۆی دروست بوونی کەسانی لێپرسراوو بەرپرس لەگرفتەکان و چۆنیەتی چارەسەر کردنی ئەو گرفتانەو هەروەها بەرپرس دەبێت لەهەر ئالوگۆرێك (چ باش چ خراپ) لەناو ریزەکانی YNDK،وە نابێت هەڤالانی YNDK ببنە هۆی دروست کردنی گرفت، بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەوەندەی خەریکی گرفتەکان دەبین، خۆمان بەکارێکەوە خەریك بکەین کە ببێتە هۆی بەرەو پێش چوونی ڕێکخستنەکان و فراوان بوونی YNDK، ئاشکراشە کە بێدەنگ بوون و شاردنەوەی هەر گرفتێکی ناوخۆی، هۆیەکی بنەڕەتییە بۆ لاواز بوون و نەمانی وا بەستەیی لەناو هەڤالاندا، کەواتە راستگۆیی‌و دەربڕینی رەخنەی بنیات نەرانە بنەمایەکی پتەوە بۆ بەرەو پێش چوونمان لەناو کۆمەڵگای کوردی‌دا.

لێرەدا دەتوانین بڵێین کە هەڤالانی راستەوخۆی سەر بە YNDK، ئەرکێکی گران تریان دەکەوێتە ئەستۆ، کە جودایە لەئەرکی ڕێکخستنی جەماوەری‌و لایەنگرانی بیری نەتەوەیی، چونکە دەبێت بەشێوەیەکی لێهاتووانە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئامانجە ستراتیژی‌و ئامانجە هەنووکەییەکان YNDK بکەن و ئامانجە هەنووکەییەکان بەپاڵپشتێك بزانن بۆ دەستەبەر کردنی ئامانجە ستراتیژییەکانمان، هەر لەبەر ئاڵۆزی کاری سیاسی‌و فراوان بوونی ڕێکخستنەکانمان پێویستیمان بەدەستەبەر کردن و چۆنیەتی دۆزینەوەی رێگا چارەی گونجاو هەیە بۆ پاراستنی ئاسایشی YNDK، کە بەکارێکی گرنگی دەزانین بۆ پتەو کردنی ئاسایشی نەتەوەییمان، چونکە تێکچوونی ئاسایشمان و بوونی کەسانی (غەیرە نەتەوەیی) لەریزەکانمان، دوژمنانی کوردستان زیاتر دەتوانێت کار بکاتە سەر تێکدانی ریزەکانی ڕێکخستنمان و بەرەو لاوازییان ببات، لەبەر ئەوە پێویستی پاراستنی ئاسایشی YNDK بەلایەنێکی گرنگی کارو خەباتی خۆمان دابنێین. دیارە کە ئەندامێکی کۆمەڵگا دەچێتە ناو چوارچێوەی هەر حیزبێك، کۆمەڵێك، ئەرك دەکەوێتە سەر شانی‌و بەپێی ئاستی بەرەو پێش چوونی لەناو حیزبدا، ئەرکی سەر شانیشی زیاد دەکات، لەبەر ئەوەی YNDK ڕێکخراوێکی نەتەوەیی- سەربەخۆخوازە، ئەرکی زیاتر لەسەرشانمان کۆدەبێتەوە، لەهەمان کاتدا ئەندامان لەکاتی روودانی هەر هەڵەو خراپییەکدا مافی بەرگری لەخۆ

کردنی دەبێت، واتە YNDK فکری داڕێژراوی خۆی بەئەندامان رادەگەیەنیّو ئەرکی ئەندامانیش پیادە کردنی فکری YNDKیە، بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندی بالاّی نەتەوەییمان، دیارە کە ئەندامانیش کۆمەڵێك مافی تایبەتییان هەیە کە دەتوانن لەناو چوارچێوەی YNDK پیادەی بکەن، هەر لەمافی ئازادی رادەربڕین لە کۆبوونەوەکانداو ئازادی رەخنە گرتن و هەڵبژاردنی ئازاد لەکاتی کۆنگرەو کۆنفراسەکانداو.. تد، بەلاّم دیارە بەحوکمی بارودۆخی سیاسی کوردستان (کە کوردستان دابەشکراو داگیر کراوە). دەبێت ئەرکی سەر شانمان چەندین جار زیاتر بێت لەبەرانبەر مافەکانماندا، هەرچەندە دەبێت ئێمە وا لەئەرك و خەباتی خۆمان بڕوانین کە لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی‌یە بۆ کورد، کە ئەمەش مافی رەوای تەواوی نەتەوەی کوردە لەکوردستاندا، کەواتە ئەرکی نەتەوە پەروەران لەم قۆناغەدا ماف و شەرەفێکی رەوایە کە لەئەستۆیان گرتووە، دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین ناتوانین بگەینە مافی خۆمان تاوەکو تەواوی ئەرکی سەرشانمان جیّبەجیّ نەکەین کە بنیات نانی دەوڵەتی نەتەوەییە بۆ نەتەوەی کوردی دابەش کراو، لەبەر ئەوەی ئەرکی سەرشانی ئەندام و کادیرانی YNDKش بلاّو کردنەوەی بیری نەتەوەییە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی، کەواتە تەواوی مافە مادیو مەعنەوییەکانمان بۆ بەدەست نایەت تاوەکو نەبینە خاوەن ولاّتێکی سەربەخۆو دیموکرات.

لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەی زیاتر لەهێڵی سیاسیو رێبازی فیکری YNDK- شارەزابین، دەبێت ئەوەشمان لا ئاشکرابێت کە YNDK بەشێوەیەکی ئازادو یەکسان هەوڵ دەدات کە بوار بۆ سەرجەم هەڤاڵان بکاتەوە، تاوەکو بتوانن توانای فکری سیاسی خۆیان دەوڵەمەند بکەن و پراکتیکی بکەن، هەر لەم رێگەشەوە YNDK و نەتەوەی کوردیش بتوانێت سوود لەتوانا مادیو مەعنەوییەکانی ئەو کەسانە وەربگرێت کە هاتوونەتە ریزەکانی YNDKو بەپێی سیستەمی (کەسی گونجاو لەشوێنی گونجاو)دا کارەکان دابەش بکرێت، ئاشکراشە ئەم شێوازی دابەش کردنە لەکارەکانی رێکخستندا لەئەنجامی ئاگایی کۆمەلاّیەتیو سیاسی سەرکردایەتی YNDKو سوود وەرگرتن لەسەرجەم سەرهەڵدانەکانی نەتەوەیی کورد هاتۆتە بەرهەم کە بۆتە هۆی دروست بوونی بنەمایەکی فکریو لەدەروونی سەرجەم ئەندامانی YNDK، کە ئەمەش دەبێتە هۆی بنیات نانی ململانێیەکی شەریفانەی دیموکراتیانە کە لەکۆتایدا YNDKو بیری نەتەوەییو بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردایەتی پێی سوودمەندو دەوڵەمەند دەبێت.

## دووەم/ ڕێکخستنی جەماوەری:

مەبەست لەدروست کردنی شێوازێکی ڕێکخستن بۆ ڕێکخراوە جەماوەرییەکان، ئەوە نییە کە ڕێکخستنەکانی ڕاستەوخۆ بە YNDK لەجەماوەر دابڕاوەو بێ ئاگایە لەداخوازییەکانی جەماوەر، بەڵکو لێرەدا مەبەست لەدابەش کردنی ئیش و کارەکانە تاوەکو بتوانین لەم ڕێگەیەوە زیاتر خزمەت بەبیری نەتەوەیی و داخوازییە هەنووکەییەکانی خەڵکی کوردستان بکەین.

ئاشکراشە دروست کردنی ڕێکخراوی جەماوەری و پیشەیی لەدوای ڕاپەڕینەوە، بەشکڵێکی فراوان پەرەی سەندو گشت حیزبە سیاسییەکانی کوردستان چەندین ڕێکخراوی پیشەیی و جەماوەرییان دروست کرد، بەمەبەستی زیاتر کۆکردنەوەی جەماوەر لەدەوری خۆیاندا، YNDKش هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە بەچاوی پڕ بایەخەوە سەیری ڕێکخراوە جەماوەری و پیشەییەکانی کردووە هەوڵی دامەزراندن و فراوان کردنیانی داوە، ئەگەر سەیر بکەین لەپاش هەڵوێست وەرگرتنی سەرکردایەتی YNDK لە (١/١٠/١٩٩٥)و خاوێن کردنەوەی ریزەکانمان لەکەسانی تیرۆورست و گومان لێکراو، پاش نزیکەی ساڵێك دەست کرا بەراگەیاندنی ڕێکخراوە جەماوەری و پیشەییەکان، دیارە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە YNDK بەقوڵی و فراوانییەوە سەیری ئەو کارانەی کردووەو دایراسەیەکی وردی کراوە، تاوەکو بتوانرێت بەشێوەیەکی کارامەو گونجاو ڕێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکانی پەیووەست بەبیری نەتەوەیی و YNDK زیاتر لەخزمەتی خەڵکی ولاتپارێزی کوردستاندا بێت، لەبەر ئەوەی YNDKش سەرچاوەیەکی فیکری و سیاسی ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییانەیە کە لەپێناو خزمەت کردنی جەماوەردا تێدەکۆشن و ئەو ڕێکخراوانەش کەسانێکی نەتەوەیی رابەرایەتیان دەکات کە لەناو ڕیزەکانی YNDKدا فکری سیاسی و جەماوەری خۆیان پەرە پێ دەدەن پەیووەستن بەبیری نەتەوەیی YNDK،و شتێکی سرووشتیشە کە ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییانە دەتوانن سوودێکی زۆر لەجەماوەرو شێوازی خەباتی سیاسیانەی YNDK وەربگرن بۆ خزمەت کردنی سەرجەم چین و توێژەکانی کوردستان.

بەئاشکرا دەردەکەوێت کە YNDK زۆر باش لەوە تێگەیشتووە کە هەر تووێژێکی کۆمەڵایەتی خاوەنی سیفات و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیەتی و لەگەڵ ئەوەشدا ئاستی تێگەیشتن و پلەی ڕۆشنبیری هەر چین و توێژێك جیاوازی لەنێواندا هەیە، کەواتە

دەبێت بەپێی بیرو بۆچوون و سایکۆلۆژییەتی چین و توێژەکانی کوردستان هەوڵی ڕێکخستن و وشیار کردنەوەیان بدرێت،و ئەگەر ئەم واقیعە کۆمەڵایەتییەی کۆمەڵگای کوردی لەبەرچاو نەگیرێت نەدەتوانین بەرەو پێش بچین و نەدەشتوانین بەشێوەیەکی سەرکەوتووانەو فراوان خزمەت بەچین و توێژەکانی کوردستان بکەین.

لێرەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و ڕێکخستنە حیزبیەکانی سەر بە YNDK خاوەن بەرژەوەندی هاوبەشن و تەواوکەرو یارمەتی دەری کاری یەکترن، هەر لەبەر ئەوەش کارێکی گونجاوە کە دەبینین کادیرانی ڕاستەوخۆ سەر بە YNDKو کادیرانی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان، لەچوارچێوەی خزمەت بەبیری نەتەوەیی‌دا لەناو ڕیزەکانی YNDKدا هاوکارو پشتیوانی یەکترن و هیچ بیرێکی پێچەوانەی یەکتر لەناو ڕیزەکانی ئەم دوو شێوازە لەڕێکخستندا بەدی ناکرێت. چونکە هاتنە مەیدانی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان هەروەك پێشتریش باسمان کرد کە چین و توێژە جیاوازەکانی کوردستان بتوانن بگەنە مافی ڕەواو داواکارییە پیشەییەکانی خۆیان، کەواتە ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی پەیووەست بەبیری نەتەوەیی هەوڵ دەدات هەماهەنگی لەنێوان سەرجەم چین و توێژەکاندا دروست بکات و بتوانێت بەشێوازێکی دیموکراتیانەو شارستانیانە داواکارییەکانیان بگەیەنێتە پەرلەمان و حکومەتی کوردستان، تاوەکو بەشێوازێکی شەرعییانە داواکاری‌و مافەکانیان جێبەجێ بکرێت، ئاشکراشە کە بەرژەوەندی‌و داواکاری جەماوەر بەپێی گۆڕانی کۆمەڵ دەگۆڕێت و لەهەر قۆناغێکیشدا بەجۆرێکی تایبەت بەو قۆناغە جەماوەر هەوڵی بەدەست هێنانی داواکارییەکانی خۆی دەدات، کەواتە لێرەشدا ئەرکی ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی پەیووەست بەبیری نەتەوەیی‌یە، کە بەپێی واقیعی کۆمەڵایەتی کوردستان ئاستی تێگەیشتنی خەڵك و توانای جێبەجێ کردنی حکومەتی کوردستان بۆ داواکارییەکانیان، بەشێوازێکی هاوچەرخانە هەوڵ بدەن داخوازییەکانی جەماوەر جێبەجێ بکەن، واتە دەبێت ئاستی فیکری‌و شێوازی خەباتی ڕێکخراوە جەماوەرییەکانمان و تێگەیشتنمان بۆ گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەی کورد، لەگەڵ واقیع و بارودۆخی سیاسی باشووری کوردستاندا یەکانگیرو هاوتابێت.

هەر لەبەر فراوانی ئاستی ڕێکخراوە جەماوەرییەکان و توانای لەخۆگرتنی جەماوەرێکی زۆر دەتوانین لەزۆر لایەنەوە سوودو قازانجەکانی بۆ بیری نەتەوەیی

دەست نیشان بکەین، وەك دەبینین زۆر لەتاکەکانی کۆمەڵ ئاستی فیکری و تواناییان نەگەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە راستەوخۆ تێکەڵ بەرێکخستنەکانی YNDK بن، لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین کە رێکخراوی جەماوەری سەرەڕای خزمەت کردنی کاروپیشەیی تاکەکانی کۆمەڵ و کۆکردنەوەیان لەپێناو بەرژەوەندی پیشەیی خۆیاندا لەناو چوارچێوەی ئەو رێکخراوانەدا، وەك دەزگایەکی چالاکیش وایە بۆ بلاو کردنەوەی بیری نەتەوەیی لەناو جەماوەرداو دروست کردنی کادری نەتەوەیی بۆ پتەو کردن و فراوان کردنی ریزەکانی YNDK.

لەلایەکی ترەوە لەبەر ئەوەی رێکخراوە جەماوەرییەکانی YNDK خاوەن بیرێکی نەتەوەیی دیموکراتیخوازن و لەخەبات و تێکۆشانی خۆیاندا تووشی هیچ گرفتێك نابن لەکاری رێکخستن و وشیار کردنەوەی جەماوەردا، وەك ئەو گرفتانەی کە رێکخراوە جەماوەرییەکانی وابەستی بەئایدیۆلۆژیای (کۆمۆنیستی و ئیسلامی) دەبێت، چونکە ئەو ئایدولۆژیایانە لەناوەڕۆك و ستراتیژدا چاوەڕێی دەسەلاتێکی رەها (السلطة المطلقة) دەکەن لەپێناو پیادە کردنی ئایدولۆژیاکەیان، دەبینین لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا بۆ پیادە کردنی سیاسەتێکی لەو جۆرە تووشی دوو ڕوویی فکری دەبن، چونکە لەلایەکەوە ناتوانن دەست لەستراتیژی خۆیان بەربدەن و لەلایەکی تریشەوە لەپێناو مانەوەی خۆیاندا ناچارن لەگەڵ رەوتی دیموکراتیانە لەجیهاندا خۆیان بگونجێنن. کە بەئاشکرا دژایەتی ئەو ئایدولۆژیایانە دەکات کە ئەوانە خۆیان بەخاوەنی دەزانن، بەلام بیری نەتەوەیی کە YNDK پەیڕەوی دەکات لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەداهاتوویشدا دووچاری هیچ گرفتێکی فکری و ئایدولۆژی نابێتەوە، چونکە ئامانج و ستراتیژی رزگاری نەتەوەییمانە کە خواستی سەرجەم نەتەوەی کوردە بەگشت چین و توێژەکانییەوە، نەك پیادە کردنی ئایدولۆژیایەکی نامۆ بەکۆمەڵگای کوردی و زەرەرمەند بەڕەوتی خەباتی نەتەوەییمان، کەواتە بیری جەماوەری نەتەوەیی، دەبێت بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەیی کورد، ستراتیژو تاکتێکی خۆی دابڕێژێت و مامەڵە لەگەڵ رووداوەکاندا بکات بۆ خزمەت گەیاندن بەمرۆڤی کورد، نەك بۆ خزمەت کردنی ئایدولۆژیایەکی دیاری کراو، واتە لەنەزەری بیری نەتەوەییدا، مرۆڤی کوردو بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیی کورد گرنگە، نەك مرۆڤی بکاتە قوربانی ئایدولۆژیایەکی نامۆ بەکۆمەڵگای کوردی و رەوتی پێشکەوتنی شارستانییەت لەجیهاندا، کەواتە دەبێت داواکاری و بەرژەوەندی رێکخراوە

جەماوەرییەکانیش لەخزمەت ئاسایشی نەتەوەیی‌و خەباتی نەتەوەیی کورددا بێت، نەك لەخزمەت و لەپێناو چەسپاندنی ئایدولۆژیایەکدا بێت کە ناتوانێت خزمەت بەکێشەی رەوای نەتەوەییمان بکات.

لێرەدا دەگەینە ئەو بڕوایەی کە YNDK حەقیقەتێکی کۆمەڵایەتی– سیاسی هەیە لەناو جەماوەری کوردستانداو لەڕێگەی وشیاری نەتەوەیی‌و بیری نەتەوەییەوە، کاری سیاسی‌و خەباتی جەماوەری خۆی ڕێك دەخات بۆ سەربەخۆیی کوردستان، لەناو ریزەکانی YNDKشدا چەندین یاساو پرەنسیب بەدی دەکرێت بۆ ئەوەی ئەندامانی بتوانن پەیڕەوی بکەن و لەو ڕێگەیەشەوە توانای خۆیان لەخزمەت کردنی بیری نەتەوەییدا بەکاربێنن، لێرەوەش سەرجەم نەتەوە پەروەران و دڵسۆزانی نەتەوەییمان ئازادو سەربەست دەکەین، بەرانبەر بەگشت سەرنج و رەخنەو پێشنیارێك، تاوەکو بتوانین پێکەوە بگەینە چالاکترین شێواز بۆ نەمانی بندەستی نەتەوەیی کورد.

شتێکی ئاشکراشە کە خۆشەویستییەکی مەزن لەدەروونی سەرجەم چین و توێژەکانی نەتەوەی کورددا هەیە، بۆ سەربەخۆ بوونی کوردستان، سەرەڕای ئەوەش لێکدانەوەیەکی نەیارانی بیری نەتەوەیی نەیتوانییوە، حەقیقەت بیری نەتەوەیی‌و خۆشەویستی مرۆڤی کورد بۆ دەوڵەتی نەتەوەییمان لەکەدار بکات، چونکە هیچ فکرێك ناتوانێت خۆشەویستیەك بسڕێتەوە کە لەئەنجامی سەدان ساڵ قوربانی دان دروست بووە.

هەر لێرەوەش حەقیقەتێکی ترمان بۆ روون دەبێتەوە، کە داگیرکردنی کوردستان، واتە دەست بەسەراگرتنی لایەنی (ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، رۆشنبیری‌و کلتوری.. تد) نەتەوەی کورد، دەتوانین بڵێین بەهەمان شێوەش بوون و ئامادەیی کەسانی غەیرە نەتەوەیی لەسەر دەسەڵات نیشانەی دروست بوونی ئاژاوەی فکری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی.. تد دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی لێك ترازانی یەکریزی نەتەوەییمان، چونکە ناکرێت دەسەڵات شتێك بخوازێت کە پێچەوانەی دەروون و عەقڵی تاکەکانی کۆمەڵ بێت، واتە دەبێت بیری دەسەڵاتداران لەگەڵ بیری نەتەوەی کوردو ئاسایشی نەتەوەییمان چوون یەك بێت، بەشێوەیەکی رونتر دەتوانین بڵێین کە هیچ کەس و لایەنێك ناتوانێت بەشداری لەدەسەڵاتی دیموکراتخوازانەی باشووری کوردستان بکات، لەکاتێکدا لەمەزنی‌و گرنگی شۆڕشەکانی کورد تێنەگات وەك (راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران و راپەڕینەکانی بارزان و شۆڕشی شێخ مەحموودی

ئەمرو سمکۆخانی شکاك)و (شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەیی بەڕێبەرایەتی مستەفا بارزانی نەمر).

## سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:


١-محاولة في علم الثورة، د.رجب بود بوس ١٩٩١.

٢-الآحزاب السياسية، والنظم الآنتخابية- احمد عادل ١٩٩٢.

٣-القومية- حول نظرية العالمية الثالثة (الكتاب الآخضر) مجموعة من المؤلف ١٩٩١.

٤-ميشال فوكو، المعرفة والسلطة، عبدالعزيز العيادي، طبعة ١٩٩١.

٥-الحزبية، طبعة ثانية ١٩٩١ مجموعة من مؤلف المركز العالمي لدراسات كتاب الآخضر طرابلس- الجماهيرية.

٦-العرب بين الايدولوجيا والتأريخ. طبعة الاول ١٩٩٥، د.احمد برقاوي.


* ئەم وتارە لەدووتوێی نامیلکەیەك لەساڵی ١٩٩٨ لەلایەن نووسەرەوە بڵاوکراوەتەوە.

# YNDK و ئاشتی

ساڵیادی YNDK که دەکەوێته (٣/٢١) یادی جەژن و سەرکەوتنی نەتەوەییمانە بۆ بەدیهێنانی ئاشتیو ئارامیو عەدالەت بۆ مرۆڤی کورد، چونکە یاد کردنەوەی نەورۆز واتا بەردەوامیو پێشکەوتنی بیری نەتەوەییو هەر لەم رۆژەشدا راپەرینە جەماوەرییەکەی خەڵکی کوردستان گەیشتە لوتکەی سەرکەوتن، YNDKش بۆ گەیاندنی بیری نەتەوەییو چەسپاندنی ئاشتیو عەدالەت، لەرۆژێکی ئەوها پیرۆزدا سەری هەڵداو توانرا مانایەکی مەزنترو پیرۆزتر بە (٣/٢١) ببەخشرێت لەدەروونی سەرجەم وڵاتپارێزانی کوردستاندا، کەواتە YNDK لەو رۆژەی کەوتە ناو ژیان و بڕیاری بەردەوامی دا تاگەیشتن بەکوردستانێکی سەربەخۆو ئازاد، لەرۆژێکی مەزندا بوو کە یادی جەژنی نەورۆزی نەتەوەییمان و دەست پێ کردنی ساڵی نوێی کوردی‌یە.

دەبینین کە YNDKش لەرەوشێکی وەهادا سەری هەڵدا، کە شەڕی ناوخۆ بەردەرگای ماڵی کوردی گرتبوو، بەمەش کەلێنێکی گەورە کەوتبووە نێوان یەکریزی نەتەوەییمان لەباشووری کوردستانداو وردە وردە هەوڵ دەدرا بەبیانووی بوونی شەڕی ناوخۆ لەکوردستاندا هێزو تواناى نەتەوەی کورد بخرێتە خزمەت رەوشێکەوە کە هیچ خزمەتێك بەبەرژەوەندی نەتەوەییمان ناگەیەنێت، کەواتە YNDK بۆیە لەکاتی شەڕو ناخۆشیدا سەری هەڵدا، دیارە کە ئەو شەڕە ناوخۆییەی پێ قبوڵ نەبووە هەوڵی داوە ئاشتیو ئارامی بچەسپێت، بۆ ئەم کارەشی پێویستی بەورەو تواناى سەرجەم جەماوەری ئاشتیخوازو وڵاتپارێزی کوردستان بووە، هەر بۆیەش YNDK هەمیشە هەوڵی داوە کە وڵاتپارێزانی کوردستان لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو بتوانێت ورەو تواناى نەتەوە پەروەران بخاتە خزمەت کێشەی رەوای نەتەوەییمان و بەگیانێکی شۆڕشگێڕانە رووبەڕووی رووداوەکانی کوردستان بۆتەوەو هەڵوێستی توندو نەتەوەییانەی بەرانبەر بەشەڕ خوازان وەرگرتووەو لەبەرامبەریشیدا هاوپەیمانێتی گشتی بزوتنەوەو رەوتێکی ئاشتیخوازانەی کردووەو هەوڵی دروست

کردنـی ئیرادەو توانایـەکی پتـەوی داوە بـۆ هاتنـە مـەیدانی هـێزێکی شارسـتانیو ئاشـتیخوازانە لەکوردسـتاندا، هـەر بۆیــەش لـەڕۆژی (١/١٠/١٩٩٥)دا هەڵوێسـتێکی دیموکراتیانـەی وەرگرت و ڕێزەکانی خۆی لەچەند کەسێکی شەڕخوازو تیرۆریسـت پاککردەوەو، کە لەڕێگەی PKKوە خزێنرا بوونە ناو ریزەکانی YNDK، بەمەبەسـتی تێکدان و بەلاریدا بردنی بیری نەتەوەیی، هەر ئەو تاقمە نامۆیەش بەبیری کوردایەتی لەئێوارەی ٢٠-٢١/١٠/١٩٩٥دا هەستان بەتەقە کردن و هـەوڵی تیرۆر کردنی هـەڤاڵ (غـەفوور مەحمووری- سکرتێری گشتی YNDK)، چونکە لـەوە بێگومـان بـوون کـە نـاتوانن لەڕێگـەی ململانێـی فیکـریو دیموکراتیانـە، بـیری نەتـەوەیی لەمێشـك و دەروونـی هـەڤاڵاندا بسڕنەوە، بەم کارەشیان بۆ سـەرجەم جـەماوەری کوردسـتانیان سەلماند کە ناتوانن واز لـەبیری شـەڕخوازانەی خۆیـان بێـنن ئەمە لەلایـەك، لەلایـەکی تـرەوەش سـەرکردایەتیو سـەرجەم هـەڤاڵانی YNDK توانیـان بـەردەوام بـن لەسـەر هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی خۆیان و بیسەلمێنن کە لەبەرامبەر هەر بیرێکی شەڕخوازو کۆنەپەرستدا، بۆ چەسپاندنی ئاشتیو ئارامی پێویستیمان بەوتارێکی نەتەوەییانەو بـیرێکی ئاشـتیخوازانە هەیـە، تـاوەکو بتوانـین ئاشـتی بکەینـە ڕەوتـی تێکۆشـانی سەرجەم وڵاتپارێزانی کوردستان، چونکە لـەکاتی ئاشـتیدا دەتوانرێـت ململانێیەکی شارسـتانیانەو فیکریانـە پیادە بکرێـت، لـەم حاڵـەتی ئاشتیشـدا یـان دەبێـت بـیرو بۆچوون و کرداریان بگۆڕن یاخود ڕووبەڕووی لەناوچوون دەبنەوە، لەئەنجامدا هێزە تیرۆریسـت و پاشـڤەرۆییەکان بوون و کاریگـەری خۆیـان لـەناو جـەماوەردا لەدەسـت دەدەن، کەواتــە YNDK ڕەوتێکــی ئاشــتیخوازانەیە، لەبەرامبــەر هــەر ڕەوتێکــی شەڕخوازانەدا.

لـێرەدا جێگـەی خۆیـەتی کـە پرسـیارێك بکرێـت کـە ئایـا YNDK چـۆن لەئاشـتی تێدەگات؟

هەرچەندە لەپێشدا گەر ناڕاستەوخۆش بوبێت وەڵامی ئەم پرسیارەمان تاڕادەیەك بۆ روون بۆتەوە، بەڵام لێرەدا هەوڵ دەدەین باشتر بچینە ناو ئەم پرسیارەو وەڵامێکی باشتری بدەینەوە.

لەبـەر ئـەوەی شـەڕی نـاوخۆ کاریگەرییـەکی خراپـی کردۆتـە سـەر خـەباتی نەتەوەییمان و توانیوویەتی وێنەی خراپ و ڕەشی خۆی لەدەروونی هەندێك حزب و کەسی کوردیدا رازاوە بکات و کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەیە کە هەندێك لەحیزب و

کەسایەتی کوردی بەهۆی ئەم شەرە ناوخۆییەوە گیرۆدەی بیری دیکتاتۆریەت بوون و ئیرادەی خۆیان تەسلیم بەشەڕی ناوخۆ کردووە لەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانیان، ئەمەش بەربەستێکی گەورەیە لەبەردەم خەبات و رزگاری نەتەوەییمان، چونکە شەڕی ناوخۆ تارادەیەکی زۆر کاری خۆی کردووەو رەنگدانەوەشی هەیە لەسەر دەروونی خەڵکی کوردستان و بەشێوەیەکی خراپ و دژ بە بەرژەوەندی نەتەوەییشمان رووداوە ناوخۆیی و دەرەکییەکان ئاراستە دەکات، لەبەرامبەر ئەمەشدا پێویستە رەوتی ئاشتیخوازانەش لەلایەن حیزب و کەسایەتییە ولاتپارێزەکانەوە بایەخ و گرنگی خۆی پێ بدرێت، تاوەکو بتوانرێت لەشکری ئاشتیخوازانە لەکوردستاندا، کەئێستا پەرلەمان و کابینەی سێیەمی حکومەتی کوردستان رابەرو نوێنەرایەتی دەکات فراوانتر بێت و پشتگیرییەکی زیاتریشی لێ بکرێت، بۆ ئەوەی بۆ دوا جار شەڕی ناوخۆ لەکوردستاندا بنبڕ بکرێت و چیتر سەروەت و سامان و هێزی جەماوەری کوردستان بەتالان و بێ سوود نەڕووات و رەوتی خەباتی نەتەوەییشمان رێگەی راستی خۆی بگرێتەوە بەر، چونکە ئاشکرایە کە پەرلەمان واتە بوونی دیموکراتیەت و هەڵبژاردنی ئازادیو پاراستنی مافی مرۆڤ.. تد کە ئەمەش لەخزمەتی سەرجەم جەماوەری کوردستاندایە، بەلام بوونی شەڕی ناوخۆ واتە سەرکووت کردنی گشت ئازادییەك و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ و بێ نرخ بوونی گشت بەها مرۆڤایەتییەکان، کەواتە رەوتی ئاشتیو شەڕ دوو هێزی دژ بەیەك و ناکۆکن و لەهیچ خاڵێکدا زەحمەت بتوانرێت شەڕو ئاشتی پێکەوە کۆبکرێتەوە، لەبەر ئەوە ناتوانرێت لەولاتێکدا شەڕ بالا دەست بێت و مافی مرۆڤ پێشێل نەکرێت و داواش بکرێت کە پەرلەمان و یاسا مەدەنییەکان بتوانن حوکمی خۆیان بگێڕن، چونکە شەڕ رەوشتێك دێنێتە کایەوە کە بەجۆرێکی تایبەت بەخۆیو بارودۆخێکی ئالۆزکارو شپرزە کێشەکان بەرێوە ببات و ئاراستەی رووداوەکان بکات و هەر بەهۆی ئەو رەوشە نالەبارەوەش شەرعییەت دەداتە خۆی کە مەزنترین سەرپێچی یاسایی بکات، لەبەرامبەر رەوشی نالەباری شەڕدا دیارە کە ئاشتیش لەکوردستاندا داوا دەکرێت، واتە داوای گەڕانەوەی سەروەرییو بڕیارەکان بۆ دەست پەرلەمانی کوردستان، چونکە لەحوکمی پەرلەماندا، کە ئەمیش شێوازێکی تایبەتی هەیەو لەگشت بوارەکاندا پێچەوانەی ئەو رەوش و یاسا دیکتاتۆریانەیە کە شەڕ بەرهەمی دێنێت.

کەواتە تاکە ڕێگە بۆ چەسپاندنی ئاشتیو ناساندنی ڕووی گەشی ڕاستەقینەی کێشەی ڕەوای نەتەوەییمان، پاراستن و پشتگیری کردنی پەرلەمان و حکومەتی کوردستانە، چونکە لەدنیای ئەمڕۆدا ئەوەندەی کێشەکان بەدیموکراتیانەو شێوازی گفتوگۆ چارەسەر دەکرێت هیچ کاتێك بەڕێگەی شەڕو کوشتار نەهاتۆتە چارەسەر کردن و تەنیا لەڕێگەی پەرلەمان و حکومەتی کوردستانەوەش دەتوانین پرۆسەی خزمەتگوزاریو ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بەردەوام بێت، لەبەر ئەوەی تائێستاش نەتوانراوە لەکوردستاندا ئاشتییەکی سەرتاسەریو تۆکمە بچەسپێت و ئەو بارودۆخە کە لەئاراشدایە نەخراوەتە خزمەت کێشەی نەتەوەییمان، کەواتە بۆ ئەوەی بتوانین خزمەت بەناساندن و چارەسەر کردنی کێشەی نەتەوەییمان بگەیەنین پێویستە کە ئاشتی بچەسپێت و ئاشکراشە کە جەماوەری فراوانی ئاشتیخوازیش پشتگیری لەسەرجەم هەوڵەکانی ئاشتی دەکات، چونکە بەچەسپاندنی ئاشتی بەرژەوەندی بالای تاك و کۆمەڵی کوردی پارێزراو دەبێت، لێرەشدا لەهەموو کات زیاتر پێویستیمان بەوشیار کردنەوەی جەماوەر هەیە، چونکە جەماوەرێکی زۆری کوردستان لەم شەڕە ناوخۆییەدا زەرەرمەند بووە، بۆ ئەوەی هەموو لایەکیش تێبگەین کە دارشتنی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ یەکتری لەسەر بنچینەی شەڕو هێزی سەربازی خزمەت بەکێشەی نەتەوەییمان ناکات و پێویستە بیر لەڕێگەیەکی تری گونجاو بکەینەوە بۆ دارشتنی پەیوەندی نێوان (کورد- کورد)، کە ئەویش ڕێکخستنەوەی هێزی کوردییە لەسەر بنچینەی ئاشتیو ڕێزگرتنی بیروڕای جیاواز کە لەپێناو بەرەو پێش چوونی ئەزموونی دیموکراتی نەتەوەیی کورددا بێت.

واتە سەرهەڵدانی ئاشتی وەك بیرێکی چەسپاو پێویست لەکۆمەڵگای کوردیدا، دەبێت بکرێتە بنەمایەك بۆ چارەسەر کردنی سەرجەم کێشە ناوخۆو دەرەکییەکان، تاوەکو بتوانرێت لەدەرگای ئاشتیو گفتوگۆو دانوستانەوە هەوڵی چارەسەر کردنی کێشەکانمان بدەین، بەتایبەتی ئەو کێشانەی کە لەناوخۆدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.

* ئەم وتارە لەژمارە (٣٠)ی ڕۆژنامەی میدیا- ڕۆژی ١٩٩٨/٣/٢١ بلاوکراوەتەوە.

# کێ یەکەم پڕیشکی ئاگری شەڕی ناوخۆی هەڵگیرساند؟!

راپەڕینە جەماوەرییەکەی خەڵکی کوردستان هۆکارێکی گرنگ و بەرەوپێش چوونێکی خێرایی بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلی کوردستان بوو، لێرەدا ئەوەی جێی باسە کە هێڵی رابەرایەتی کردنی راپەڕین لەجەستەی مرۆڤی کورددا بەدوو ئاراستە هەنگاوی دەناو ئەو دوو ئاراستەیەش حوکمی بەرەوپێش چوونی رووداوەکانیان دەکرد، یەکێکیان ئاراستەیەکی عەقلانی بوو کە زۆر لاوازبوو دووەمیان ئاراستەیەکی عاطفی (سۆز) بوو کە زۆر بەهێزو زاڵ بوو، بەلام لەسەرەتایی راپەڕیندا هەردوو هێڵی (عەقلانیو عاتفی) لەخزمەتی رزگاری نیشتمانیو بنیات نانی دیموکراتیو ئازادی‌دا بوون، چونکە لەو کاتەدا بەرەی گەل و هێزی جەماوەر هێندە بەهێزبوو کە ململانێی حزبایەتیو فکری کاری تێ نەدەکرد، بەلام پاش ماوەیەکی کەم ململانێو کێشە کێشی حزبیو زیاتر شەخسی دەستی پێ کردو هەر لێرەوەش لەلایەن حیزبە کوردستانیەکانەوە بەتایبەتی PDK وYNK هەوڵ درا هێزو توانای لەبن نەهاتووی جەماوەر بۆ خزمەتی خۆیان بەکاربهێنن و هەریەکەیان هەوڵیان دەدا خۆیان بکەنە تاکە هێزی کوردستان کە هیچ چارەنووسێکی سیاسی دیارنی‌یە، سەرەتاش هەوڵیان دا بەشێوازێکی دیموکراتیانەو لەرێگای بەکارهێنانی دیموکراسیەوە خۆیان بسەپێنن و بەهۆی پەرلەمانەوە شەرعیەت بەبالا دەستی خۆیان بدەن، بەلام هەردوو حزب بەنیازی یەکتر گەیشتبوون، کە ئامانجیان توانەوەی یەکترە لەبەر ئەوە گۆڕەپانی دیموکراتیەتیان بۆ یەکتر چۆڵ نەکردو لەناو پەرلەمانیشدا دەیان ویست بیسەلمێنن کە هاوتای یەکن و ئەگەر یەکێکیان وجودی نەبێ ئەوا پەرلەمان دەبێتە جەستەیەکی بێ گیان.

وە هەر لەبەر ئەوەی عەقلی کوردی گەشەی نەکردبوو، لایەنی سۆز (عطف) حوکمی دەکردو دەسەڵاتێکی سەرتاپاگیری بەسەر خەڵکی کوردستاندا هەبوو هەر بەزوویی لەبری ئەوەی لەژێر سایەی هێڵی ئەمنی (٣٦)و بنکەی (ئەنجەرلیك)دا گەشە

بەبیری نەتەوەیی‌و هێزی سەربازی حکومەتی هەرێم و پاراستن و پتەوکردنی (گیانی کوردی) بدرێت، هەوڵدرا لەو ناوچە پارێزراوەدا قەسابخانەیەکی نادروست بۆ خەڵکی کوردستان دروست بکەن و دەستکەوتەکانی بەرئاگری نەگریسی شەڕی ناوخۆ بکەوێت و دووچاری مەترسی فەوتان ببێت.

ئاشکرایە ئەگەر ئێمە شەڕی ناوخۆ رسواو مەحکوم بکەین دەبێت یەکەم هەنگاو یەکەم دەست پێشخەری شەڕ رسواو مەحکوم بکەین، وەیەکەم هەنگاوی شەڕی ناوخۆو هەوڵدان بۆ سڕینەوەی ململانێ بەشێوازێکی عەسکەری‌و ناشارستانیانە لەنێوان (یەکێتی نیشتمانی‌و بزوتنەوەی ئیسلامی) دەستی پێکرد چونکە (یەکێتی نیشتمانی) بوونی هێزێکی چەکداری‌و فکری ئاینی بەخەتەر دەزانی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی هەر زوو یەکەم هەنگاوی شەڕی دژی بزووتنەوە دەست پێ‌کرد، هەتاوەکو یەکێك لەنەیارەکانی تووشی شکستی عەسکەری بکات و رووداوەکانیش سەلماندییان کە (یەکێتی نیشتیمانی) تەنها بڕوای بەشێوازی عەسکەرییانە هەیە، بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکان، هەر بۆیەش بووە یەکەم حزب لەمێژووی حکومەت و پەرلەمانی کوردستاندا کە رچەی شەڕی ناوخۆو شەڕی براکوژی ناشارستانیانەی شکاندوو بە شانازیشەوە کردییە سەرکەوتنێکی وەهمی بۆ خۆی، لەپاشاندا هەستی کرد کە لەلایەن جەماوەری کوردستانەوە تووشی بەرەنگارییەکی فعلی ئەوتۆ نەبوو کەببێتە مایەی شەرمەزاری‌و تەنانەت حزبە کوردستانیەکانی تریش هەڵوێستێکی جدیان نەگرتەبەر بۆ بەرەنگاری بوونەوەی شەڕەکەو هەستیان نەدەکرد کە ئەمە تاوان و ڕێ خۆشکەرێکی جدیی‌یە بۆ ماڵ وێرانی‌و کاوڵ کردنی تەواوی کوردستان و شکاندنی حورمەتی ئازادی‌و دیموکراتیەت لە کوردستاندا، چونکە ئەگەر هەست بەو خەتەرە گەورەیە بکرایە لەلایەن جەماوەرو حزبە کوردستانیەکانەوە، ئەوا بەتووندی رووبەڕووی دەبوونەوەو بەلای کەمەوە نەیان دەهێشت کاری لەو جۆرە دووبارە بێتەوە. بەهەر حاڵ لەپاش ئەو سەرکەوتنە عەسکەرییەی YNK بەسەر (بزووتنەوەی ئیسلامی)دا هەستی کرد کە توانیوەتی لەرووی عەسکەری‌و رێکخستنی جەماوەریشەوە (بزوتنەوەی ئیسلامی) تووشی شکست بکات، هەر لێرەوە هەوڵیدا هەر چ رێکخراوو حزبێك ململانێی دیموکراتیانەی لەگەڵدا دەکات و رەخنەی لێ دەگرێت بەشێوازی عەسکەری‌و تیرۆر وەڵامیان بداتەوەو سەرکوتیان بکات و خۆی بەتاکە حزبی راپەڕین لەقەڵەم دەدا، دواجار (یەکێتی) بەتەواوی بۆی دەرکەوت کە

ئەگەر گشت حزب و ڕێکخراوە سیاسی‌یەکان بەتایبەتی ئەوانەی کە لەڕووی عەسکەری‌و جەماوەری‌یەوە تەواو گەشەیان نەسەندووە لەناو بەرێت و هەردەبێت ڕووبەڕووی (پارتی دیموکراتی کوردستان) ببێتەوە، چونکە ململانێی خوێناوییان مێژوویەکی کۆنی هەیەو برینە مێژووییەکان بەتەواوی سارێژ نەبوون و ئەو هێزانەش کە بەدەستی YNK تووشی شکست دێن لەژێر سایەی PDK دا دەبووژێنەوەو سەخت تر بەرەنگاری دەبنەوەو وەك هەڵوێست و بیروڕای (یەکێتی) مامەڵەو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکەن.

ناچار باشترین ڕێگای هەڵبژاردو گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بەتێکشکانی PDK دڵنیا دەبێ لەوەی کە دەتوانێ دەسەڵاتی تاکڕەوی خۆی بچەسپێنێ‌و تۆڵە لەهەموو حزبە کوردستانیە نەیارەکانی بکاتەوە هەر چەندە دەشیزانی کە خۆی‌و کردەوەکانی YNK سەبەبی ئەوەبوون کە ئەو حزب و ڕێکخراوانە ببنە بەرەی دژ بە YNK، وەهەر لەسایەی عەقڵی عەسکەرتاری‌و ناشارستانیانەدا شەڕ بەدژی قودسیەت ترین دەستکەوتەکانی جەماوەری کوردستان هەڵگیرسا کە پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و ژیانێکی ئاسوودەو ئازادییەو هیچ حیسابێك بۆ دەست کەوت و قوربانی دانی چەندین ساڵەی خەڵکی کوردستان نەکراو هەر لێرەوەش وزەو توانای خەڵکی کوردستان بەشێوازێکی فراوان ئاشکرا خرایە خزمەت شەڕی ناو خۆوە.

ئەمجارەشیان بەهەرچ ڕێگەیەك و لەژێر هەر بڕووبیانوویەکدا بوو شەڕی ناوخۆی نێوان (پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان) دەستی پێکرد، پێشتریش ئاماژەمان بەوە کرد کە لایەنی شەڕ خواز یەکەم دەست پێشخەر کێ بووەو مەبەستیشی چی بووە، هەر بۆیە شەڕیش دەستی لە PDK نەپاراست ئەویش تێوە گلاند.

بەڵام ڕێرەوی بەرەوپێش چوونی شەڕی نێوان PDK و YNK وەك شەڕی نێوان یەکێتی‌و بزووتنەوەی ئیسلامی نەبوو، تاوای لێهات کاریگاتە ئەوەی شەڕەکە بەچەندین جەولە کۆتایی نەیەت و گەردەلوولی شومی شەڕ پایتەختی حکومەتی هەرێمی گرتەوەو ڕێگا خۆش بوو بۆ ئەوەی کە بێگانەو نەیارانی کورد بەئاشکرا دەست بخەنە کاروباری کوردستانەوەو دەوری خۆیان بگێڕن و حزبە کوردستانیەکانی تریش زیاتر بەخەمی پاراستنی بەرژەوەندی خۆیانەوە بوون، تەنانەت هەندێ حزب کە خۆیان بە حزبێکی نەتەوەیی لەقەڵەم دەداو خۆیان

بەخاوەنی هەر چوار پارچەی کوردستان دادەنا، خۆی لەشەڕی ناوەخۆوە گلاند، هەروەکو هێرشەکانی PKK بۆ سەر باشووری کوردستان و حکومەتی هەرێم کە زیاتر ڕێگەی خۆش کرد بۆ دەست تێوەردانی بێگانە لەکوردستانداو خۆش کردنی ئاگری شەڕی ناوخۆو بەکوشتدانی ژمارەیەکی تر لەلاوی کورد.

ئاشکرایە کە سەخت ترین قۆناغی شەڕ دەست پێ کردنی جەولەی سێیەمی شەڕبوو کە لەسنووری ئێرانەوە بەپشتیوانی (کۆماری ئیسلامی ئێران) لەلایەن YNKەوە هێرش کرایە سەر بنکەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و پاشتریش دەست تێوەردانی ڕژێمی عێراقی لەشەڕەکەدا.

بەهەرچ شێوازێك بوو لەماوەیەکی کورت دا YNK پاشەکشەی پێ کراو رووەو خاکی ئێران ملی ڕێی گرت، بەلام بۆ جارێکی تر بەپشتیوانی ئێران هاتەوە گۆڕەپانی سیاسی کوردستان، بەلام ئاخۆ چارەنووسی (یەکێتی) چۆن دەبێت کە بەپشتیوانی حکومەتێك بجەنگێت، کە هیچ مافێکی نییە، دەست بخاتە کاروباری خەلکی کوردستانەوە، وە لەڕووی جێگەو شوێنی کۆماری ئیسلامی ئێران لەکۆمەلگای نێودەولەتیدا بە دەسەلاتێکی سیاسیی کۆنەپەرستی ترۆریستی جیهانی ناسراوەو ڕۆژانە لە کەنالە جیهانیەکانی ڕاگەیاندن و لەڕووی پێشێلکارییەکانی مافی مرۆڤەوە ریسواو مەحکوم دەکرێت.

بەهەر حال شەڕی ناوخۆ کێشەی کوردی تووشی وەستان کرد، پاش شەڕیش کە ئاخۆ کەی کۆتایی دێت، دەبێ چەندە زەمەنمان پێویست بێت تاکێشەی گەلی کورد دەکەوێتە جوولەو دیسانەوە هێزی جەماوەری برسیو هیلاك بەدەست شەڕی ناوخۆوە دەخرێنە خزمەتی کێشەی ڕەوای خۆی کە ڕزگاربوونی نەتەوەیی یە.

* ئەم وتارە لەژمارە (٩)ی ڕۆژنامەی میدیا- سالی یەکەم- ڕۆژی ٩/تشرینی دووەمی/ ١٩٩٦ بلاوکراوەتەوە.

# جەولەی چوارەمی شەڕو YNK و هەنگاونان بەرەو ڕێکخراوێکی تیرۆریستی

زەمەن یەکێکە لەبنەما کاریگەرەکانی دەرخستنی ڕووی ڕاستیەکان، ئەمەش لەبواری سیاسیدا زیاتر لەخانەی حەقیقەتدا جێگەی خۆی گرتووە، واتە لەئەنجامی خوێندنەوەی مێژووی ململانێ سیاسیەکان دەتوانین رووی راستی مەسەلەکان ببینین، لێرەدا دەتوانین لەڕێگەی تێڕوانین و هەڵوێست وەرگرتن لەگۆڕانکارییە سیاسیەکان و چۆنیەتی هەوڵ دان بۆ بەرەو پێش چوونی ململانێیەکان بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا شیکاری گۆڕانکاریو ڕووداوەکانی ئەم دواییەی باشووری کوردستان بکەین و دەرئەنجامەکانیشی دیاری بکەین.

ئاشکرایە لەباشووری کوردستاندا ئەنجامی درێژەکێشانی شەڕی ناوخۆو بەرز بوونەوەی ئاستی شەڕەکان لەجەولەیەکەوە تاجەولەیەکی تر، جەماوەری کوردستان و لایەنە سیاسیەکانی کوردستانیش بوونەتە بەشێکی ململانێیەکان، جا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یاخود ناڕاستەوخۆ، چونکە هەر چ گۆڕانکارییەك ڕوو بدات کاریگەری لەسەر ژیان و ڕەوتی خەباتی نەتەوەکەمان دەبێت.

باڵێرەوە بچینە ناو کرۆکی باسەکەو شیکردنەوەیەکی واقیعیانە بۆ هێرشەکانی (١٣- تشرینی یەکەمی ١٩٩٧)، یاخود جەولەی چوارەمی شەڕ بکەین، ئاشکرایە (YNK) وەك راستیەکی مێژوویی‌و لەڕێگەی راگەیاندنەکانی خۆشیەوە بەشانازی‌یەوە دانی بەوەداناوە کە ئەو (YNK) جەولەی چوارەمی شەڕ یاخود قۆناغی دووەمی (گەردەلوولی تۆڵە!)ی دەست پێ کردووە، لێرەدا هەر چەندە ئەم دەست پێشخەرییەی (YNK)و هاوپەیمانەکانی بەخیانەتێکی نەتەوەیی دادەنرێت، چونکە زۆر هەوڵی پڕ بایەخ لەناو خۆو دەرەوەدا خەریك بوون پرۆسەی ئاشتی بەرەو پێش بەرن و بیگەیەننە ئامانجێکی دڵخۆشکەر، بەڵام بزانین ئایا چارەنووسی ڕێکخراوێکی وەك (YNK) چی بەسەردێت؟! ئایا کەسوکاری کوژراوەکان و جەماوەری (YNK) قبوڵ دەکەن کە خوێنی شەهیدان و خەباتیان بخرێتە خزمەت پەرەسەندنی تیرۆریزم لەکوردستاندا؟!

بەهەر حاڵ ئاشکرایە کە (PKK) بەپێی یاساو عورفی نێو دەوڵەتی بەرێکخراوێکی تیرۆریست و نایاسایی لەقەڵەمدراوە، بەڵام لێرەدا ئاشکرا دەبێت کە (YNK) ئەوەندە تامەزرۆی دەسەڵاتێکی موتلەق بووە تاوای لێ بکات خۆی لەگەڵ (PKK)دا بگونجێنێت و بەرەو بنیات نانی هەیکەلێکی تیرۆریستی سەر لەنوێ خۆی ڕێك بخاتەوە، یاخود

ئەوەندە بەزەلیل و تێك شكاوو بێ دەسەلآت خۆی دەهاتە پێش چاو تاوای لێهات ناچار بێت چارەنووسی خۆی ببەستێتەوە بە چارەنووسی (PKK)وە، هەرچەندە (YNK) لەوانەیە زۆری پێ ناخۆش بێت كە پێی بووترێت تۆش بوویتە تیرۆریست یاخود ئەگەر بەسیاسەتی خۆیدا نەچێتەوە دەچێتە ریزی تیرۆریستانەوە، چونكە ئاشكرایە كە هەموو بزوتنەوەیەك یاخود حیزبێك لەڕێگەی كارو كردەوەكانیەوە دەتوانرێت پێناسە بكرێت، چونكە شتێكی بەڵگە نەویستە هیچ رەوتێكی دیموكراتیخواز ناتوانێت هاوپەیمان و هاوچارەنووسی تیرۆریستان بێت، هەروەك چۆن بزوتنەوەی دیموكراتیخوازو ئاشتیخواز لەجیهاندا خاسیەتی خۆی هەیە وەك (ڕێزگرتن لەمافی مرۆڤ، بڕوابوون بەفرە حزبی، ئازادی رۆژنامەگەری.. تد) بەهەمان شێوەش تیرۆریستەكانیش خاسیەتی تایبەتی خۆیان هەیە، هەر چەندە هیچ كوردێكی نیشتمان پەروەر ئارەزووی ئەوە ناكات كە هیچ حیزبێك یاخود ڕێكخراوێكی كوردی بچێتە خانەی تیرۆریستانەوەو لاوانی نەتەوەكەمان بكرێنە سووتەمەنی رەوتێكی تیرۆریست لێرەدا بەناچاری حەقیقەت و چەند خاسییەتێكی (PKK)ی تیرۆریستی ناسراو لەناوچەكەو جیهاندا دیاری دەكەین و لەگەڵ هەڵسووكەوتەكانی ئەم دواییەی (YNK) بەراوردی دەكەین:

١-لێكدانەوەی ڕووداوەكان و هەڵوێست وەرگرتن لەبەرانبەریدا بەشێوەیەكی توونددو بێزراو لەئاست شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا دەبینین (PKK) كە بەرەو پێش چوونەكانی باشووری كوردستانی پێ قبوڵ نەدەكرا، راستەوخۆ دژایەتی بیروڕاو خواستەكانی باشووری كوردستانی كردوو پەرلەمان و حكومەتی كوردستانی بەناشەرعی لەقەڵەم داو خۆی بەبیر كەرەوەی گشتی خەڵكی كوردستان دادەناو لەهەمان كاتدا شەڕی ساڵی ١٩٩٢ و ١٩٩٥ و ١٩٩٧ دژە پەرلەمان و حكومەتی كوردستان هەڵگیرساند، بەڵام سەیر ئەوەیە (YNK)یش ئێستا گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی كە ناتوانێت دیموكراتیەت وەك سیستەمێكی ژیانی خەڵكی كوردستان قبوڵ بكات و راستەوخۆ (PKK)ی گرتۆتە ئامێزو پێكەوە شەڕی پەرلەمان و حكومەتی كوردستان دەكەن، دیارە ئەم جۆرە كارانەش هیچ خزمەتێك بە نەتەوەی كورد ناگەیەنێ، بەڵكو حەسانەوەیەكی دەروونیە بۆ تیرۆریستان و رازی كردنی دڵی ئەوانەی دژی پەرلەمان و حكومەتی كوردستانن.

٢-پێشێل كردنی داب و نەریتی كۆمەڵگا: (PKK) سیستەمی هەرەمیو بنەماو شێوازی ڕێكخستنی خێزانی كوردی بەشتێكی هەڵە دادەنێت و راستەوخۆ دژایەتی

دروست کردنی خێزان دەکات و کچ و کوڕی نەتەوەکەمان بەزۆر راپێچی شەڕەکان دەکات، (YNK)یش هاوکاری دەکات و یارمەتیشی دەدات بۆ ئەوەی گوندە تازە ئاوەدانکراوەکانی کوردستان کاول بکات، وە (YNK) پێشێلی سەرەتایی ترین مافەکانی مرۆڤ دەکات کە ئەویش ئاوارەکردنی خەڵك و بڕینی کارەبا و قەدەغە کردنی هاتووچۆیە لەدانیشتوانی کوردستان.

٣-تیرۆریستەکان لەتەنگانەدا دەبنە پشت و پەنای یەکتری:

تیرۆریستان وەك خاسیەتێکی هاوبەشی خۆیان نامۆن بەژیانی شارستانیو لەکاتی لەناوچوونی هەر بزوتنەوەیەکی تیرۆریستی تردا دەچن بەهانایەوەو زیندووی دەکەنەوە، سەیرکەن کاتێك (P..K.K) تێکشکاو نەیدەتوانی چی تر شەڕی (پارتی دیموکراتی کوردستان) بکات ناچار (YNK) هاوکاری کردو دەوڵەتی ئێرانیش وەك حەشارگەی گشت تیرۆریستانی ناوچەکە چوو بەهانایانەوە، وا هەوڵدەدا زیندوویان بکاتەوە (کە زیندوو بوونەوەیشیان زەحمەتە)، باشترین نمونەش بۆ ئەوەی کە تیرۆریستان لەهەر شوێنێك هاوکاری یەکتریدەکەن، ئەو پشتگیرییە ئیعلامیەی (PKK) بوو بۆ بزوتنەوەی (تۆباك ئامارۆ) کاتێك هەڵیان کوتایە سەر سەفارەتی ژاپۆن لەپیرۆداو پەیوەندی پتەوی (PKK)ش بە (نازی)یەکانی ئەڵمانیاوە.

٤-بنەمای ئابووریو کۆکردنەوەی سامان لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە:

دەبینین (PKK) ماڵی خەڵك تالاّن دەکات، بازرگانی بەماددە سڕکەرەکانەوە دەکات.. لەپێناو کۆکردنەوەی زۆرترین سامان بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بەشەڕ بدات، واتە لەلای (PKK) گرنگ نییە ناوو ناوبانگی نەتەوەی کورد لەدەرەوە چی بەسەر دێت. گرنگ ئەوەیە کە شەڕ بکەن و سامانێکی زیاتر کەڵەکە بکەن، لەلای (YNK)یش گرنگترین و بایەخدار ترین شت گومرگ و داهاتی کوردستانە، هەر بۆیەش ئارەزووی دەسەلاّتێکی رەها دەکات چونکە بەس ئەو کاتە دەتوانێت سەروەت و سامانێك کەڵەکە بکات و ممارەسەی بیرو باوەڕی خۆی بکات، کە ئاشکرا بووە بیرو باوەڕی غەیری خۆی قبوڵ ناکات.

با ئەو خاسیەتە هاوبەشانەی سەرەوە بەس بێت بۆ ئەوەی بگەینە ئەو بڕوایەی کە (PKK)و (YNK) چوونەتە تای تەرازوویەکەوەو هاوچارەنووسی یەکترن، چاکترە (YNK)یش هەڵویستی خۆی بگۆڕێت و بڕوا بەدیموکراتیەت بهێنێو بگاتە ئەو قەناعەتەی کە کێشەکە بەشەڕ چارەسەر نابێت و چیتر ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتیشی نەکاتە بنکەی تیرۆریستانی (PKK)، چونکە (PKK) نەنوێنەری باکووری کوردستانەو

نەدڵسۆزی کێشەی نەتەوەییشمانە. (YNK) بائاگاداری ئەوەش بێت کە (PKK) لەرابردوو ئێستاشدا (YNK) هەر بەبورژوای بچوك دەزانێ و وەك حیزبێکی هەڵپەرست و ناشۆڕشگێرو خاوەن بڕیاری خۆ نەبوو تەماشای دەکات، (PKK) قبوڵیشی نییە یەکێکی تر لەناوچەکەدا ببێتە هاوشانیو خۆی بەخاوەن هێزو دەسەلات بزانێت، وە ئەگەر (YNK) ڕێگەی ئاشتییانە نەگرێتەبەرو دەست بەرداری (PKK)و سیاسەتی (شەڕ لەپێناو دەسەلات)دا نەبێت، ئەوا وەك (PKK) دابڕاو دەبێت لەکۆمەڵگای سیاسیو هیچ جۆرە تەعامولێکی لەگەڵدا ناکرێت، هەروەك چۆن سەرکردایەتی (PKK) دەیەوێت لەبیقاعەوە ئیدارەی کوردستان بکات ئەو کاتیش (YNK)یش دەبێت لەپشتی سەیرانبەنەوە سەیری کوردستان بکات و لەڕووی ئیقلیمیو نێودەوڵەتیشەوە دوور نییە بەڕەسمی تاوانەکانی شەڕی ناوخۆی هەموو بخرێتە ئەستۆو لەڕیزی تیرۆریستانیشدا حسابی بۆ بکرێت، ئاشکرایە ئەو کاتەش لەڕووی جەماوەرییەوە لەناوخۆو دەرەوەدا زیانێکی گەورەی لێ دەکەوێت.

کەواتە جەولەی چوارەمی شەڕ پێناسەیەکی جیاوازی هەیە لەگەڵ جەولەکانی پێشوتر، چونکە ئەگەر (YNK) و (PKK) بتوانن سەرکەون بەسەر پارتی دیموکراتی کوردستاندا (کە ئەمەش هەرگیز روونادات)، ئایا پەرلەمانی مەنفا شەرعییەتی دەبێت یاخود پەرلەمانی خەڵکی کوردستان، ئایا فیدرالیزم و حکومەتی هەرێم شەرعیەتی دەبێت یاخود فیدراسیونی دیموکراتی؟، ئایا کوردستان ئاوەدان دەکرێتەوە یاخود دەبێتە ناوچەی تێپەڕ بوون و کۆبوونەوەی مافیاکانی جیهان؟ گومان لەوەدا نیە کە سیاسەتی ئیقلیمیو نێو دەوڵەتی ڕێگە بەم جۆرە کارانە نادات و بالادەستی تیرۆریزم لەکوردستاندا خەونێکە هەرگیز نایەتەدیو بەلام دیارە بەسەرکەوتنی تیرۆریستان ئاسۆی سیاسیو ژیانی خەڵکی کوردستان تەواو تاریك دەبێت و چەندین قۆناغ بەرەو پاشەوە دەکشێتەوە، کەواتە دەبێت خەڵکی کوردستان و حیزبە سیاسیەکان پشتگیری لەپرۆسەی ئاوەدانکردنەوەو بنەما خزمەتگوزارییەکانی کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێم بکەن، تاوەکو کێشەی ڕەوای نەتەوەی کورد هەر لەسەر هێڵی دیموکراسخوازانەی خۆی بەردەوام بێت و بتوانێت لەم ڕێگە شارستانیەوە چارەسەرێکی واقیعیانەی کێشەی نەتەوەییمان بکات، لێرەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە جەولەی چوارەمی شەڕ شەڕێکە تیرۆریستان هەڵیان گیرساندووە، بەدژی پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و جەماوەری کوردستان و کێشەی ڕەوای نەتەوەییمان.

* ئەم وتارە لەژمارە (٢٣)ی ڕۆژنامەی میدیا- ڕۆژی ١٩٩٧/١١/١ بلاوکراوەتەوە.

# ((ڕێککەوتنامەی واشنتۆن)) و کۆتایی هێنان بەچەندین قەیران

ئاشکرایە کە بەرهەمی ڕێککەوتنامەی واشنتۆن، کارێکی مەزن و پڕ بایەخ دەبێت لەدیرۆکی نەتەوەی کورددا، جەماوەری کوردستانیش دەبێت ئەو ڕاستییەیان لا روون و ئاشکرا بێت کە دانیشتنە یەك لەدوا یەکەکانی نێوان (پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی) لەنێوان (شەقلاوەو کۆیە)دا، زەمینە خۆشکەربوون بۆ پەیمان بەستن و ڕێککەوتنامەی (واشنتۆن)، بەلاّم ئەوەی کە پرۆسەکەی سەقامگیرتر کردوو ڕەوتی بەرەو پێشچوونی خێراتر کردو متمانەی زیاتری بەخشیە پرۆسەکە، ئەو دەستپێشخەرییە پڕ بایەخەی بەڕێز کاك (مەسعود بارزانی) بوو کە لەرۆژی ١٩٩٨/٨/٢٤ دا وەفدێکی بالاّی لە (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە ناردە سلێمانی بۆ لای جەلال تالەبانی بەم شێوەیەش دەرفەت و ڕێگایەکی باش هاتە مەیدان تاوەکو هیچ ئاستەنگێك لەبەردەم ئەو دەعوەت نامە ڕەسمیە نەمێنێت کە (دیڤید ویلش) بۆ کاك مەسعود بارزانیو جەلال تالەبانی هێنابوو تاوەکو سەردانی واشنتۆن بکەن. لێرەوەش دەبێت خۆ ئامادەکردنێکی پڕ بایەخ هەبێت بۆ ئەو بەرهەمە گرنگانەی کە لەئەنجامی ئەو ڕێککەوتنامەدا دێتە ئاراوەو بڕیاریشە کە بە هەڵبژاردن و ڕێگا چارەی دیموکراتیانە چارەسەری گرفتەکانی رابردوو.. داهاتووی خەڵکی کوردستان بکات.

ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگەو دەتوانێت زیاتریش ڕەوشی داهاتووی کوردستان بخاتە خزمەت پاراستنی حکومەتی کوردستان و بەرەو پێش چوونی ئەزموونە دیموکراتیەکەمان، ئەوەیە کە کەسانی نەتەوەییو ولاّتپارێز بەشێوەیەکی دیراسەکراو سوود لەبارو دۆخەکە وەربگرن و ببنە هێزێکی کاریگەر بۆ ئاراستەکردنی بڕیارە سیاسییەکانی داهاتوو، چونکە لەماوەی شەڕی چوار ساڵەی ناوخۆدا چەندین گرفت و ئاستەنگ لەبەردەم ڕەوتی خەباتی نەتەوەییماندا دروست بوو، کە بەشێوەیەکەی گشتی دەتوانرێت لەچەند خاڵێکدا کۆبکرێتەوەو لەداهاتووشدا هەنگاوی پێویست بۆ چارەسەر کردنیان بدۆزرێتەوە:-

١-دڵەڕاوکێی کەسانی نەتەوەیی:

بەهۆی شەڕی ناوخۆوە، ژمارەیەکی زۆر لەولاتپاریزانی پشت و پەنای بیری نەتەوەیی دووچاری ڕاڕایی‌و دڵەڕاوکێ هاتن و هەموو هەوڵ و کۆششێکیان بۆ ئەوەبوو کە لەگۆڕەپانی سیاسی‌داو بەرانبەر گرفتە سیاسییەکان بێ دەنگ بمێنن و یاخود بەهۆی دروست بوونی ئەو سنوورانەی کە شەڕی ناوخۆ دروستی کردبوو، بەناچاری کەسانی نەتەوەیی ولاتپاریز دووچاری لێك دابڕان و تووندو تیژی هاتن، هەر بەهۆی درێژەکێشانی شەڕەوە بۆ ماوەی چوار ساڵ ژمارەیەکی بەرچاو لەلاوانی کورد کەوتنە سەر ڕێگای خزمەت کردن و پشتیوانی کردنی بیرو بۆچوونە (غەیرە قەومییەکان) کە ئاشکراشە ئەم بەلاڕێدا چوونەی لاوانی کورد ڕەنگدانەوەیەکی سلبی دەبێت لەسەر داهاتووی ڕەوتی خەباتی نەتەوەییمان.

کەواتە دەبێت لەداهاتوودا کەسانی نەتەوەیی بتوانن بەشێوەیەکی زانستیانەو بەپێی واقیعی سیاسی‌و کۆمەلایەتی کوردستان لەهەوڵی بەردەوام بن.

بۆ شیکردنەوەی تێزە فکرییەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستان و وەلامێکی نەتەوەییانەی یەکگرتوو بێننە بەرهەم بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، تاوەکو لاوان و کەسانی ولاتپاریزی کورد، توانا جەستەیی‌و فکرییەکانی خۆیان بخەنە خزمەت بیری نەتەوەیی‌و هاتنە مەیدانی هێزێکی ولاتپاریز بۆ خزمەتی ئەزموونی باشووری کوردستان، چونکە دەبێت لەوە دڵنیابین کە هەمیشە لەبەرانبەر بیری نەتەوەییدا، بیرو بۆچوون و هێزی (غەیرە نەتەوەیی) ئامادەیی هەیەو لەژێر سایەی سیستەمی دیموکراتی‌و فرە حزبی لەکوردستاندا هەوڵی خۆ فراوانکردن دەدەن. واتە لەسەردەمێکدا کە زمانی دیموکراتیانەو گفتوگۆو هەڵبژاردن دەبێتە ڕێگا چارەی کێشەکان، ئاشکرایە کە لەو کاتانەدا دەبێت کەسانی نەتەوەیی بەپێی حەقیقەت و ڕوانینێکی نەتەوەییانە واقیعی کوردستان ئاراستە بکەن، بۆ ئەوەی بیرو ئایدیای (غەیرە قەومی) نەتوانێت ئەو واقیعە ئاراستە بکات، چونکە ئاشکرایە کە تەنها (بیری نەتەوەیی) دەتوانێت لەخزمەت خەڵکی کوردستاندا بێت.

٢-دروست کردن و هاتنە مەیدانی گروپ وڕێکخراوی بەناو نەتەوەیی:

ئاشکرایە لەزەمەنی شەڕی ناوخۆدا چەندین حیزب و گروپی جەماوەری دەرکەوتن و لەهەوڵی ئەوەدابوون کە لەژێر سێبەری بیری نەتەوەییدا گەشە بکەن و دەمامکی نەتەوەییانە هەڵگرن، بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر ڕەوشی کەسانی نەتەوەیی‌و ولاتپاریز بشێوێنن و دووچاری بێ ئومێدییان بکەن و بەلاڕێیاندا بەرن و

بەشێوەیەکی دیراسە کراویش لەهەوڵی کەرت کردن و بڵاوە پێکردنی ڕێکخراوە نەتەوەییەکاندا بوون، چونکە هێزی دژە نەتەوەیی لەکوردستاندا لای روون و ئاشکرا بوو، کە بەیەکبوون و یەکهێزی نەتەوەییەکان دەتوانرێت چارەسەرێکی ئیجابیانەو بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەییمان بۆ کێشەو ململانێ ناوخۆییەکانی کوردستان بدۆزێتەوە. هەروەها خاڵێکی ئیجابیو گرنگی بەرقەرار بوونی ئاشتی لەکوردستاندا ئەوەیە کە چیتر ڕێکخراوو گروپە بەناو نەتەوەییەکان ناتوانن درێژە بەکارەکانیان بدەن و دەمامکەکانی سەر روویان ئاشکرا دەبێت و چیتر ناتوانن بە ئاسانی حەقیقەتەکان ئاوەژوو بکەنەوەو بەپێی بەرژەوەندییە دژە نەتەوەییەکان لێکدانەوە بۆ گۆڕانکارییەکان بکەن، کەواتە رەوشی داهاتووی کوردستان بەشێوەیەك دەبێت کە ئاسان نابێت بۆ هیچ گروپێك کەدرێژە بەژیانی خۆی بدات، ئەگەر بێتوو لەچوارچێوەیەکی تەسکیشدا خۆی حەشار بدات و بەهۆی ئەوەی کە ناتوانێت جەماوەری ولاتپارێز لەخۆ بگرێت، لەهەوڵی ئەوە دابێت کە لەبایەخ و گرنگی جەماوەری بوونەوەو کۆکردنەوەی جەماوەر کەم بکاتەوە، هەر لێرەوەش دەگەینە ئەو بڕیارەی کە گروپ و ڕێکخراوە بەناو نەتەوەییەکان لەژیانی ئاشتیو دیموکراتیدا دووچاری پوکانەوە دەبن و بێ بایەخ دەمێننەوە لەگۆڕەپانی سیاسی کوردستاندا، بەم پێیەش لەناو خۆی کوردستاندا ئاستەنگ و ڕێگرییەکی مەزن لەسەر ڕێگای بیری نەتەوەییمان دووچاری پوکانەوە دەبن و بێ بایەخ دەمێننەوە لەگۆڕەپانی سیاسی کوردستاندا.

٣-PKK لایەنێکی ئاژاوەگێڕی شەڕی ناوخۆ بوو:

سەرەڕای ئەوەی کە لەماوەکانی رابردوودا بەشێوەیەکی بابەتیانە لەرۆژنامەو بڵاو کراوەکانی ژێر سایەی کابینەی سێیەمی حکومەتی کوردستاندا، تیشك خراوەتە سەر کارە ناڕەواو نامرۆڤایەتییەکانی PKKو بەشێوەیەکی لۆژیکانەش بیرو ئایدیا خەیاڵیو بەیەك دژە (متناقض) کانی ناو PKK روون کراوەتەوە، جگە لەوەی تا رادەیەکی بەرچاوو دوور لەخۆ حەشاردانیش PKK زۆر جار لەدەزگا راگەیاندنەکانی خۆیەوە، گەواهی لەسەر کارە تیرۆریستیو ئاژاوە گێڕییەکانی خۆی داوەو بەکارێکی شۆڕشگێڕی لەقەڵەم داون، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە خەڵکی کوردستان بەگشتیو کەسانی نەتەوەیی بەتایبەتی بێزار بوونی خۆیان دەربڕن و PKK بەڕێکخراوێکی بێزارو نامۆ لەقەڵەم بدەن. کەواتە رابردووی PKK لەباشووری کوردستاندا، سەلماندی کە ڕێکخراوێکە زیان بەئەزموونی باشووری کوردستان دەگەیەنێت و

بەئاشکراش شەڕی لەدژی کابینەی سێیەمی خزمەتگوزار هەڵگیرساند، هەر بۆیەش لەرێککەوتنامەی واشنتۆندا بڕیاری پێویست و پڕ بایەخ وەرگیراوە، کە نابێت PKK بوونی هەبێت لەکوردستانی باشووردا، بەپێی ئەم بڕیارە مەزنەش قەیرانێکی تر لەبەردەم خەباتی ڕەوای نەتەوەییمان کۆتایی پێ دێت و چیتر PKKش ناتوانێت هەروا بەئاسانی منداڵ و لاوانی کورد فریوو بدات، لەژێر ناوی (سەربەخۆیی و ئازادی) کوردستاندا. لێرەشدا پێویستە باس لەوردبینی و خەمخۆری پەرلەمان و حکومەتی کوردستان بکەین بۆ ئەزموونە دیموکراتیەکەمان، چونکە هەر لەیەکەم ڕۆژی دەست بەکار بوونی کابینەی سێیەمەوە، بە بەردەوام لەهەوڵ و کۆششدا بووە، بۆ ئەوەی نەتەوەکەمان وشیار بکاتەوە تاوەکو نەکەونە داوی پڕوپاگەندەکانی PKKوە.

بەئاشکراش سیاسەتی نێو دەوڵەتی پشتگیری لەم هەڵوێستەی کابینەی سێیەم کردو بووە خاڵێکی گرنگیش لەرێکەوتنامەی واشنتۆنی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی.

شایەنی باسە لەو سێ خاڵەی سەرەوەدا بەشێوەیەکی گشتی تیشك خراوەتە سەر ڕەوشی ناوخۆی کوردستان و هەوڵدان بۆ خستنە ڕووی خوێندنەوەیەکی نەتەوەییانە، لەبەرانبەر ڕووداوەکانی ڕابردوو، چۆنیەتی ئاراستەکردنی داهاتووشمان.

بەڵام کارێکی بەڵگە نەویستیشە بەهۆی نەمانی شەڕی ناوخۆو جێگیر بوونی ئاشتی لەکوردستاندا، گەورەترین ئاستەنگ دەکەوێتە بەردەم داگیرکەرانی کوردستان (عێراق و تورکیاو سوریاو ئێران)، کە ناتوانن وەك جاران چیتر دەست بخەنە ناو کاروباری خەڵکی کوردستان و بەم شێوەیەش نەتەوەی کورد لەباشووری کوردستاندا، دەبێتە خاوەن بڕیارێکی سەربەخۆو یەکگرتوو، لەهەمان کاتدا دەتوانرێت بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەییشمان چارەسەر بۆ گرفتەکان دیاری بکەین، کەواتە رێکەوتنامەی (واشنتۆن) پەیامێکی پڕ بایەخی بۆ نەتەوەکەمان پێیە. کە بەشێوەیەکی فراوان گۆڕەپانی سیاسی کوردستان لەبەرانبەر بەرژەوەندی و بیری نەتەوەییدا دەکرێتەوەو هەلومەرج و ڕەوشی کوردستانیش لەگەڵ واقیعی کەسانی نەتەوەیی و وڵاتپارێزدا گونجاوو لەبار دەبێت.

* ئەم وتارە لەژمارە (٣٨)ی ڕۆژنامەی میدیا - ساڵی سێیەمی - ڕۆژی ١٩٩٨/١١/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

# ئیسلامی سیاسیو
# ئیسلامی سیاسی لە کوردستان

## هۆکارەکانی پەیدابوونی ئیسلامی سیاسی

دەبینین ئیسلامی سیاسی وەك هێزێکی فکریو سیاسی خۆی لە گۆڕەپانی سیاسی- جەماوەری تەرحکردووە، ئەمەش ئەگەر لەسەر ئاستی ناوچەییو ولاَتانی تری موسلْمان سەیری بکەین، بۆمان ئاشکرا دەبێت کە مێژووی ئەم بزووتنەوە سیاسییانە مێژوویەکی تاڕادەیەك کۆنیان نییەو لەبیستەکانی ئەم سەدەیەمانەوە بوونیان بە شێوەیەکی رێکخراوەیی دەردەکەوێت، واتە حەفتا سالْ زیاترە کە ئایینی ئیسلام بۆ رێگای پاوانکردنی دەسەلاَت و هاتنە سەر کورسی حوکم بەکار دەهێنرێت، حەقیقەتێکیش هەیە کە دەبێت دانی پیادابنرێت ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لەبنەماکان و هۆکارەکانی گەشەی ئیسلامی سیاسی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم تەیارانە قورئان و فەرموودەکانی (محمد- د.خ) بەسەرچاوەیەکی بنەڕەتیو مەرجەعێکی هەمیشەیی خۆیان دەزانن، و ئاینی ئیسلامیش بەگشتی وەك هەموو ئاینەکانی تر (جا چ ئاسمانی یاخود غەیرە ئاسمانی بێت، ئاینێکی نەتەوەیی وەك (کاکائیو یەزیدی..) یاخود نێو نەتەوەیی وەك (ئیسلام و مەسیحیو..) بێت ئاینێکی چاکەخوازەو هەولْی چاککردنی کۆمەلْگا دەدات، جا ئیتر هەر ئاینەو بەپێی سەردەمی خۆی لەهەولْی دارشتنی بەرنامەکانی خۆیدا بووە، لەلایەکی ترەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلام سزاو ترسی بەمرۆڤ نیشانداوە بۆ هەر کارو کردەوەیەکی (غەیرە ئاینی) کە ئەنجامی بدات، ئەمەش بۆتە هۆکارێکی پتەو بەدەست ئیسلامی سیاسییەوە، بۆ شەرعیەت دانێکی خوایو ئاسمانی بەخۆیان و راکێشانی خەلْکی بۆ سەر رێبازەکەیان، بەهەر حالْ لەپاشان دێینە سەر چەند هۆیەکی تر کە بوونەتە هۆکاری گەشەی ئیسلامی سیاسی لەکوردستان بەتایبەتیو لەسەرجەم ولاَتانی تری موسلْمان بەگشتی.

بابزانین بۆچی ئیسلامی سیاسی لەم حەفتا سالەی دواییدا پەیدا بووە؟! خۆ مێژووی بوونی ئاینی ئیسلام و ئیسلام بوونی سەرجەم گەلانی موسلْمان بەگشتی زۆر لەم مێژووە کۆنترە؟! ئاشکرایە کە (خەلافەتی عوسمانی) کە دوا ئیمپراتۆریەت و

خەلافەتی بەناو ئیسلام بوو، کە لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهان بەرەو داڕوخان هەنگاوی دەنا، تا لەساڵی ١٩٢٤ لەسەر دەستی (کەمال ئەتاتورك) بەڕەسمی سیستەمی خەلافەت هەڵوەشێنرایەوەو سیستمێکی شۆڤینی- نەتەوەیی تورکی ئیعلانکرد، دەکرێ لێرەدا چەند هۆیەکی گرنگ لەو هۆیانە باس بکەین کە بووە ڕێگا خۆشکەر بۆ هەڵوەشانەوەو دۆڕانی (خەلافەتی عوسمانی) لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا، لێرەدا ئێمە ئەوەندە لەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی رادەوەستین کە پێوەندی بەباسەکەمانەوە هەبێت و هەوڵ دەدەین نەچینە دەرەوەی چوارچێوەی باسەکەمان.

هەر بۆیە دەتوانین بڵێین یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی هەڵوەشانەوەی (خەلافەتی عوسمانی)، خودی هەیکەل و چۆنیەتی سیستەمی کاری ئەو خەلافەتە بوو، کە بەناوی ئیسلامەوە حوکمی زۆر ناوچەی موسڵمان نشینی دەکردو هەوڵی پەلهاویشتنی دەدا بۆ فراوانکردنی ئیمپراتۆریەتەکەی، کە بریتی بوو لە:

## أ-دەسەلآتداربوونی خێڵی عوسمانی:

ئەم ئیمپراتۆریەتە لەسەرتادا دەسەلآتی تەواو بۆ بنەماڵەی عوسمانیەکان بوو، گەلانی تری موسڵمانیشیان دووچاری زوڵم و چەوسانەوەیەکی زۆر کردبوو.

## ب-بیری تۆرانچێتی:

ئەم بیرە لەسەرتادا مونافەسەو ململانێیەکی ئەوتۆی لەگەڵ سیستەمی خەلافەتدا نەبوو، چونکە هەردوولا بڕوایان بەوە بوو کە دەبێت

گەلانی ژێر دەسەلآتەکەیان بچەوسێننەوە، باشترین نموونەشمان ئەوەیە کە بۆ یەکەم جار لەسەر دەستی دوو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی، کوردستان دابەشکرا، ئەویش لەشەڕی چاڵدێرانی (١٥١٤)ی نێوان (عوسمان و سەفەوی)دا بوو (ئەمە خێرو بێری سوڵتەی خەلافەتی عوسمانی بوو بۆ کوردی مەزڵووم، کە بەداخەوەش تا ئێستا زۆر حەرەکاتی ئیسلامی کوردی شانازی بە ڕۆژانی حاکمیەتی خەلافەتی عوسمانیەوە دەکەن لە کوردستاندا، سەرەڕای ئەوەی کە نەتەوەی کورد پشتگیری لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی کردو دژی سەفەوییەکان وەستا...، بەلآم دواتر عوسمانییەکان هێرشیان کردە سەر میرنشینە کوردییەکان و چەندین سەرهەڵدانی کوردییان سەرکوتکرد و چەندین رابەرو پێشەوای نەتەوەییو موسڵمانمان لەسەر دەستی خەلافەتی عوسمانی شەهید کران.

## ج-هەڵگری بیری ئیسلامی:

ئەم ئیمپراتۆریەتە ئایینی ئیسلامی کردە ڕێبازو تەریقەتی خۆیو سوڵتانی عوسمانیش خۆی وەك (خەلیفەی ئیسلام) پێناسە دەکرد، تاوەکو شەرعیەتێکی ئاسمانی بدات بەو زوڵم و زۆرەی لەگەلانی بندەستی ئیمپراتۆریەتەکەیان دەکرد.

بەڵام دواتر بەهۆی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە، ئەم ئیمپراتۆریەتە شکستی هێناو گەلانی بندەستیش درێژەیان بە خەباتکردندا لەدژی زوڵم و چەوسانەوەی عوسمانییەکان، تا گەیشتنە ئەو رادەیەی زۆربەی گەلان خۆیان لەزوڵمی عوسمانییەکان رزگار کرد، لەو کاتەدا بیری تۆرانچێتی کە باڵێکی بەهێزو داینەمۆی سەرەکی ئیمپراتۆریەتەکەیان بوو، دەستبەرداری بیری ئیسلامگەرایی بوو کە چەندین ساڵ بوو ئەم ئاینەیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان پاوانکرد بوو، بەمەش هەستان بەهەڵگەڕانەوە لەو ئایینەی کە چەند سەدەیەك دەبوو کردبویانە ئایدولۆژیای ئیمپراتۆریەتەکەیان، چونکە تۆرانییەکان زانیان کە چیتر ناتوانن بەهۆی ئاینەوە درێژە بە دەسەڵاتەکەیان بدەن و قەوارەی خۆیان بپارێزن، هەر لەبەر بیری تۆرانچێتیان، سیستمی عیلمانیان گرتە بەر، بەهەر حاڵ لەو کاتەوەی کە خەلافەتی عوسمانی شکستی خوارد، ئیسلامی سیاسی لەهەوڵی ئەوەدایە کە (سیستمی خەلافەت) بۆ سەر حوکم بگەڕێنێتەوەو زۆر جاریش ئەم ئیسلامییە سیاسییانە بەناوی (جیهاد لەپێناوی خەلافەتدا) کاری وەهایان کردووە کە لەگەڵ عادات و بڕوای ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا ناگونجێت، وەك (تیرۆرو هەڕەشەو تۆقاندن و کوشتنی خەڵکی غەیرە موسڵمان..).

یەکەم کاری عەلەنیو ئاشکراش لەم پێناوەدا لەسەر دەستی (حەسەن بەننا) بوو، کە لەساڵی ١٩٢٨وە دەستی پێکرد بەناوی (برایانی موسڵمان- الاخوان المسلمین).. بنەماکانی کاری سیاسیو فکری ڕێکخراوی (برایانی موسڵمان) بووە بناغەو سەرچاوەیەکی گرنگی سەرجەم ئەو دەستەو تاقمانەی کە لەدوای (اخوان المسلمین)ەوە هاتنە مەیدانی کاری ئیسلامی سیاسی، یاخود دەتوانین بڵێین ڕێنماییو بڵاوکراوەکانی (حەسەن بەننا)، تا ڕۆژانی ئەمڕۆشمان وەك سەرچاوەیەکی بەسوودو پیرۆز لەلایەن ڕێکخراوو ئەندامەکانی هەر گروپێکی ئیسلامی سیاسییەوە تەماشا دەکرێت، و لەلایەن گروپی (ئیخوان) بەگشتیو رابەرەکەیان (حەسەن بەننا) بەتایبەتی دەهێنرێتەوە، کە لەرۆژانی حوکمی پاشایەتیو داگیرکاری بەریتانیادا دەیاننواند، تا رادەیەك ئەم گروپە ئیسلامییە لەو سەردەمەدا کاری وەهایان دەکرد کە

بووبوونه جێگەی ناڕازی بوونی سەرجەم نیشتمانپەروەرانی میسر، لەبەر ئەوەی دروست بوونی ڕەوتی ئیخوان موسلمین، ئەوەندەی بەهاوکاریو دەستی بەریتانیاو هاوپشتی شا ی میسر هاتە دامەزراندن و گەشە سەندن، ئەوەندە گروپێکی هەڵقوڵاوی ڕەوشی ئەو کاتی میسر نەبوون، هەر بۆیەش ئەم گروپە تا شۆڕشی ساڵی ١٩٥٢ی میسر، هەمیشە هاوپشت و هاوخەمی ڕژێمی پاشایەتی بوون و بەدژی سیاسەتەکانی سەرجەم ڕەوتە نیشتمانییەکانی ئەو کاتی میسر بوون، هەروەك دکتۆر ڕەفعەت سەعید لەکتێبی "ئیخوان موسلمین لەگەمەی سیاسەتدا، لەلاپەڕە حەوتدا" بەم شێوەیە باسی ئەم گروپە دەکات: (شێخ حەسەن بەننای سەعاتچی گروهی برایانی موسڵمانی وەك گروهێکی ئاینی خێرخواز دروست کرد، بەڵام ئەم گروهە هەر لەگەڵ دروست بوونیدا کە لەشاری ئیسماعیلییەی بنکەی کۆمپانیای کەناڵی سویس گەڵاڵە بوو ڕاستەوخۆ کەوتە بەر سەرنجی ئەو کۆمپانیایەی کە کۆمەڵێك بەرژەوەندی ئیستعماریانەی هەبوو بۆیە ئەو کۆمپانیایە یەکەم لایەن بوو کە کۆمەکێکی نەختینەی پێشکەش بەو گروهە بچوکە کردو گروهەکەش بەو پارەیە توانی یەکەم لقی خۆی لەشاری ئیسماعیلیەدا بکاتەوە) کەواتە ئاشکرایە کە ئیخوان موسلمین لەسەرەتادا چۆن دروست بووە، کە هەر لەسەرەتای دروست بوونییەوە هیچ سۆزێکی نیشتمانی بۆ وڵات و زێدی خۆی نەبووە، ئیتر چۆن بیریاران و هاوەڵانی (حەسەن بەننا) دەتوانن دڵنیایی بدەنە هێزە دیموکراتیو نیشتمانییەکان، یاخود ئەو گومانانە بسڕنەوە، کە مێژووی خەباتی ئیخوان دروستی کردووە، کە لەدوا ڕۆژدا بۆ ئاسایش و ئارامی وڵات دڵسۆزو بەسوود دەبن، خۆ ئەگەر هەر فکرو ئایدولۆژیایەك لەخزمەت ڕەوشی وڵات و هاووڵاتیاندا نەبێت، چۆن ڕێگە بەخۆی دەدات عەقڵ و هۆشی جەماوەرێکی مەزڵووم و بێ دەوڵەتی وەکو کورد داگیربکات.

ئەو هۆکارانەی لەپشت گەشەسەندنی ئیسلامی سیاسییەوەیەن بەهەر حاڵ حەرەکاتی ئیسلامی سیاسی لەماوەی (٧٠) ساڵ ژیان و بەردەوامیدا، سەرەڕای ئەوەی ئەزمونێکی زۆری کاری سیاسیو جەماوەریو ڕێکخراوەییو بازرگانی لەلا کۆبۆتەوە، لەهەمان کاتدا چەند هۆکارێکی ناوخۆیی وڵاتانی موسڵمان و چەند هۆکارێکی جیهانی بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەم ئایدولۆژیایە زۆر بەباشی گەشە بکات و بگرە بگاتە ئەو رادەیەش لەهەندێك وڵاتیشدا حوکمداری بکەن، یاخود ببنە هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی کاریگەر لەناوخۆی ئەو وڵاتە موسڵمانانەدا، کە ئەمەش هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێکی بنەڕەتی کە بریتین لە:

١-پێشتر باسی ئەوەمان کرد، کە گروپی ئیخوان بەهاوبەشی بەریتانیا هاتۆتە دامەزراندن، لەبەر ئەوەی سەرەڕای ئەوەی کە ئیخوان هاوکارو یارمەتیدەری سیاسەتەکانی شای میسر بوو، بەلاّم خاڵێکی لەمەش گرنگتر هەبوو کە وایکرد ئیخوان و رێکخراوەکانی ئیسلامی سیاسی ببێتە لەمپەرێك یاخود دیوارێك لەبەردەم گەشەی بزووتنەوەی سۆسیالیستیو کۆمۆنیستی، کە ئەو کات وتا رووخانی یەکێتی سۆڤیەتیش، لەلایەن سۆڤیەتەوە پشتیوانیو رێنوێنی دەکران، لەبەر ئەوە بەسیاسی کردنی ئیسلام باشترین رێگا بوو چ لەرووی رۆحیو چ لەرووی فکرەوە کە دەیتوانی بەر بەسیاسەت و فکری مادییانەی کۆمۆنیزم و کۆمۆنیستەکان بگرێت، لەم پێناوەشدا زەمەنی ململانێی سیاسی شەڕی ساردی ئەو کاتیش ئەوەی دەخواست، ئەگەر رۆژئاوا یارمەتی دەری ئیسلامی سیاسیش نەبێت بۆ هاتنە سەرکار ئەوا بەدڵنیاییەوە بەدژیشی نەوەستاوەتەوە، هەر بۆیەش وەك وتمان ئیسلامی سیاسی بووە خاوەنی چەندین حزبی سیاسی خاوەن هێزی دارایی گەورە لەناوچەکەدا،و دواتریش لەچەندین شوێن و وڵات بەشداریان لەدەسەڵات و حوکمدا کرد یاخود دەسەڵاتی حوکم حسابی بۆ کردوون، باشترین نموونەشمان دەسەڵات گرتنە دەستی ئیسلامی سیاسی بوو لەساڵی ١٩٧٩ لەئێراندا بەڕابەرایەتی (خومەینی)،و دەرکردن و رووخانی رژێمی پاشەیەتی لەئێراندا، کە لەپشت دەسەڵات گرتنە دەستی ئیسلامییەکانی ئێرانیشدا، ئەمریکا راستەوخۆ پشتگیری لێکردوون، هەروەك لەکتێبی (پێش هەڵوەرین (قبل السقوط)دا، د. فەرەج فودە، لەلاپەرە شەشدا) بەم جۆرە باسی پشتگیری ئەمریکا دەکات بۆ ئیسلامی سیاسیو شۆڕشی ئێران: (لەرووبەروو بونێکدا کە رۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) لەگەڵیدا ئەنجام داوە (مەبەستی لەبرجینسکی سەرۆکی ئاسایشی نەتەوەیی پێشووی بەڕێوەبەرایەتی حکومەتەکەی کارتر بوو نووسەر-) ئەوکاتە بوو کە رووداوەکانی ئێران بەرەو گەرم کردن دەچوو: پێویستە لەسەر (واشنتۆن) کە پیرۆزبایی لەو هێزە ئیسلامییانە بکات کە لەناوچەکەدا بەرەو سەرهەڵدان دەچێت، لەرۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا لەبەر ئەوەی وەك ئایدولۆژیایەك بەربەست لەبەردەم ئەو هێزەی لەناوچەکەدا سەر بەرەوتی یەکێتی شوورەویە).

هەرچەندە ئەم دەسەڵاتە سیاسیەش بەدرێژایی بیست ساڵ حکومداریو تا رۆژانی ئەمڕۆشمان نەیتوانیووە هیواو ئاواتەکانی ئیسلامی سیاسی بەدیبهێنێ، کە ئەویش گەڕانەوەو ئیعلانکردنی سیستەمی (خەلافەت) لەئێراندا،و هەروەها راستتر دوای

هاتنە سەر کاری (محەمەد خاتەمی)ش، ئەم نیزامە زیاتر دەرگاکانی خۆی بەرەو رووی سیاسەتەکانی رۆژئاوادا دەکاتەوە کە سالآنێکی زۆر بوو بەسیستمی کوفرو شەیتانیان دەناساند (ئەمە واقیعێکەو ژیانی سیاسیو رێگاکانی بەردەوام بوونی هەر نیزامێکی سیاسی ئەوە دەخوازێت کە دەرگاکانی خۆی بکاتەوەو واز لە فکری خەلافەت و حکومەتی کرێکاری بهێنێت) لەلایەکی تریشەوە خۆی سەپاندووە، هەروەها نیزامە ئیسلامییە تەقلیدیو خاوەن سەرمایەکانی کەنداوی عەرەبیش لەم مەیدانەدا ئەرکێکی مادی باشیان خستبووە سەرشانی خۆیان چونکە ئەمانیش مەیلیان زیاتر بەلای سیاسەتەکانی رۆژئاوادا بوو نەك سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت، هەروەها حکومەتی پاکستانیش شارێگەی یارمەتی دانی بزووتنەوە ئیسلامییەکانی ئەفغانستان بوو، کە بەدژی حکومەتی سەر بە یەکێتی سۆڤیەتی ئەو کاتی ئەفغان دەجەنگان، کە سەرجەم یارمەتیە داراییو سەربازییەکانی چەکدارانی ئیسلامی ئەفغان لەلایەن رۆژئاوا بەگشتیو ئەمریکا بەتایبەتی دابین دەکرا، سەرەرای ئەوەی کە پاکستان و ئێران بوونە رێگایەکی ئاسان بۆ ئەوەی بەناوی جیهادەوە رێکخراوە ئیسلامییەکانی جیهان خۆیان بگەیەننە ناو خاکی ئەفغانستان و (لەم بوارەشدا ئیسلامییەکانی کوردستان ئەگەر لەئاستی چەند کەسێکیشدا بووبێت بەشداری شەری ئەفغانستانیان کرد، لەکاتێکدا کوردستان زیاتر لەهەر جێگەیەکی تر پێویستی بەجیهادو شۆرشی رزگاریخوازی هەبوو).

پەیدابوونی ئەم چەندین کەناڵ و دەوڵەتە لەجیهاندا، وایکرد ئیسلامی سیاسی زیاتر لەرووی ئیعلامییەوە جەماوەری ببێتەوەو لقی خۆشی لەزۆر ولآتدا بکاتەوە، بۆ نموونە کۆماری ئیسلامی ئێران، تا رۆژانی ئەمرۆشمان هاوکارو هاو پشتی چەندین گروپی ئیسلامی دەکات لەجیهاندا (هەر لەکوردستانەوە تا جەزائیرو تونس و حەماس و حزب الله لەفەلەستین و گروپەکانی ئەفغان و..) سودانیش دەستێکی بالآی هەبووە لەیارمەتی دانی گروپە ئیسلامییە توند رەوەکانی ناو میسر کە سالآنێکە زیان بە داهاتی ئابووریو گەشتوگوزاری ئەو ولآتە دەگەیەنن.. ئەمەو چەندین نموونەی تر، کە وایلێهاتووە لەرۆژانی ئەمرۆماندا رێکخراوی ئیسلامی خاوەن داهات و ئەزموونی وەها دروست ببێت، کە ئەمریکای هاوپەیمانی سەردەمی شەری سار دیان، لەمرۆدا نەتوانێت بەئاسانی خۆی لە یەکێکی وەك (ئوسامە بن لادن)و چەندانی تر بپارێزێت، کە رۆژانێك بووە ئەمریکاو CIA هاوپشت و دارێژەری سیاسەتەکانیان بووە.

هەروەها هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی رۆژهەلآت، بووە پاڵپشتێکی رۆحیو مەعنەوی ئیسلامی سیاسی لەجیهاندا بەگشتی، سەرکەوتنی ئیسلامییەکان لە ئەفغانستانیشدا بەسەر حکومەتی ئەفغاندا، و ئەو گۆڕانکارییانەی کە بلۆکی رۆژهەلآت بەگشتی دووچاری هات دیسان بووە جێی قسەو باس و خوتبەکانی ئیسلامی سیاسیو زیاتر پتەوکردنی عەقیدەو بڕوای ئەندامەکانیان، هەر چەندە لەرۆژانی ئەمڕۆماندا شەڕی نێوان لایەنە ئیسلامییەکانی ئەفغان کە تا دوێنێ هاوپشتی یەکتربوون و ئەمڕۆش بوونەتە دوژمنی یەکتر لەسەر دەسەلآت و حوکمداری لەئەفغانستان دا، کاریگەری خۆی هەیە لەسەر سەلماندنی ئەو قسە باوەی کە دەڵێت (ئیسلامی سیاسی ئەوەندەی خەمی دەسەلآت گرتنە دەستی هەیە، ئەوەندە بەخەمی قورئان و سوننەت و بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە نییە).

٢-ئیسلامی سیاسی وەك ئایدولۆژیایەك خاوەنی چەندین سیفات و خەسڵەتی هاوبەشن، و شێوازی کارکردنیشیان تارادەیەکی زۆر لێك نزیکە،و لەهەر جێگەو ولآتێکیشدا ئامادەییان هەبێت، بەبێ رەچاو کردنی ئاسایشی نەتەوەییو سەروەری ئەو ولآتە بەراستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆ دەبنە هاوپشتی کارو کردەوەکانی یەکتر، زۆر جار دەگاتە ئەو رادەیەیی کە پشتگیری لەو بزووتنەوە ئیسلامیانەش بکەن، کە بەسەدان میل لەسنووری کارکردن و ولآتەکەی ئەمانەوە دوورن،و بەمەرجێك ئەم هاوپشتییەش هیچ سوودێکی بۆ ئاسایشی ئەو ولآت و سنوورە نییە کە تیایدا دەژین و کاری سیاسیشی تیایدا دەکەن، یاخود هەندێك جار پشتگیریو داکۆکی لەخیتاب و کردەوەی رەوتێکی ئیسلامی وەها دەکەن، کە راستەوخۆش زیان بە ئاسایشی نەتەوەیی ئەو میللەتە دەگەیەنێت، لەسەر ئەو نووسینەی سەرەوەشمان، دەتوانین هەر لەو تەجروبە کەمەی کە لەگەڵ ئیسلامی سیاسی هەمانە چەندین نموونەی خێرا بهێنینەوە، هەر لە (پشتگیری حەسەن بەنناو سەید قوتب- و پشتگیریو داکۆکی ئەم دواییەی مەلا سەید ئەحمەد بەرزنجی لەو هەڵوێستە نامرۆڤانەیەی حزبی فەزیلەی ئیسلامی کە بەرانبەر ئەزموون و حکومەتی کوردستان نواندی) کەواتە ئیسلامی سیاسی ئەوەندەی بەخەمی فراوانکردنی دەسەلآت و ئایدولۆژیای خۆیانن، نیو هەندە بەخەمی پاراستنی بنەما قەومیو نیشتمانییەکانی ئەو ولآتانە نین کە تیایدا دەژین.

٣-ئاینی ئیسلام خاوەن مێژوو کەلەپورێکی دێرینەو سەرجەم گەلانی بەموسڵمان بوو بەپێی تێپەڕ بوونی کات، توانیویانە خۆ لەگەڵ بنەما پیرۆزەکانی ئیسلامدا بگونجێنن،و ئەوەندەی لەتواناشیاندا هەبووبێت، هەر نەتەوەیەك لەلای خۆیەوە

خزمەتی ئەم ئاینەی کردووە،و نەتەوەی کوردیش بەشێکی پڕ شانازیو پرشنگداری لەمێژووی ئیسلامدا هەیە، بەلاّم ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە کە ئیسلامی سیاسی بەدرێژایی تەمەنی خۆی، هەوڵی داوە کەلەپوورو مێژووی ئیسلام بۆ خۆی داگیر بکات و بیکاتە موڵکی خۆیو خۆیشی بەدرێژە پێدەری ڕێبازی واقیعییانەی ئیسلام لەقەڵەم بدات، کەچی بەهۆی کارو سیاسەتی ئیسلامی سیاسییەوە، هەرچەندە کە نەیتوانیووە ئەو کارە بکات و تەنانەت تا ئەمڕۆش نەیتوانییوە خۆی تێکەڵ و وابەستەی مێژووی ئیسلام بکات، بەڵکو مێژووی ئیسلام و مێژووی (ئیسلامی سیاسی) وەك دوو ڕێبازی لێك جیاواز لەلایەن خەڵکییەوە تەماشا دەکرێت، چونکە ئامانجەکانی ئاینی ئیسلام و ئیسلامی سیاسی لێك جیاوازن، بۆ نموونە ئیسلامی سیاسی خۆی بەشەرعیترین ڕێباز دەزانێت و هەموو موقەدەساتەکانی ئاینی ئیسلامی بۆ خۆی داگیرکردووەو داوای ئەوەش دەکەن کە دەبێ دەسەلاّتی حوکم حسابیان بۆ بکات، لەکاتێکدا ئەوان حساب بۆ بیروڕاو موقەدەساتی ئاینەکانی تر ناکەن، لەراستیشدا تەنیا ئاین کە لەرۆژهەلاّتی ناوەڕاست و دونیادا کاریگەری هەبێت تەنیا ئاینی پیرۆزی ئیسلام نییە، بەڵکو ئاینی (مەسیحیو- یەهودی) لەرووی سیاسیو نێو دەوڵەتیو جەماوەریشەوە کاریگەری خۆیان هەیە،و نابێت ئەم حەقیقەتانە لەیاد بکەین، بەلاّم ئەو ململانێیەی لەناوچەکەشدا هەیە ململانێیەکی ئاینی نییە بۆ نموونە کێشەی نێوان (ئیسرائیل- فەلەستین) ئەوەندەی سیمایەکی نەتەوەیی وەرگرتووە، ئەوەندە کێشەی نێوان دوو ئاینی لێك جودایی (ئیسلام- یەهودی) نییە، دەبینین ئەمڕۆ هەردوولا هەر خاوەنی هەمان ئاین و عەقیدەی خۆیانن، بەلاّم لەبەر ئەوەی کە بەرژەوەندی بالاّی نەتەوەییو نیشتمانیو سیستمی نێودەوڵەتی وا دەخوازێت کە ئاشتی لەناوچەکەدا بچەسپێت، سەیر دەکەین ئیتر توندو تیژی مەزهەبی ئەو کاریگەرو حەماسەی جارانی نامێنێت، کە تووند ڕەوێکی جولەکە بەناوی (شعب الله المختار)و حەماسی فەلەستینیش بەناوی (وقاتلوا فی سبیل الله..) بتوانێت پشێویو ئاژاوە بنێتەوە، کەواتە ململانێیەکانی ئەمڕۆی جیهان بەگشتیو رۆژهەلاّتی ناوەڕاست بەتایبەتی، لەسەر جیاوازی عەقیدەو ئایین و مەزهەب نییە، و بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندی نەتەوەییدایە،و ئاینیش بۆتە ئامرازێك یاخود ئەداتێك بەدەستی سیاسەتمەدارانەوە بۆ زیاتر کۆکردنەوەی رای گشتی بۆلای بەرنامە سیاسیەکانی حزب و حکومەتەکانیان.

٤-بەشێوەیەکی گشتی رەخنەگرتن لەئیسلامی سیاسی، رەخنەیە لەسیاسەت و هەڵسووکەوتی رۆژانەیان، کە زیاتر بریتیە لە (ئیجتهاد) و بۆچوونی (ئەمیرەکانیان) یاخود ئەو کەسانەی کە هێڵی سیاسی بزووتنەوەکە دادەڕێژن، واتە ئەم رەخنانە واقیعی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و قورئان و سوننەت ناگرێتەوەو دەبێت لێکیان جودا بکەینەوە، هەر بۆ نموونە ئەوەندەی نەفسیەتی رابەرەکانی ئیسلامی کاریگەری هەیە لەسەر رێچکەی سیاسەتەکانیان، کەمتر (قورئان و سوننەت) کاریگەری هەیە یاخود هەر رەوتێکی ئیسلامی سیاسی (بەهۆی فراوانی ئاینی ئیسلامەوە) پشت بەچەند ئایەت و حەدیسێك دەبەستێت کە لەگەڵ ئاستی دەروونیو فکری کۆمەڵەکەیدا دەگونجێ، هەر بۆیەشە ئیسلامی سیاسی لەچیچان و کوردستانیشدا، دابەشی سێ هێزو رەوت دەبن، کە هەر یەکەیان شێوازی کارو کردەوەیان لەوانی تر جودایە، کە بریتین لەهێزێکی نەرم و ئیصلاحی، هێزێکی توندڕەو، هێزێکی بازرگان.

## ا-هێزێکی نەرم و ئیصلاحی:

ئەمە هێزێکە ئەوەندەی بۆی بکرێت خۆی لەتووندو تیژیو شەڕ بەدوور دەگرێت،و دەیەوێت لەرێگەی کاری رێکخراوەییو جەماوەرییەوە بگاتە سەر کورسی دەسەڵات، بەڵام ئەزموونی کار لەگەڵ ئیسلامی سیاسیدا بەگشتی ئەوەی دەرخستووە، هەرکاتێك ئەم رەوتەش گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دەتوانێت بەزەبری هێز دەسەڵات بگرێتە دەست، ئەوا دەست دەداتە چەك و بەناوی (جیهاد)ەوە هەوڵی داگیرکردنی دەسەڵات دەدات.

## ب-هێزێکی تووندڕەو:

بڕوایان بەوەیە کە بیروڕاکانیان تەنیا چەك و شەڕکردن دەتوانێت بیپارێزێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەفسیەتی جوڵێنەرانی ئەم هێزو رەوتانە، کە بڕوایان وایە تەنیا بەزەبری چەك دەتوانن گرفت و کێشە (سیاسیو فکریو ئابوری)یەکانی پێش خۆیان چارەسەر بکەن، چونکە هەموو چارەکانی تر (بەپێی بیروڕای ئەمان) گەیشتۆتە بنبەست.

## ج-هێزێکی خاوەن سەرمایە:

ئەم هێزە بەناوی کردنەوەی مزگەوت و بەخێوکردنی منداڵانی بێ دایك و باوك و کاری خێرخوازی تر. روودەکاتە ئەو وڵاتانەی کە پێویستیان بەم جۆرە هاوکارییە هەیە،و سەرمایەکی خۆیانی تیا دەخەنە گەڕ، بەڵام لەپشت ئەم کارە خێرخوازانەوە،

دەست دەکەن بە کۆکردنەوەی خەڵك و ئەنجامدانی کاری سیاسی‌و پشتگیریکردنی ڕەوت و هێزە ئیسلامییەکان، وەك بوونی ڕێکخراوی (هيئة الاغاثة الاسلامية العالمية) لەباشووری کوردستاندا، کە دەورێکی کاریگەریان هەبووە لەهاوکاری کردنی (یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان) کە لەساڵی ١٩٩٤ دامەزراوە، هەر چەندە لەکوردستان چاککردن و کردنەوەی مزگەوت کارێکی خێرو چاکە خوازییەو هەروەها کردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەش هەر دەچێتە خانەی خێرو چاکەو خزمەتکردنەوە، بەڵام ڕێکخراوە خێر خوازە ئیسلامییەکان زیاتر بایەخ بەمزگەوتەکان دەدات، کە لەراستیدا ئەگەر مەبەستی سیاسی لەپشتەوە نەبێت ئەوا بەپێی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و فەرموودەی محمد (د.خ) هەر شتێك سەرچاوەی بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری‌و خزمەتی خەڵك بێت، ئەوا بەکاری خێر دادەنرێت، هەروەك محەممەد دەفەرموێت: (اطلبوا العلم ولو كان في الصين) بەڵام هێزی ئیسلامی خاوەن سەرمایە بایەخێکی ئەوتۆی بەقوتابخانەکان نەداوە، ئەوەندەی کە بایەخی بەگەشەی ئیسلامی سیاسی داوە لەو شوێنانەی کە بارەگای لێکردوٚتەوە.

لەراستیشدا ئیسلامی سیاسی بەگشتی بەهەر سێ هێزەکەیەوە، لەکاتی پێویستدا دەبنە هاوپشت و هاوکاری یەکتر، بەڵام مەرجیش نییە هەموو جارێك بتوانن جیاوازییە فکرییەکانی نێوانیان لەیاد بکەن، بەڵکو هەندێك جار لەکاتی سەرکەوتنیاندا بەسەر نەیارەکانیاندا، ئەوا دەست دەدەنە چەك و شەڕکردن لەدژی یەکتر وەك ئەوەی لە(ئەفغانستان) ڕوویداو تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە بەهەر حاڵ بوونی ئەم سێ ڕەوتە ئیسلامییە لەهەر شوێنێکدا، شێوازو شکڵێکی سەرتاپاگیر بە ئیسلامییەکان دەبەخشێت و وایان لێدەکات کە جەماوەر کۆبکەنەوە (سەرەڕای جیاوازی سایکۆلۆژی کەسەکان).

٥-ململانێی نێوان (عەرەب- ئیسرائیل)و شەڕی ١٩٦٧ی نێوان عەرەب و ئیسرائیلیەکان وایکرد کە ڕەوشێکی گونجاو بۆ ئیسلامی سیاسی بێتەکایەوە، تاوەکو داوای هاتنە ریزی عەرەبەکان بکات بۆ سەر ڕەوتی ئیسلامی سیاسی،و هۆی دۆڕاندنی عەرەبیان لەشەڕی ١٩٦٧ دەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە ئیسرائیل بە پەیوەستی‌و وابەستەییان بەئاینی یەهودییەوە توانیان بەسەر عەرەبدا سەربکەون و، تاکە چارەسەری عەرەبیش ئەوەیە لەپێناو سەرکەوتنیدا ئاینی ئیسلام بکاتە ڕێبازی سیاسەت و ئایدولۆژیای خۆی، ئەمەش وایکرد کە ئیسلامی سیاسی لەڕێگەی بەکارهێنانی ئەو شکستە نیشتمانی‌و نەتەوەییەی عەرەب بەسەریدا هات، ڕێگە بۆ

خۆی خۆش بکات کە ئایدولۆژیاکەی وەك (امر واقع) تەرح بکات، بۆ چارەسەرو تیماری شکستەکانی نیشتمانی عەرەبی. تا رۆژانی ئەمڕۆشمان ئیسلامی سیاسی هەوڵدەدات کێشەی (عەرەب- ئیسرائیل) بخاتە خزمەت گەشەسەندنی ئایدولۆژیاکەی خۆی، هەروەك پێشتریش باسمان کرد ئەم کێشەیە کێشەیەکی نەتەوەییە، نەك ئایینی.

٦-ئیسلامی سیاسی لەبەر ئەوەی بەرنامەی خۆی بە بەرنامەیەکی ئیلاهیو پیرۆز دەزانێت، زیاتر لەهەر حیزبێکی تر هەوڵ دەدات و حەق بەخۆی دەدا، کە بەهەر شێوەیە بێت بۆ دواجار بەبەردەوامی حوکمی خەڵك بکات، هەر بۆیەش لەبەرنامەیدایەو بە ئەرکی سەرشانی خۆشی دەزانێت کە سیستمی دیموکراتی- عیلمانی هەڵبوەشێنێتەوەو لەناوی ببات، هەر لەبەر ئەوەشە لەزۆر وڵاتدا کاری ئیسلامی سیاسی قەدەغەکراوە، چونکە هیچ سیستم و دەسەڵاتێك ڕێگە بەلایەنێك نادات کار لەوڵاتەکەیدا بکات کە بەئاشکرا ئیدعای لەناوبردنی بکات، هەروەها هۆی کاری توندو تیژی ئیسلامی ئەوەیە، کە ئەوەندەی ئیسلامی سیاسی هەوڵی لەناوبردن و هەڵوەشانەوەی سیستمی دیموکراتی دەدات، نیو هەندە هەوڵی ژیانکردن و خۆ گونجاندن لەگەڵیدا نادات بەمەرجێك دڵنیا بێت لەوەی کە دەتوانێت کۆنترۆڵی ڕەوشی وڵات بکات و زاڵ بێت بەسەر بەرگری هێزە دیموکراتیەکاندا، کەواتە ئیسلامی سیاسی غەیری سیستەمەکەی خۆیان، هیچ دەسەڵات و فکرێکی تریان قبوڵ نییە، جا ئەو فکرەو نیزامە (دیموکراتی یاخود دیکتاتۆری بێت)، هەروەها لەبەر ئەوەی ئیسلامی سیاسی ناتوانێت تا سەر خۆی لەگەڵ دەسەڵاتدا بگونجێنیو ناشتوانێت گومانەکانی دەسەڵات لەسەر خۆی لا ببات، و بەراستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆش هەمیشە دژی دەسەڵاتە (بەمەرجێك ئیسلامی نەبێت)، ئەگینا خۆ ئەو هەموو دەسەڵات و حوکمەی دونیا خراپ نییە، کە نەتەوەو گەلانی خۆیان ئیدارە دەکەن و زۆربەشیان میللەتانی خۆیان ئازادانە هەڵیان دەبژێرن، لەبەر ئەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە ئیسلامی سیاسی لەگەڵ عەقڵ و بیری سەردەمدا ناتەبایەو ناتوانێت خۆی بگونجێنێت.

سەرەڕای ئەو ڕەخنانەش ئیسلامی سیاسی هەوڵی پیرۆز کردنی بەرنامەکەی داوە،و کارە توندو تیژیەکانیشیان ڕەوشێکی وایخوڵقاندووە، کە (ترس و دڵەراوکێ) بخەنە دەروونی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت قسەیەك لەسەر ئایدولۆژیای ئیسلامی سیاسی بکەن، و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە لەزۆر جێگادا نەتوانرێت ڕاشکاوانە

ئیسلامی سیاسی وەك فكرەكانی تر بخرێتە ژێر تیشكی رەخنەو لێكۆڵینەوەی نەیارەكانیان،و لە ئەنجامیشدا بەئاسانتر لەفكرەكانی تر دەتوانن جەماوەر بۆلای خۆیان راكێش بكەن. ئەو خاڵانەی سەرەوە بەگشتی چەند خاڵێكی بنەڕەتی بوون، كە بوونەتە سەرچاوەو هێزی پاڵپشت بۆ گەشەكردنی ئیسلامی سیاسی، جا ئەو ئیسلامییە لەهەر شوێنێك بێت، كەمتا زۆر راستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆ، ئەو خاڵانەی سەرەوە بەشدارییەكی گرنگی هەیە لەبەرنامەو پێڕەوی ئیسلامییەكاندا لەپێناو زووتر گرتنە دەستی دەسەلاتدا، یاخود راستتر دەتوانین بڵێین لەڕابردوودا ئیسلامی سیاسی لەو رێگایانەوە گەشەی كردووەو ئەمڕۆش بۆتە ئەزموونێكی باش بۆ گەشەی ئەو هێزانەی لەملاو لەولای جیهانی ئیسلامیدا دروست دەبن.

## چەند رەخنەو ووتەیەك لەسەر ئیسلامی سیاسی كوردستان

لەبەر ئەوەی ئیسلامی سیاسی لەكوردستاندا هەڵقوڵاو وابەستەی ئیسلامی دەرەوەی كوردستانە، كەواتە دەكرێت بڵێین ئەو رەخنەو سەرنجانەی پێشوومان، كەم تا زۆر، راستەوخۆ یاخود ناراستەوخۆ، ئیسلامی سیاسی كوردستانیش دەگرێتەوە یاخود كاریگەری خۆی لەسەر ئیسلامییەكانی كوردستانیش هەیە، بەلام لەبەر ئەوەی كوردستان لەبەرانبەر ئەم ئایدولۆژیایەدا یاخود بەسیاسی كردنی ئاینی ئیسلامدا مێژوویەكی ئەوەندە درێژی نییە،و چەند ساڵێك دەبێت لە گۆڕەپانی خەباتی رزگاریخوازیماندا بەدەر كەوتوون هەر لەبەر ئەمەش نووسراو لێكۆڵینەوە لەسەر واقیعی ئیسلامی سیاسی كوردستان كەمەو سەرچاوەو كتێبیش كەمتر، كەواتە دەبێت پشت بەو سەرچاوانە ببەسترێت كە لەسەر ئایدولۆژیای ئیسلامی سیاسی بەگشتیو چۆنیەتی سەر هەڵدانی نووسراوە، بەلام چەند رەخنەیەك هەیە كە لەوانەیە تایبەت بێت بەواقیعی كوردستان، یاخود بەپشت بەستن بەئەزموونی (ئیسلامی) شوێنانی تر، ئیسلامییەكانی كوردستان ئەم كارانە دووبارە دەكەنەوە هەروەها لەروانگەی بڕوابوونمان بەئازادی رەخنەو نووسین، دەستمان بە نووسینی سەرنجەكانمان كردووە، لەسەر ئایدولۆژیاكانی سەر خاكی كوردستان، و ئیسلامی سیاسیش چونكە لەهەوڵی دەسەلات گرتنە دەستدایە، كەواتە دەبێت قبوڵی ئەوەش بكات كەمو كوڕییەكانی دەربخرێت و رەخنەشی ئاراستە بكرێت و وەك سەرجەم حزب و ئایدولۆژیاكانی تر بخرێتە ژێر تیشكی رەخنەو لێكۆڵینەوە، بێ ئەوەی كە پیرۆزی ئاینی ئیسلام رێگەمان لێبگرێت:

١-راگەیاندن وەك شێوازێکی هەمە چەشن و فراوان لەلایەن ئیسلامی سیاسییەوە بەکار دەهێنرێت، ئەگەر حیزب و فکرەکانی تر تەنیا (رۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆن و رادیۆ) یان هەبێت، ئەوا ئیسلامی سیاسی هەوڵ دەدات (مزگەوتەکان و خوتبەدانی سیاسی لەکاتی تازیەدا) بۆ مەبەستی خۆیان بەکار بهێنن، سەرەڕای ئەوەی کە چەندین (کاسێت)ی پڕکراوە بەفکری ئیسلامی سیاسی بڵاو دەکەنەوە بەناو جەماوەردا، کە زۆربەیان خزمەت بەڕەوشی ئێستاو ئاسایشی نەتەوەییمان ناکات، مەبەست لەبڵاوکردنەوەی ئەم کاسێتانەش، کە بەگووتاری ئەمیرەکانی ئیسلامی سیاسی پڕ کراوەتەوە، ئەوەیە کە ئەو مەبەست و ئامانجە سیاسییانەی کە ناتوانن لەمزگەوتەکان و کەناڵەکانی راگەیاندنەوە بەئاشکرا رایبگەیەنن ئەوا لەڕێگەی ئەم کاسێتانەوە بڵاوی دەکەنەوە،و ئەگەر قسەشی لەسەر بکرێت مەرج نییە، هیچ لایەنێکی سیاسی راستەوخۆ خۆی بکاتە خاوەنی گوتارو خیتابێکی لەو جۆرە.

٢-ئەگەر پرسیارێك لەئیسلامی سیاسی کوردستان بکەین، کە ئایا بۆچی تائێستا وڵاتانی موسڵمان پشتگیری کێشەی ڕەوای نەتەوەییمانیان نەکردووە، و بەڵکو بەشێوەیەکی گشتیش باسی ئەو کارەسات و جینۆسایدانەیان نەکردووە، کە بەسەر نەتەوەیی کوردی موسڵماندا هاتووە، و دەتوانین بڵێین کە پشتگیریو هاوپشتی یەکتریان کردووە بۆ تاواندنەوەی نەتەوەی کورد، چونکە ئەو چوار وڵاتەی کە کوردیان بەسەر دابەش کراوە، هەر چواریان (عێراق و تورکیاو ئێران و سوریا) وڵاتانی سەر بەجیهانی ئیسلامین، لەوانەیە ئیسلامی سیاسی بەم شێوەیە وەڵامی ئەو پرسیارەمان بداتەوە (کە ئەو وڵاتانە سیستمی حوکمیان غەیرە ئیسلامییەو سەر بە رەوتی علمانین) بەڵام خۆ شەپۆلی ئیسلامی سیاسیو رێکخراوە ئیسلامییەکان کە بەشێکی زۆریان حزبی ئۆپۆزسیۆنن و ئۆپۆزسیۆنیش بەگشتی سروشتی کارکردنی وەهایە کە پشتگیریو هاوپشتی خۆی بۆ هەموو زوڵم و ناحەقییەك دەردەبڕێ لەپێناو کۆکردنەوەی جەماوەردا تاوەکو دەگاتە دەسەڵات، کەچی بەداخەوە حزبە ئۆپۆزسیۆنە ئیسلامییەکان جیاواز لەهەر ئۆپۆزسیۆنێکی تر تائێستا لەبەرانبەر ئەو کارەساتانەی کەبەسەر نەتەوەی کوردی موسڵماندا هاتووە بێدەنگ بوون و هەندێ جاریش دژایەتیان کردووە، کە لێرەدا چەند نموونەیەك دەهێنینەوە بۆ نموونە: لەو بەیانەی (محەمەد حامد ئەبونەسر) مورشیدی گشتی (الاخوان المسلمین) دەریکرد لەبەرواری ١٩٩١/٤/٢٧دا، لەئاکامی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژ بەگەلی کورد لەلایەن (سەدام)ەوە لەبەهاری ١٩٨٨دا، ئەم بەیانە دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ

بەسەر کارەساتی هەڵەبجەدا لەلایەن (اخوان)ەوە راگەیاندرا.. (ابو نصر) لەم راگەیاندراوەیدا گەلی کورد تاوانبار دەکات بەوەی ئەوان لەلایەن ئیمپریالیزمەوە هاندراون، کە بەم بزووتنەوە جیا خوازییە هەڵبستن لەناو عێراقدا)- کوردانی سەرگەردان و برا موسوڵمانەکانیان، د.جەمال نەبەز- ل٥٥و ٥٦- هەروەها لەرۆژنامەی (راپەڕینی ئیسلامی) کە زمانحاڵی بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامی لەجەزائیرەو لەژمارە ١٤ی بەرواری ١٩٩١/٥/١٧ وتارێکی بڵاوکردۆتەوە، کە لەنووسینی (ابو بلال)ە، لەوتارەکەیدا کێشەی کورد بە پیلانی رۆژئاوا دادەنێت بۆ دابەشکردنی عێراق،و راستەوخۆش پشتگیری لەڕژێمی سەدام دەکات. (کوردانی سەرگەردان و.. د.جەمال نەبەز، ل٥٨) ئەو دوو نموونەیەی سەرەوە هەڵوێستی دوو رێکخراوی بەهێزی ئیسلامی سیاسی بوو لەسەر کێشەی نەتەوەییمان، کە دەتوانین چەندین نموونەی بەڵگەداری تر لەو بابەتە بهێنینەوە، کە دەمانگەیەنێتە ئەو بڕوایەی کە ئیسلامی سیاسی چ حوکمدارو چ ئۆپۆزسیۆن بەشێوەیەکی گشتی دژی مافی رەوای نەتەوەیی کوردن، ئەو پشتگیرییەش کە هەبێت وەك لە هەڵوێستەکانی (موعەمەر قەزافی)دا دەردەکەوێت، ئەوا بەسەراپای وڵاتانی ئیسلامی لەچەند نمونەیەکی کەم تێپەڕ ناکات، کەچی ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان و ڕامانە، ئەوەیە کە ئیسلامی کوردی لەلایەن خودی ئەو رێکخراوو دەوڵەتە ئیسلامییانەی باسمان کردن هاوکاریو هاوپشتی دەکرێن..؟ هەر بۆیەش تائێستا ئیسلامی سیاسی کوردستانی نەیانتونیوە، شتێکی ئەوتۆو دیار بۆ نەتەوەکەمان بەدەست بهێنن لە گۆڕەپانی وڵاتانی ئیسلامیدا، بۆ نموونە (رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین ئەندامی کۆنگرەی ئیسلامییە لەگەڵ دەوڵەتی تورکی قوبرس کە جیا لەدەوڵەتی تورکیا یەك وڵات باوەڕی پێ نەهێناوە، بەڵام کوردستان و گەلی کورد هیچ ناوێکیان لەم رێکخراوە ئیسلامییانەدا نییە) کوردانی سەرگەردان و برا موسوڵمانەکانیان.. ل١٦.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەسەپێنیو وەڵامەکەشی بۆ خوێنەران بەجێ دێڵین، ئایا ئیسلامییە سیاسییەکانی کوردستان نایانەوێت لەدژی بەرژەوەندی داگیرکارانی کوردستان هەڵسوکەوت بکەن، لەپێناو ئەوەی وڵات و رێکخراوە ئیسلامییەکانیان لێنەرەنجێت؟ یاخود ئیسلامی وڵاتانی تر لەبەر هەستی شۆڤێنیو رەگەز پەرستیان دان بە ئیسلامیەکانی کوردستاندا نانێن؟ ئەگەر ئیسلامییەکانی وڵاتانی تر دان بە رەوتی ئیسلامییەکانی کوردستاندا نەنێن، بۆچی ئیسلامییەکانی کوردستان هەمیشە بەشان و باڵی ئیسلامییەکانی وڵاتانی تردا هەڵدەدەن.

٣-ئیسلامی سیاسی کوردی سەرەڕای ئەوەی کە نەیتوانیوە لەئاستی دەرەکیدا هاوسۆزیو پشتیوانییەکی پێویست بۆ گەلانی کوردستان دەستە بەر بکات، کەچی لەئاستی ناوخۆیشدا هەوڵ دەدات، لەو کاتەوە باسی کوردو مێژووەکەی بکات کە بۆتە ئیسلام، بەمەرجێك مێژووی زێڕین و پڕ شانازی کوردان لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی میدیا وەدەست پێ دەکات، واتە (١٢٠٠) ساڵ پێش هاتنە خوارەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

٤-هەروەها بوونی چەندین گروپ و حزبی ئیسلامی لەکوردستاندا، وایکردووە کە لەڕووی سیاسیشەوە نەتوانن، دڵنیاییو سەقامگیری بە جەماوەر ببەخشن، چونکە کێ دەتوانێت ئەو دڵنیاییەمان پێببەخشێت کە ئیسلامییەکانی کوردستانیش (لەحاڵەتێکدا ئەگەر عیلمانییەکانیش نەبن) لەناوخۆدا هەمان تەجروبەی شەڕی ئەفغانستان دووبارە ناکەنەوە؟

بەهەر حاڵ ئەو وتارەی سەرەوە، چەند روونکردنەوەیەك بوو لەسەر چۆنیەتی سەرهەڵدان و مێژووی ئیسلامی سیاسیو لێکدانەوەی هەڵسوکەوت و ئاکارەکانی (ئیسلامی کوردستان)، کە هیواخوازین ئیسلامی سیاسی کە لەواقیعی کوردستاندا دەژین، بەپێی بەرژەوەندییەکانی باشووری کوردستان کار بکەن و بتوانن بەشێوازێکی سەردەمانەو بەبێ گوێدانە سیاسەتی داگیرکەران، ئاینی ئیسلام بخەنە خزمەت کێشەی رەوای نەتەوەییمان، چونکە هەروەك ئاشکرایە ئاینی ئیسلام بۆ خزمەتی بەشەریەت و خەڵکانی مەزڵووم هاتووە،و نەتەوەی کوردیش بەشێکە لەمرۆڤایەتیو مافی خۆیەتی زوڵم و چەوسانەوەی لەسەر نەمێنێت.

## سەرچاوەکان:

١-ئاین و شیکردنەوەی دەروونی، ئەریك فرۆم. وەرگێڕانی ئاوات محەمەد. چاپی یەکەم ١٩٩٩.
٢-ئیخوان موسلمین لەگەمەی سیاسەتدا، د.رەفعەت سەعید، وەرگێڕانی ئیهاب رۆشنا. چاپی یەکەم ١٩٩٨.
٣-کوردانی سەرگەردان و برا موسڵمانەکانیان، پرۆفیسۆر جەمال نەبەز، زستانی ١٩٩٨.
٤-پێش هەڵوەرین، د.فەرەج عەلی فودە، وەرگێڕانی سین چیا.
٥-ئیرهاب، د.فەرەج عەلی فودە، وەرگێڕانی نەهرۆ هەینی، چاپی یەکەم ١٩٩٩.
٦-گۆڤاری نەهج، ژمارە (١٨)ی بەهاری ١٩٩٩، وتاری (الغاء الخلافة ونشوء الحركة الاسلامية المعاصرة) نووسینی محەمەد جەمال باروت، لاپەڕە ٩٦.

* ئەم بابەتە لەژمارە (٢و ٣)ی گۆڤاری سەرخۆبوون- پایزی ١٩٩١- زستانی ٢٠٠٠ بڵاوکراوەتەوە.

# سەرنجە بەجێماوەکانی شەهید سەربەست سەبارەت بەئیسلامی سیاسی *

ئیسلامی سیاسی، بناغەی ژیان بێگومان دەکات (بەئێستاو دوایی)، بەلاّم سیستەمی عیلمانی واقیعییە (دونیا گومان و پرسیارە) لەپەیوەندی و بەرژەوەندییەکان.

ئیسلامی سیاسی لەکوردستاندا، کاتێك بڕیارێك وەردەگرێت، سەیری رەوشی کوردستان ناکات، بەڵکو سەیری ئەوە دەکات کە ئایا تا چەند ئیسلامی جیهانی لەو بڕیارە رازیدەبن. هەربۆیە زۆرجار دروشمی ناکوردی بەرزدەکەنەوەو هەڕەشەی ئەوە دەکەن (کوردستان دەکەینە جەزائیرو ئەفغانستان و ) هەروەها پشتگیری حزبی رەفای تورکییان کردو ئێستاش پشتیوانی فەزیلە دەکەن، کە حزبێکی بەشداری تورکییە لەدژایەتیو بێمافکردنی کوردان لەباکووری کوردستاندا. ئەم هەڵوێستە ئەگەر لەڕووی سیاسییەوە سەیربکەین، پاشکۆیەتی و نارۆشنی عەقلی سیاسی ئەو کەسانە دەگەیێنێ و، لەرووی دینیشەوە پێچەوانەی بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامە کە زوڵم و چەوسانەوە قبوڵ ناکات.

ئیسلامی سیاسی وادەزانی بوونی زەرووره، کە لەسایەی نیزامی ئامادەدا (چ دیموکراتیو چ غەیری دیموکراتی) رێگەی پێدرا ئەوا نەرمی دەنوێنێ، دەنا ئەگەر رێگەی لێگیراو شکستی خوارد لەبەرانبەر نیزامی ئامادەدا ئەوا دەمارگرژی ئاینی پیادە دەکات و شەرعییەتی پێدەدا.

با رێگە بەکەس نەدرێ لەکوردستاندا کاری نایاسایيو بڕیاری نایاسایی دەربکات بەبیانووی ئەوەی یاسای ئاسمانی دەگەڕێنێتەوە سەر زەوی، چونکە بینیمان ئیسلامی سیاسی لەجێگاکانی دەمارگیریو ئاژاوەیان بەرپاکردو کاری تیرۆرییان شەرعییەت پێداو کەچی دواتر کۆمەڵگاکانی خۆشیان نائومێدو سەرگەردان و دووچاری ترس کردو لەئەنجامدا بەهۆی ناجێگیریو ئاژاوەکەوە یاسا ئاسمانییەکانیشیان لەبیرخۆیان و خەڵکیش بردەوە، چونکە ئەوان (ئیسلامی سیاسی) خۆیان بەنوێنەرو پیادەکاری ئەمری خوا دەزانن ئاشکراشە خەڵکی دەبێ ملکەچی فەرمانی خوابن و، رێگەش بەخۆیان دەدەن بەناوی خواوە ئاژاوە بنێنەوەو سەروەریو ئازادی کەسی بەرانبەر پێشێل بکەن.

* ئەم سەرنجەی شەهید سەربەست لەنێو پەڕاوی سەرنجەکانیدا بەجێمابوو.

# هەڵوێستی بەرەی تورکمانیو بەرژەوەندییەکانی گەلی تورکمان

لەدوای راپەڕینە جەماوەریەکەی باشووری کوردستان لەساڵی (۱۹۹۱)، شەپۆڵێکی دیموکراتخوازی ئەوتۆ باشووری کوردستانی گرتەوە کە نەك تەنیا کاریگەرییەکی تەواوی کردە سەر پەیوەندییە سیاسیو کۆمەڵایەتیو رۆشنبیرییەکانی خەڵکی کوردستان و زەمینە خۆشکەر بۆ پێکهێنانی چەندین حیزب و رێکخراوی سیاسیو جەماوەری، بەڵکو کاریگەریشی کردە سەر رەوشی سیاسیو کۆمەڵایەتی وڵاتانی دراوسێش. کە هەر وڵاتەو بەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەزمونە دیموکراتیەکەمان کردووە، کە تائێستاش بەپێی بەرەو پێش چوونی ئەزموونەکەمان و گرفتە ناوخۆییەکانمان هەڵوێست و ئاکاری دراوسێکانمان گۆڕانی بەسەر دادێت.

ئەوەی لێرەدا مەبەستی ئێمەیە ئەوەیە کە بتوانین تیشکێك بخەینە سەر بەرژەوەندییەکانی کەمایەتی تورکمانی لەکوردستاندا و وابەستە بوونی گەلی تورکمان بە کوردستانەوە، لەکاتێکدا ئاشکرایە کە زەمەنێکی مێژووی درێژە کە نەتەوەی کوردو تورکمانەکانی کوردستان بەشێوەیەکی هاوبەش و هاو چارەنووس لەژێر سایەی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستاندا ژیانیان بەسەر دەبردو لەرووی زوڵم و زۆرو چەوسانەوەش بەدەستی داگیرکەرانی باشووری کوردستان تاڕادەیەکی، کەم تا زۆر هاوشانی یەکتر بوون، بەڵام بەشێوەیەکی سروشتیش ئاشکرایە کە لەبەر ئەوەی نەتەوەی کورد لەکوردستاندا بەشێکی هەرە زۆری کوردستانی بن دەستی عێراق پێك دێنێت و داینەمۆی خەباتی مێژووییمان بۆ رزگاری کوردستان هەر لەلایەن نەتەوەی کوردەوە سەرکردایەتیو رابەرایەتی کراوە، هەر لەبەر ئەوەش نەتەوەی کورد دووچاری زۆر ترین و سەختترین شێوازی چەوسانەوە هاتووە لەسەر دەستی

داگیرکـەرانی کوردسـتان، کەواتـە بوونـی تورکمانـەکان لەکوردسـتاندا واقیعێکـەو حکومـەتی کوردسـتانیش نکۆڵـی لێ نـەکردووە، بـەڵام دەبێـت بـەپێی ژمـارەو رادەو بوون و ئامادەبوونی تورکمانەکان لەکوردستاندا سنورێك بۆ دەسەڵات و کارەکانیان دابنرێت، تاوەکو کەمە نەتەوەکانی تری وەك (کلدان و ئاشووری)ش لەژێر سایەی حکومـەتی کوردسـتاندا هەست بەناعەدالـەتی نەکـەن و جـەماوەری کوردسـتانیش بەشێوەیەکی عادیلانە بتوانێت هێزو توانای خۆی بخاتە خزمەت بەرەو پێش چوونی پەرلەمان و حکومەتی کوردستان.

لەلایەکی ترەوەش کەمە نەتەوەیی تورکمانی لـەمێژووی پێکـەوە ژیانیـان لەگـەڵ کورددا گرفتێکی فیکری‌و ئایدولۆژی ئـەو تۆیـان لەگـەڵ نەتـەوەی کـورددا نـەبووە، تاوەکو ئێستا بەرەی تورکمانی بیکاتە بناغەیەك بۆ دروسـت کردنـی ململانێیـەکی زەرەرمەند بەرەوشی باشووری کوردستان، بەڵام لەو دواییانەدا بەهۆی درێژە کێشانی شـەڕی نـاوەخۆوە رێگـە خـۆش بـوو بـۆ دەسـت تێوەردانـی ئیقلیمـی لەباشـووری کوردسـتاندا، ئەمـەش وای لـە بـەرەی تورکمـانی کـرد بەشـێوەیەکی خـراپ و دوور لەبەرژەوەندی باڵای گەلی کوردستان هەڵسوکەوت لەگەڵ واقیعی نالەباری باشووری کوردستان بکات و چارەنووسی بەرەی تورکمانی (الجبهـة الترکمانیـة)ی گـرێ‌دا بـە بەرژەوەندییەکانی وڵاتێکی دراوسێ‌و داگیرکـەری کوردسـتان کـە ئـەویش دەوڵـەتی تورکیایــە دیــارە ئەگــەر بەشــێوەیەکی کــاتیش بێــت حکومــەتی کوردســتان بەرژەوەندییەکی ئابووری لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا هەیەو ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە تـەنیا حکومـەتی کوردسـتان سـودو قـازانج لـەو ئاڵوگۆڕییـە بازرگانیـەی سـنووری کوردستان- تورکیا دەبینێت، بەڵکو دەوڵـەتی تورکیاش سوودو بـەرژەوەندی خـۆی لەبەردەوامی ئـەو بازرگانیەدایـە، هـەروەها بـەهۆی خراپـی بـاری ئـابووری تورکیـاو ململانێی تورکیا لەگەڵ دراوسێ‌کانی ئارەزووی بەردەوام بوون و بەرەو پێش چوونی ئەو هێڵـە بازرگانییە دەکات، کەواتـە لـەحاڵی ئێسـتا ئەگـەرچی باشـووری کوردسـتان دووچاری قەیرانێکی سەختیش بووە، بۆ (بەرەی تورکمانی) گونجاو لـەبار نییـە کە بەرژەوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵـەتی تورکـدا گـرێ بـدات و هـێزو توانـای خـۆی بخاتـە خزمـەت دەوڵـەتی تورکیـا، هـەروەها ئەگەر (بـەرەی تورکمـانی) بیـەوێت ببێتـە نوێنـەری تورکمانـەکان لەکوردستاندا، ئـەوا دەبێـت هـەوڵ بـدات چارەنووسـی خـۆی بەچارەنووسـی ئـەزموونی دیموکراتـی باشوورەوە گرێ بدات و هـەوڵی دابین کردنـی

ئاشتیو ئارامیو برایەتی بدات لەکوردستاندا، نەك بەپێچەوانەوە کار بکات، وەکو دەشی کات چونکە خوڵقاندنی گرفت لەبەینی (کورد- تورکمان) لەبەرژەوەندی حکومەتی کوردستان و برایەتی گەلی کوردو تورکمان نییەو سەرکەوتنیش تەنیا لەوەدایە کە نەتەوەی کوردو نەتەوەکانی تر هەوڵی دابین کردنی ژیانێکی شارستانیانە بدەن لەچوارچێوەی حکومەت و پەرلەمانی کوردستاندا، کەواتە ئەگەر حاڵی ئێستا رەوشی باشووری کوردستان بەهۆی بازرگانی کات زیاتر بەرژەوەندی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادایە وەکو دەوڵەتێکی دراوسێی باشووری کوردستان، ئاشکراشە ئەو بەرژەوەندیە هاوبەشەی نێوان (حکومەتی کوردستان و تورکیا) تەنیا لەبواری بازرگانیدا چەق نابەستێت، بەڵکو هەروەك چۆن حکومەتی کوردستان وەك یاسایەکی شارستانی هەوڵ دەدات ئاسایشی سنووری خۆیو دراوسێکانی بپارێزێت، ئەوا دەبێت دراوسێکانیشمان هەوڵی پاراستنی ئاسایشی باشووری کوردستان بدەن، نەك بەوشێوەیەی کە دەوڵەتی تورك پشتگیری لە (بەرەی تورکمانی) دەکات بۆ دروست کردنی گرفت لەناوخۆی حکومەتی کوردستاندا، بەلام خۆ ئاشکراشە کە ئەم بارودۆخە هەتاسەر بەردەوام نابێت و لەداهاتوویشدا (پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆو بەهۆی دەوڵەمەندی خاکی کوردستان بە (پترۆڵ و ئاوو کشتوکاڵ و.. تد) بارودۆخێکی وەها دەچەسپێت، بۆ دەوڵەتی تورکیا هەروا ئاسان نابێت کە بتوانێت پاڵپشتی (بەرەی تورکمانی) بکات بۆ دروست کردنی گرفت لەبەردەم رەوتی خەباتی نەتەوەییمان لەباشووری کوردستان.

هەر وەکو لەسەرەتادا باسمان کرد، کە حکومەت و پەرلەمانی کوردستان بەڕەسمی دانی ناوە بەمافی سەرجەم کەمە نەتەوەکان لەکوردستانداو هەوڵی داوە بۆ دابین کردنی مافە رۆشنبیریو کلتوورییەکانیشیان و هاوکاری تەواویش دەکرێن بۆ پێك هێنانی رێکخراوی سیاسیو رۆشنبیریو جەماوەریو وەك هاولاتییەکی کوردستانیش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بەلام کە (بەرەی تورکمانی) خۆی وابەستەی تورکیا کردووە ئەوا بەپێی بەرژەوەندییەکانی تورکیا لێرە مامەڵەو هەڵسوکەوت دەکات و دەشیەوێت خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی تورکمان بگەیەنێ، دیارە لەوەشدا هەر خۆی زەرەر دەکاو، لەم حاڵەدا (بەرەی تورکمانی) زیانێکی زۆر دەگەیەنێت بەمافی تورکمانەکان لەکوردستانداو بەناڕاستەوخۆ (غیر المباشر) دەیسەلمێنن کە تورکمانەکان لەکوردستاندا پەناهەندەیەکن و شوێنی راستەقینەی خۆیان

چوارچێـوەی دەوڵـەتی تورکیایـە، بـەڵام لـەم کاتەشـدا دەردەکـەوێت کـە (بـەرەی تورکمانی) بە کردەوە شەڕی شاراوە (الحرب الخفية) دەکات لەنێوان کورد- تورکمان لەباشووری کوردستاندا، کارێکی گونجاوو رەواش نی‌یە رێگە بدرێـت ژیانێکی پـڕ لەئاشتی‌و تێکەڵ بوونێکی مێژوویی‌و کۆمەڵایەتی نێوان (کورد- تورکمان) لەسەر دەستی (بەرەی تورکمانی) گۆڕانی بەسەر دابێت وبەرەو ململانێیەکی زەرەرمەندی (بگۆڕدرێت)، کە زیان بەئاسوودەیی‌و بەرژەوەندییەکانی سەرجەم خەڵکی باشووری کوردستان دەگەیەنێت، کەواتە کورد لەگەڵ کەمە نەتەوەکانی تر لەکوردستاندا خاوەنی پەیوەندی‌و بەرژەوەندییەکانی چەسپاون لەگەڵ یەکتریداو ئەوەی گۆڕانی بەسەر دادێت بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کوردستانە لەبەرانبەر سیاسەتی دەوڵەتە دراوسێکانمان، واتە باشووری کوردستان خاوەنی یەك بڕیاری یەکگرتووە لەبەرانبەر سیاسەتی دەوڵەتی تردا، کە ئەویش پەرلەمان و حکومەتی کوردستان خاوەنی بڕیاری کۆتاییەو بۆ (بەرەی تورکمانی) گونجاوو نییەو مافی ئەوەشی نیە کە بەپێی رێ نووێنیەکانی تورکیا لێرە هەڵسووکەوت بکات.

* ئەم وتارە لە ژمارە (٣٦)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم رۆژی ١٩٩٨/٩/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

# پارتی تورکمان ئیللی خزمەتی کێ دەکات؟

مانشێتی سەرەوەی بڵاوکراوەی (الترکمان)ی ژمارە (٩)ی ئازاری ١٩٩٩، کە بڵاوکراوەیەکی سیاسی (پارتی تورکمان ئیللی)یە، زۆر ناحەقانەو رەگەز پەرستانە بوونی تورکمان بەشێوەیەکی بەر بڵاو لەباشووری کوردستاندا دەردەبڕێت و رەهەندێکی مێژووی دوورو شارستانیانە بەبوونی تورکمان دەدات لەکوردستاندا، دیارە بەو شێوەیەی کە مانشێتەکە نووسراوە وەك خۆی دەینووسینەوەو پاشان دەچینە سەر لێکدانەوەو شیتەڵکردنی ئەو گوناه و تاوانەی کە لەپشت مانشێتەکەی بڵاوکراوەی (الترکمان)وە هەستی پێدەکرێت، کە دەڵێت: (عندما نقول القلعة نعني بها الترکمان فاینما وجدت القلعة وجد الترکمان واینما وجد الترکمان وجدت القلعة)، باسەرەتا تیشکێك بخەینە سەر ئەوەی کە بوونی (قەلا)کانی کوردستان واتای چی دەگەیەنێت؟

قەلاکان رەهەندێکی مێژووی دووریان هەیەو رەمزی رەسەنایەتی نەتەوەکانی ئەم خاکە دەگەیەنێت، ئاشکراشە کە قەلاکانی کوردستان لەسەر شانی مرۆڤەکانی سەر ئەم خاکە دروست کراوەو ئەمڕۆش بۆتە رەمزی مێژووی گەلانی کوردستان بەگشتیو نەتەوەی کورد بەتایبەتی، بەلام ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە کە مانشێتی بڵاوکراوەی (الترکمان) بەشێوەیەك باس لەبوونی قەلاکان دەکات، کە بوونی تورکمان و قەلاکان وابەستەی یەك دەکاتەوەو بوونی هەر یەکێکیان دەکاتە بەڵگە بۆ بوونی ئەویتریان، کە ئەمەش نیشانەی خۆسەپاندنێکی بێبەڵگەو سەرتاپاگیرە بەسەر تەواوی شارستانیەت و خاکی کوردستاندا، چونکە هەروەك دەزانین کوردستان خاوەنی کۆنترین شارستانیەت و لانکی مرۆڤایەتییەو بەڵگەی مێژوویش سەلماندوویەتی کە ئەو نەتەوانەی لەسەر خاکی کوردستان لەرابردوودا ژیاون، بەباپیرە گەورەو رەچەڵەکی نەتەوەیی کورد دەزانرێن و لەسەرتاسەری کوردستانیشدا بەچەندین شوێنەوارو قەلای دێرین جێدەستی خۆیان دیاری کردووە، کەواتە لێرەدا ئەرکی سەرجەم کەسانی نەتەوەییو ولاتپارێزە کە لەئاست ئەو دەستدرێژییەی بڵاوکراوەکەی (پارتی تورکمان ئیللی)دا بێدەنگ نەمێنێت و راستیەکانیش بۆ سەرجەم گەلانی کوردستان روون بکاتەوە، چونکە زۆر جێگەی کوردستان هەیە بەقەلاو شوێنەواری مەزن دەوڵەمەندەو تورکمانیش هیچ ئامادەییەکیان لەرابردوو ئێستاشدا لەو شوێنانەدا نەبووەو نییە.

پاشان لەسەروتاری هەمان ژمارەی بلاوکراوەی (الترکمان)دا، (پارتی تورکمان ئللی) زیاتر حەقیقەتی خۆی بەدیار دەخات و بێ پەردەش ئاشکرای دەکات کە دژی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانمانەو بوونی پارتێکی تورکمانی بەو جۆرەش زیان بەئاسایش و پێکەوە ژیانی گەلانی کوردستان دەگەیەنێت بەگشتیو لێدانی زەنگێکی خەتەریشە لەبەرانبەر ئاسایشی نەتەوەی کورد بەتایبەتی، کەواتە باچیتر خەڵکی تورکمان لەکوردستاندا (پارتی تورکمان ئللیو هاوپەیمانەکانی) بەنوێنەری خۆیان نەزانن و خۆشیان نەکەنە سوتەمەنی سیاسەتەکانیان، کە تەنیا خزمەت بەداگیرکەرانی کوردستان دەکات و لەهەوڵی تێکدانی ئاسایش و پێکەوە ژیانماندان، هەروەها لەسەروتارەکەی بلاو کراوەی (الترکمان)دا، داوای (کۆمەڵگایەکی دیموکراتیو فرە حزبی دەکەن و داوا دەکەن کە هەموو یاسا شۆڤینیو رەگەز پەرستەکان بسرێتەوە) دیارە ئەمەش داواکارییەکە کە شۆڕشی نەتەوەییمان و راپەرینی ئاداری ١٩٩١ی خەڵکی کوردستانیش لەهەوڵی پیادە کردنیدان، بەلاّم ئەگەر سەیر بکەین سیاسەت و کردەوەکانی (پارتی تورکمانی ئللی) بەئاشکرا دژی سیستمی دیموکراتیەتە، چونکە یەك لەیاساکانی دیموکرات ئەوەیە کە مرۆڤ نابێت سەروەری کەسانی بەرانبەر پێشێل بکات، کەچی سەیر دەکەین بلاو کراوەی (الترکمان)ی زمانحاڵی (پارتی تورکمان ئللی) سەرورەیو موقەدەساتی نەتەوەیەکی وەك کورد پێشێل دەکات، ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئەو بلاو کراوەیە لەژێر سایەی سیستمی دیموکراتیو پەرلەمانی باشووری کوردستاندا چاپ و بلاو دەکرێتەوەو بەوپەڕی ناعەدالەتیەوەش سەروەری نەتەوەییمانی پێشێل کردووەو دەڵێت: (ان ترکمن الي هي البقعة الجغرافية التي تمتد حدودها من قصبة مندلي الى قصبة تلعفر.. والمطالبة بمنح اقليم "ترکمن الي" حكما ذاتيا مرکزه مدينة كركوك ويشكل الاقليم الشريط الفاصل بين مناطق سكن القوميتين العربية والكردية) دیارە (پارتی تورکمان ئللی) بیری رەگەزپەرستی وایلێکردوون کە بەبیانووی دیموکراتیەتەوە سەروەری نەتەوەییمان پێشێل بکەن، هەروەك چۆن باپیرانیان لەدەسەلاّتدارێتی (عوسمانی)دا بەناوی خەلافەتی ئیسلامەوە چارەنووسی کوردیان دووچاری زوڵم و زۆرو برسێتیو قاتوو قڕی کردەوە.

بەهەر حاڵ کردنی (مەندەلیو تەلەعفەرو کەرکوك) بەخاکی تورکمان و ناونانی ئەو شوێنە جوگرافییەش بە (اقليم تورکمن الى)و داواکردنی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ تورکمانەکان، کارێکی ناڕەوایەو نەوەزعی ئێستای ئاسایشی نەتەوەییمان ئەوە قبوڵ دەکات و نە لەرابردوویشدا شۆڕشی کورد ئەوەی قبوڵ کردووە کە دەستبەرداری

کەرکوك و شوێنەکانی تری کوردستان ببێت و شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەییشمان گەواهیدەری ئەو راستییانەیە، ئاشکراشە کە سەدان بەڵگەو دیکۆمێنتی مێژووی هەیە کە دەیسەلمێنێ کەرکوك شاری کوردانە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی مێژووی نییە سەلمێنەری ئەوە بێت کە تورکمان لەکوردستاندا خاوەنی خاکێکی دیاری کراوبن، بەڵکو ئەو تورکمانانەی کوردستان زیاتر لەسەردەمی دەسەڵاتدارێتی عوسمانیدا، پەیتا پەیتا بەکوردستاندا بڵاو کراونەتەوە بەمەبەستی راپەڕاندنی ئیش و کارەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەو ئیمپراتۆریەتە لەناوچەکەدا، ئیتر تورکمانەکان لەو رێگەیەوەو بەپشتیوانی عوسمانییەکان کەوتوونەتە کڕینی چەند پارچە زەوییەك لەملاو لەولای کوردستان و ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو تورکمانانە خاوەنی خاکێکی رەسەنی مێژووی بن لەکوردستاندا، هەروەها لەو کاتەوەی تورکمانەکان بوونە خاوەنی پێگەو بەرژەوەندی ئابووری لەکوردستاندا خەسڵەتی خەڵکێکی کاسبکارو بازرگانیان وەرگرت، هەروەك شتێکی سروشتیش ئەم خەسڵەتەیان وای لێکردوون کە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیەکانیاندا هەمیشە شوێن کەوتەی دەسەڵاتە دیکتاتۆرییەکانی عێراق بن، بۆ نموونە لەکاتێکدا رژێمی بەغدا بڕیاریدا کە کوردەکان بەپێی بڕیاری (٧٣٦-٧٣٧) لەساڵی ١٩٨٨ لەخزمەتی سەربازی (تەسریح) بکرێن، لەم کاتەدا زۆر لەتورکمانەکان هەوڵیان دەدا رەگەزنامەی خۆیان بکەنە کورد، یاخود لەهەندێ حاڵەتدا رەگەزی خۆیان کردۆتە عەرەب، واتە خەڵکێکن خاوەنی خەسڵەتێکی بەرژەوەند خوازن، وابەستەیی نەتەوەییان زۆر بەهێز نییە، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتییەو سروشتێکی تایبەتییانە.

خۆ ئەگەر (پارتی تورکمان ئێلیو هاوپەیمانەکانی) بەچاوێکی مادیو ئابووریانە سەیری کەرکوك دەکات و لەهەلومەرجێکی سیاسیو نێودەوڵەتیدا هەوڵ دەدات مۆرکێکی تورکمانانە بەسەر کەرکوکدا بڕێت، ئەمەش لەپێناو زیاتر پتەو کردنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان، ئەوا کورد سەرەڕای ئەوەی کە کەرکوك بەشادەماری ئابووری کوردستان دەزانێت، ئامادەش نییە واز لەهیچ بستە خاکێکی خۆی بێنێت ئەگەر شوێنێکی زۆر نەگونجاویش بێ بۆ کشتوکاڵ و پیشەسازی..، خۆ لەرابردوویشدا شۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان سەلمێنەری ئەم راستیانە بووەو لەڕووی مادیو جەستەیشەوە قوربانی بۆ داوەو، (پارتی تورکمان ئێلی)و هەموو خەڵکی تورکمانیش باش دەزانن کە پەرلەمان و حکومەتی باشووری کوردستان، زیاتر لەکوردێکی خاوەن خاك و بەرخودان ریزو تەقدیری مافی تورکمانەکانی

گرتووەو هەمیشەش لەهەوڵی ئەوەدایە کە هۆکارەکانی پێکەوە ژیانی (کورد- تورکمان و ئاشووری) پتەو ترو بەهێزتر بکات، ئەگینا خۆ ئەگەر بەپێی یاسایی دیموکراتیەت بێت و بەپێی یاساکانی ئەو کۆمەڵگا دیموکراتیەی کە پێشتر باسمان کرد کە (پارتی تورکمان ئللی) ئیدعای بۆ دەکات، دەبێت (پارتی تورکمان ئللی)و بڵاو کراوەی (الترکمان)یش لەلایەن حکومەتی کوردستانەوە دادگایی بکرێت، چونکە زۆر ناحەقانە سەروەری‌و موقەدەساتی نەتەوەیەکی وەك کوردی پێشێل کردووە، کە ئەمەش دژی هەموو بنەما دیموکراتی‌و مرۆڤایەتییەکانی سەردەمەو لەلایەن کەسانی نەتەوەیی‌و وڵاتپارێزی کوردستانەوەش قابیلی قبوڵ کردن نییە.

ئەو کارانەی بڵاو کراوەی (الترکمان) یاخود روونتر بڵێین سەروتاری بڵاوکراوەکەیان کە دەربڕی سیاسەتی (پارتی تورکمان ئللی)یە، دەیەوێت لەپێناو رازی کردن و خزمەت گەیاندن بەداگیرکەرانی کوردستان، پێکەوە ژیان و ئاسایشی باشووری کوردستان، دووچاری قەیران بکاتەوە، بەڵام ئەم کارانە لەرابردوودا زیانێکی زۆری گەیاندە ریزەکانی ئەو پارتەو هاوپەیمانەکانیشیان، تاکار گەیشتە ئەوەی کە چەندین کەسایەتی‌و دەستەو کۆمەڵ بڕیاری بەجیا کار کردنی خۆیان بدەن و هەڵوێستی نیشتمانی خۆیان بخەنە خزمەت حکومەتی باشووری کوردستان کە دەتوانین بڵێین ئەو لایەنانە نوێنەرایەتی خەڵکی تورکمان دەکەن لەکوردستاندا، بۆیە ئەگەر حزبی تورکمان ئللی‌و هاوپەیمانەکانیان دەستبەرداری ئەو سیاسەتە چەوتانەی خۆیان نەبن، ئەوا لەداهاتوودا لەبەرانبەر گەلی کوردستان بەگشتی‌و خەڵکی تورکمان بەتایبەتی دووچاری شەرمەزاری دەبن و بەتەواویش لەگۆڕەپانی سیاسی باشووری کوردستاندا بوونیان دەسڕێتەوە، ئەم راستییانەم بۆ مێژوو تۆمار کردووە بۆ ئەوەی مێژووی کوردستان بەشێواوی نەنووسرێتەوەو هەر کەس بەئارەزووی خۆی چۆنی بووێت وای بنووسێتەوە، دەمەوێ ئاماژە بەو راستییەش بکەم کە لەگەڵ مافەکانی تورکمانەکانم لەکوردستانداو وەك هاوڵاتییەکی کوردستان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت لەو باوەڕەشدام کە ئێستا لەسایەی پەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا برا تورکمانەکان بەمافەکانی خۆیان شاد بوون، دامەزراندنی پارتی سیاسی تورکمانی‌و کۆمەڵەی کلتوری‌و بڵاو کردنەوەی رۆژنامەو گۆڤاری تورکمانی گەواهیدەری قسەکانمانن.

* ئەم وتارە لەژمارە (٤٥)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم رۆژی ١٩٩٩/٤/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

# مەشروعێك لەپێناو چارەسەر، یاخود ئاژاوە نانەوە لەناوخۆی عێراقدا

(رۆژنامەی "الترکمان" کە زمانحاڵ و مانگنامەیەکی- حزبی تورکمان ئیلی)یە، لەژمارە (١٥-١٦)دا، مەشروعێکی هاوبەشی بەناوی دوو حزبی تورکمانییەوە بڵاو کردۆتەوە کە ئەوانیش (حزبی تورکمان ئیلیو حزبی نیشتمانی تورکمانە!)، لەبەر ئەوەی مەشروعەکەیان باس لەژیانی داهاتووی عێراق دەکات و وابەستەی ئایندەشمانە لەباشووری کوردستاندا، بۆیە بەمافی خۆمانی دەزانین بەسەراحەتەوە ناواخن و ئامانجە شاراوەکانی ئەو مەشروعە بخەینە روو، پاشخانی دەروونی ئامادەکارانی (پرۆژە تورکمانییەکە) وایلێکردوون کە ئەوەندە بەگومانەوە سەیری داهاتوو بکەن، تاوایلێهاتووە بنیاتنانی عێراقێکی دیموکراتیو ئاسوودە بەزەحمەت دەزانن و لەسەرەتای مەشروعەکەیان دەنووسن: (محاولات تغیر النظام بغیر طریق الدیموقراطیة فلا تولد الدکتاتوریة، فالانقلاب او الثورة لاتولد غیر الدکتاتوریة بل حتی الانتفاضة الشعبیة لاتولد الدیموقراطیة کما هو الحال في فرنسا حیث اصبح نابلیون دکتاتورا..)، بەڵام خۆ (مەشروع نووسەکان!) ئەوەیان لەلا روونە کە نیزامی ئێستای بەغدا سیستمێکی عەسکەرتاریو دیکتاتۆرانە بەڕێوەی دەبات، ئیتر چۆن رێگە دەدات کە بەرێگەی ئاشتیو دیموکراتیانە نیزامی حوکم بگۆردرێت، کەواتە ئەگەر (مەشروع نووسەکان!) واقیعی بوونایە نەدەهاتن بارێك بەدگومانی بخەنە سەر راپەڕینی جەماوەری (الانتفاضة الشعبیة)و دیکتاتۆریەتی (ناپلیۆن)یش بکەنە نموونەی خراپی کاردانەوەی راپەڕینی جەماوەری، لەکاتێکدا راپەڕینە جەماوەرییەکەی ساڵی ١٩٩١ی باشووری کوردستان حکومەت و پەرلەمانێکی دیموکراتی هێنایە بەرهەم و سەلماندیشی کە ئەگەر نەتەوەیەك لەمەفهومی ئازادیو دیموکراتی گەیشتبێت، ئەوا چ بەکودەتا یاخود راپەڕین گۆڕانکاری روو بدات، ئەوا هەر داخوازی جەماوەر دێتە دی، چونکە تاوەکو حوکمداران لەگەڵ ئاستی فکریو سیاسیو کۆمەڵایەتی خەڵکی گونجاوو بەرانبەر نەبن ئەوا هەمیشە توندو تیژیو

ناكۆكی لەنێوان جەماوەرو دەسەڵاتدا، بەردەوام دەبێت، دووریش نییە كۆتاییەكانی سەدەی بیست و سەرەتاكانی سەدەی بیست و یەك، سەرەتای گۆڕانە خێراكان بێت لەنیزامی حوكمی عێراقیدا راپەڕین یاخود كودەتاش خێراترین ڕێگایە، لەم حاڵەتەشدا جەماوەر كاریگەری خۆی لەسەر نیزامی داهاتوو دیاری دەكات، بەڵام دیارە (مەشروع نووسەكان!) بۆیان دەركەوتووە، لەحاڵەتی (راپەڕین و كودەتا)دا ناتوانن كاریگەر بن و جێگەی دەستیان دیاری بكەن لەگۆڕانكارییەكانی ناوخۆی عێراقدا، چونكە وەك وتمان جەماوەری وشیار دەتوانێت كاریگەری هەبێت كە ئەو جەماوەرەش نەبوو، زەحمەتە وڵاتێكی دراوسێ بتوانێ كەلێنی نەبوونی جەماوەر بۆ (مەشروع نووسەكان) پڕ بكاتەوە.

ئاشكراشە لەحاڵەتی دیموكراتیەتیشدا، گەلی توركمان ئەگەر (٢٪)ی گەلانی عێراقیش پێك بهێنن، ئەوا لەوانەیە ئەگەر (مەشروع نووسەكان) خاوەنی هەڵوێستی لەو بابەتە بن، لەو (٢٪)ی توركمانە، نەبنە خاوەنی جەماوەرێكی ئەوتۆو لەم حاڵەتەشدا (مەشروع نووسەكان) لەناو سیستمی دیموكراتی عێراقیشدا بزر دەبن و سەنگێكی ئەو تۆیان نامێنێ.

هەروەها لەخاڵی سێیەمی پرۆژە توركمانییەكەدا باس لەوە دەكات، كە دابەشكردنی عێراق لەڕووی جوگرافیو نەتەوەییو دینییەوە دابەشكردنێكی ناعادیلانەیەو دەڵێن: (..وان أی تقسیم العراق سیكون حتما تقسیما غیر عادل فتقسیم العراق مثلا الی المنطقة الجبلیةو السهلیة والصحراویة تقسیم غیر عادل..) باشە ئەگەر (مەشروع نووسەكان!) ئەوەندە بەخەمی كاری (عادیلانەو غەیرە عادیلانەن) بۆچی لەمەشروعەكەیاندا بە (كوردستان) دەڵێن (المنطقة الجبلیة) كە ئەمەش ئەو پەڕی ناعەدالەتییە بەخوێن و خەباتی نەتەوەیی كورد لەباشوورو تەواوی كوردستاندا، بەڵام دیارە كەسانی (مەشروع نووس!) لەخۆیانەوە سەیری كوردستان و نەتەوەی كورد دەكەن و وا دەزانن كوردیش خێڵێكی كۆچ كردووی ئاسیای ناوەڕاستەو دەیەوێ كوردستان داگیر بكات، ئیتر لێرەوە (مەشروع نووسەكان!) ئەو حەقەیان بەخۆیان داوە كە (توركمانی) بێ خاك، دەبێت هەمان مافی كوردی خاوەن خاك و مێژووی هەبێت..، لەكاتێكدا ڕێككەوتنە مێژووییەكان و ململانێ ناوچەییو نێو دەوڵەتییەكان سەلماندوویێتی كە كورد خاوەنی كوردستانەو سنوورێكی دیاریكراوی هەیە، هەر لەسەدەی بیستەمداو لەپەیماننامەی سیڤەردا باس لەباكوور

و باشووری کوردستان کراوەو لەساڵی (١٥١٤)شدا بۆ یەکەم جار کوردستان لەسەر دەستی دوو ئیمپراتۆری (عوسمانی- سەفەوی) دابەش کراوە..و بەپێی رێککەوتننامەی ساڵی ١٩٧٠ش لەنێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و حکومەتی عێراقیدا، دان بەبوون و مافی نەتەوەییمان لەباشووری کوردستاندا نراوە..، خۆ ئەگەر نەتەوەی کورد خاوەن خاك و ئیرادەیەکی شۆڕشگێڕ نەبووبێت، چ پێویستی بەوە دەکرد لەگەڵ هەر سەرهەڵدانێکی کوردیدا، داگیرکارانی کوردستان هاوکاری یەکتری بکەن بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشە نەتەوەییەکانمان، لەم بوارەشدا چەندین رێککەوتننامە لەنێوان داگیرکەراندا ئیمزا کراوە، بۆ لەناو بردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازیمان لەکوردستاندا، کەواتە رەوایی نەدان و بە ناعەدالەت زانینی دابەشکردنی عێراق لەمەشروعە تورکمانیەکەدا جگە لەهەستی شۆڤێنیو وابەستە بوونیان بەداگیرکارانی کوردستان شتێکی تر هەڵناگرێ، لەبەر ئەوەی کۆنگرەی ئەم دواییەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیش جەختی لەسەر فیدراڵیەت بۆ باشووری کوردستان کردۆتەوەو بەرەسمی ناساندویەتی، لێرەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە بەکارهێنانی زاراوەی (المنطقة الجبلية) لەجیاتی (کوردستان) جگە لەهەستێکی باشڤەڕۆیی هیچیتر لەخۆ ناگرێت و، بیرو باوەڕی لەو جۆرەی مەشروعەکەش نەخزمەتی واقیعی ئێستای عێراق نەخزمەتی گەلانی عێراقیش دەکات.

سەرەڕای ئەوەی کە مەشروعەکە کۆمەڵێك بابەتی وروژاندووە کە پێویستی بەقسە لەسەر کردن و گفتوگۆیەکی زۆر هەیەو ئێمە لێرەدا تەنیا قسە لەسەر ئەو لایەنانە دەکەین، بەناهەقانە هەندێك سنوورو موقەدەساتی نەتەوەیی کوردییان پێشێلکردووە ئەگینا خۆ مەسەلەی بوون یاخود نەبوون (تەجنیدی ئیجباری) کە لەمەشروعەکەدا داوای دەکات کە (الغاء التجنيد الاجباري) ببێتە بڕیار لەعێراقی داهاتوودا و ئەو مەسەلەیە زۆر هەڵدەگرێت. هەروەها (مەشروع نووسەکان!) بۆ بەڕێوەبردن و کاری ئیداری عێراق هەستاون بەدابەشکردنی عێراق بۆ سەر حەوت (ویلایەت) و بۆ هەر ویلایەتێکیش ناوێکیان داناوەو مەڵبەندی ویلایەتەکەش (المركز الولاية)یان دیاریکردووە، پێنج ویلایەتی یەکەم پەیوەندی بەخاکی عەرەبیەوە هەیە لەعێراقداو ئەوان (عەرەبەکان) بەگشتیو حیزبە سیاسییەکان بەتایبەتی دەتوانن مەشروعەکە هەڵبسەنگێنن و، لایەنە سلبیو ئیجابیەکانی دەربخەن و هەڵوێستی خۆیانی لەبارەوە بدەن، بەڵام بڕوا دەکەین ئەم مەشروعە لەلایەن هیچ کەس و لایەنێکەوە لەئاستی

ئیعلامیدا بایەخی پێنادرێ، مەگەر تەنیا رەخنەی ئاراستە بکرێت و لایەنە سلبیو پاشڤەڕۆییەکانی دیاریی بکرێت.

ئەوەی لەمەسەلەی دابەشکردنی عێراقدا بەسەر ویلایەتەکاندا پێوەندی بە باشووری کوردستانەوە هەبێت (مەشروع نووسەکان!) لەدوو خاڵدا بەم شێوەیە چڕیان کردۆتەوە: (٦- ولایة کرکوك: وتتکون من محافظات دیالی وکرکوك والموصل وتکون کرکوك مرکزا للولایة. ٧-ولایة اربیل: وتتکون من السلیمانیة واربیل و دهوك وتکون اربیل مرکزا لها)، لەم دوو خاڵەدا دەتوانین کرۆکی (مەشروعەکە) بناسین و هەوڵی خراپی داگیرکەران هەست پێبکەین، کە لەپشت مەشروعەکەوەن بۆ ئەوەی باشووری کوردستان دابەش بکەن، لەکاتێکدا (مەشروع نووسەکان!) دەزانن کە دانیشتوانی باشووری کوردستان لەڕێگەی پەرلەمانی شەرعی خۆیەوە سیستمی فیدرالیزمی بەپەسەند زانییوە، بۆ چارەسەری گرفتەکانی باشووری کوردستان کە تائێستاش بەعێراقەوە لکێنراوە، کەواتە کارێکی لەو بابەتە ئەگەر بۆ ناوەڕاست و باشووری عێراق گونجاو بێت، لەبەر ئەوەی تائێستا نەیانتوانیووە ئازادانە بڕیار لەسەر چارەنووسی سیاسیو ئایندە ی خۆیان بدەن، بەڵام بۆ باشووری کوردستان بوونی ئەم دوو ویلایەتە تەنیا بریتییە لەهەوڵێکی گوماناوی بۆ دابەشکردنی باشووری کوردستان، لەکاتێکدا کوردستان بەگشتیو باشووری کوردستان بەتایبەتی سەرەڕای هەوڵی بەردەوامی داگیرکەرانی کوردستان بۆ سڕینەوەی مۆرکی نەتەوەییو کلتوریمان و دابەشکردنی کوردستان بەشێوەیەکی ناعادیلانە، کەچی تاڕۆژانی ئەمڕۆشمان نەتەوەی کورد رەسەنایەتی خۆی لەگشت بوارەکانی ژیانیدا پاراستووە، ئیتر لێرەوە هەموو دەمامکەکانی سەر رووی (مەشروع نووسەکان!) لادەدرێت و مەشروعەکەشیان، لەناو مێژوو.. ئایندەی گەلانی سەر خاکی کوردستاندا بێ بایەخ تەماشا دەکرێت و بزر دەبێت.

* ئەم وتارە لە ژمارە (٥٦)ی رۆژنامەی میدیا- سالی سێیەم لەرۆژی ١٩٩٩/١٢/١ بڵاوکراوەتەوە.

# PKK و هاوپەیمانەکانی
# هەیکەل و چارەنووسیان

بەشێوەیەکی گشتی هەر چ حیزب و ڕێکخراوێک یاخود دەوڵەتێک سەرەڕای سلبیاتی زۆری‌و ناقولاَبوونی سیاسەتی لەبەرچاوی مرۆڤایەتیدا، کۆمەڵێک هاوپەیمانی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ یاخود ئاشکراو شاراوەی بۆ پەیدا دەبێت کە سوودو قازانجی خۆیان لەهاوپەیمانێتی کردنی یەکتردا دەبیننەوە، چونکە شتێکی ئاشکرایە کە هەموو دەزگایەکی حیزبی یاخود حکومی لەبارودۆخی ئێستای جیهاندا پێویستیەکی زۆری بەدۆست و هاوپەیمان هەیە، جا ئەو هاوپەیمانێتیە تاکتیکی بێت یاخود ستراتیژی بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی‌و درێژەدان بەمانەوەی خۆی.

ئەم دیاردەیەش لەکوردستانی باشووردا بەزەقی بەرچاو دەکەوێت، هەندێك پەیوەندی‌و هاوپەیمانێتی بەدی دەکرێت کە مەبەست و ئامانج تیایدا بەرژەوەندی بالاَی نەتەوەکەمانە، بەلاَم ئێمە لێرەدا باسی کرۆك و سەرچاوەی هاوپەیمانێتیەکی نارەواو بێزراو دەکەین لەئاست فکری جیهانی‌و بەرەو پێش چوونی کێشەی ڕەوای نەتەوەییمان.

هەر لەشەڕی ساڵی (١٩٩٥) نێوان KDP-PKK یاخود ڕاستر شەڕی نێوان PKKو پەرلەمان و حکومەتی کوردستان و شەڕ فرۆشتنی ئەم دواییەی PKK بەحکومەتی هەرێمی کوردستان لێرەشدا کۆمەڵێك هێزو لایەنی باشووری کوردستان پشتگیری سیاسەتی شەڕەنگێزی PKK دەکەن دژی باشووری کوردستان، سەرەڕای ئەوەی کە باش دەزانن گۆڕەپانی خەباتی PKK باکووری کوردستانە نەك باشوور وە هەرچەندە PKK تاکە حیزب نی‌یە لەکوردستانی باکوورداو ناتوانێت خۆی بکات بە تاکە نوێنەری کوردی باکوور، چونکە پارت و ڕێکخراوی سیاسی تریش هەن لەباکووری کوردستاندا خەبات دەکەن و داوای نەمانی ستەمی نەتەوەیی دەکەن لەسەر نەتەوەکەمان لەهەمان کاتیشدا پشتگیری پەرلەمان و حکومەتی هەرێم دەکەن. لێرەدا پێویستە خەڵکی کوردستان بەگشتی‌و ڕۆشنبیرانی نەتەوەکەمان بەتایبەتی بەوردی سەیری ئەم هەڵوێستەی PKKو هاوپەیمانەکانی بکەن و بزانن چ مەبەستێکی ئاشکراو شاراوەی لەپشتەوەیە، کە بێگومان مەبەستیان لەناوبردنی ئەزموونی دیموکراتیەت و پەرلەمانی باشووری کوردستانە، وە ئەو هۆکارانە چین کە PKKو ئەو حیزبانە بە یەکەوە گرێ دەدات، لێرەدا هەوڵ دەدەم ڕۆشنایی بخەمە سەر حەقیقەتی

PKKو هاوکارانی کە چەند خاڵێکی مەبدەئی بەیەکیانەوە گرێ دەدات تاوەکو بەئاسانیو بەدڵنیایی هاوپەیمانی یەکتربن، لەبارودۆخی ئێستادا ئەم هاوبەندییەی نێوان PKKو لایەنەکانی تر دووچاری گرفت دەبێت، بەهۆی نەگونجانی بارودۆخی ئیقلیمیو نێو دەوڵەتی لەلایەکەوەو پێکهاتەی ناو خۆییان لەلایەکی ترەوە، کە لێرەدا رۆشنایی دەخەینە سەر خاڵی دووەم مەبەست پێکهاتەی حیزبییانە.

١-بەدیهێنانی ئامانجەکان لەرێگەی شەڕەوە: دروست کردنی گیانی شەڕەنگێزیو چەسپاندنی رۆحیەتی شەڕ لای ئەندامان، دەبێتە داینەمۆی بڕوابوون بەشەڕ بۆ هێنانەدی ئامانجە دوورو نزیکەکان، کەواتە لەم سەردەمی دیموکراتیەت دانوستانەدا بەکارهێنانی چەك وەك هۆکارێك بۆ مانەوەو خۆسەپاندن بەسەر خەڵکی باشووری کوردستاندا نیشانەی پاشکەوتووی عەقڵیانە لەئاست گۆڕانکاریو بەرەوپێش چوونی شێوازی پەیوەندییەکانی سەردەم و ژیانی شارستانیدا.

لێرەدا بزانین PKKو هاوپەیمانەکانی چۆن لەشەڕدا شپرزەی دەروونیو ئامانجە ئابووری سیاسیەکانیان چارەسەر دەکەن، هەر چەندە دەبێت ئەوە بزانن لەسیستەمی دیموکرتیەتیشدا ململانێو گۆڕانی دەسەڵات روودەدات بەڵام بەرێگەیەکی هاوچەرخانە، بەڵام ئەوان بۆ جۆشدانی شەڕ کەرانیان و هێشتنەوەیان لەدەوری خۆیان تەنیا لەشەڕدا دەتوانن دڵیان رازی بکەن، چونکە عەقڵیەتی شەڕ زاڵە لەجولاندن و کپ کردنەوەی حەزەکانیان، هەر سەرکەوتنی عەسکەریش پلەو پایەو شەخسیەتی کەسەکانیان دیاری دەکات، بەئاشکراش رون بۆتەوە هەر کاتێك سەرکردەیەکیان سەرکەوتنێکی عەسکەری بەدەست هێنابێت لەشەڕی ناوخۆی باشوری کوردستاندا پلەو پایەو شەخسیەت و سیقەیەکی زۆری بەدەست هێناوە لەکاتی شکستیشدا ئەم کارە پێچەوان بۆتەوە، ئەمەش رێبازێکە لەگشت سیستەمێکی عەسکەرتاریدا وجودی هەیە، چونکە سیستەمی عەسکەرتاری دەبێتە هۆی بەرهەم هێنانی عەقڵیەتێکی شەڕانیو دەسەڵاتێکی دیکتاتۆری، کەواتە لەسیستەمی PKKدا ئەوەی نەتوانێت بکوژێت و شەڕ هەڵگیرسێنێت ئەوا دەبێت مل کەچی دەستی شەڕکەرانیان بێت، ئەم دیکتاتۆریەت و عەسکەرتاریەتە بەعەمەلی رەنگی داوەتەوە لەو کارانەی کە دەیکەن بەمەبەستی ئەوەی رووی دیکتاتۆریانەی خۆیان بشارنەوە، وەك دروست کردنی (پەرلەمانی مەنفا)و هەوڵدان بۆ دروست کردنی (فیدراسیۆنی دیموکراتیو بەرەی سەربەخۆبوون).

ئاشکرایە کە دروست کردن و دامەزراندنی ئەو سێ کارەی پێشەوە دەبێت بە راوەرگرتن و ریفراندۆمی جەماوەری بێت، چونکە پەرلەمان دانانرێت بەڵکو دەبێت

لەلایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێت، گەر سەیر بکەین (پەرلەمانی مەنفا) دروست کراوە لەلایەن دەسەڵاتێکی عەسکەرتارەوە نەك لەلایەن جەماوەرەوە هەڵبژێردرابێت، کەواتە (پەرلەمانی مەنفا) گوێ رایەڵی دەسەڵاتە عەسکەرییەکە دەبێت لەبڕیارداندا ئەمەش دوورە لەگشت ئسولێکی دیموکراتی، (فیدراسیۆنی دیموکراتیو بەرەی سەرخۆبوون)یش کاتێك بەشێوازێکی ئاشتیو دیموکراتیانە لەباشووری کوردستاندا جەماوەری نەبووەو شکستی خوارد خێرا دەسەڵاتە باڵاکەی PKK (عەسکەرییەکە) ویستی بەزۆر بیچەسپێنێو شەڕی (١٩٩٥) دژی پەرلەمان و حکومەتە دیموکراتیەکەی باشووری کوردستان هەڵگیرساند. کە حەقیقەت و واقیعی PKK بەم شکڵەیە، کێ دەتوانێ هاوپەیمان و دۆستی بێت، بێگومان کەسێك یاخود لایەنێك دەتوانێت هاوپەیمانی بێت کە شێوازی بیرکردنەوەو ئاستی کامڵ بوونی عەقڵی وەك PKK بێت، بەڵام لەم حاڵەتەشدا هاوپەیمانانی PKK دووچاری گرفتێکی زۆر دەبن لەگەڵ PKK، چونکە ئەگەر بگەڕێنەوە سەر شێوازی هاوچەرخانە لەسیاسەتدا هەر بیروڕای عەسکەرتاری رابەریان بێت دیسان دوچاری گرفت دەبن، چونکە PKK گۆڕەپانی خەباتی عەسکەریو سیاسی دەباتە ئەو ناوچانەو بیر لەخۆسەپاندن دەکاتەوە، بەڵام دیارە هاوپەیمانانی PKK لەباشوردا دەخوازن هاوکاری PKK بکەن، بەمەرجێك چالاکیەکانیان بگوازنەوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کابینەی سێیەمی حکومەتی هەرێم، چونکە ئاشکرایە بەپێی سیستەمی عەسکەرتاری دوو هێز لەناوچەیەکدا پێکەوە ناحەوێنەوە هەر دەبێت یەکیان باڵا دەست بێت، هەر لەبەر ئەوەشە دەبینین ناوە هێزەکانی PKKو هاوپەیمانەکانی دووچاری گرفت دەبن لەبەرانبەر یەکتردا، چونکە PKK لەهەر ناوچەیەکدا بێت خۆی بەحیزبی دەسەڵاتدار دەزانێت و خەون بەحوکمێکی موتڵەقەوە دەبینێت.

٢-باڵا دەست بوونێکی دیکتاتۆرانە لەلایەن تاکە کەسێکەوە:

هەر بەپێی تێپەربوونی کات و ئاڵوگۆڕییەکان هەرەمی رێکخستنی PKKوە هاوپەیمانەکانی دووچاری شکستی ناوخۆیی دێن چونکە هەڵسوڕاندن و بڕیار لەکارەکانی حیزب دا لەدەستی یەك کەسدا کۆبۆتەوەو هەموو قودسیەت و سەروەریەك بۆ ئەو دەگەڕێتەوە (عبداللە ئۆج ئالان و هاوبیرانی تری ئۆج ئالان)، کەواتە حیزبێك بەم جۆرە بێت درێژی ژیان و چالاکیەکانی حیزب بەندە بەئاستی ژیانی کەسی یەکەمی حیزبەوە، چونکە کەسانی پاش کەسی یەکەم رازی نابن لەناوخۆیاندا یەکێکی تر بکەنە دیکتاتۆر بەسەر خۆیانەوە، زەحمەتیشە بەخێرایی بتوانن بگەڕێنەوە سەر رەوتێکی دیموکراتیانەو رۆحی بڕیاردانی بەکۆمەڵ (القرار الجماعي) قبوڵ بکەن، لەبەر ئەوە لێرەدا دەتوانین بگەینە ئەو بڕوایەی کە مەودای

ژیان و چالاکی حیزبێك ئەمە شێوازی کارکردنی بێت مانەوەی بەندە بەژیانی کەسی یەکەمی حیزبەوە، کەواتە PKKو هاوپەیمانانی لەباشوردا چارەنووسی دوارۆژیان دیار نیەو لەهەموو ساتێکدا ئامادەیی ئەوەیان تیادا بەدی دەکرێت کە دووچاری کەرت بوون (انشقاق) و لەناوچوون بن.

٣-تاکە ئامانج مانەوەیە: دەبینین PKK ئامانجەکانی خۆی کە خەباتی بۆ دەکات بەپێی بەرژەوەندی سەرۆکایەتی PKK دەگۆرێت و ئامانجێکی جێگیری نیە کە لەباشووردا بەدی دەکرێت، دەبینین کە خەبات لەباشوری کوردستاندا بەرەو پێشەوەچووە (ئۆتۆنۆمی- فیدرالی) ئەمەش نیشانەی خەباتگێڕیو واقیع بینی سەرکردایەتی شۆڕشی باشووری کوردستانە، بەلاّم PKK لەبەر ئەوەی بەتیرۆرو تۆقاندن خۆی بەسەر گۆڕەپانی باکووردا سەپاندووەو رێگە لەگشت حیزبەکانی تری باکوور دەگرێت کە خەبات لەپێناو بەرژەوەندی بالاّی نەتەوەکەمان بکەن لەباکوری کوردستاندا، کەواتە PKK تاکە ئامانجی سەرکەوتنی نەتەوەکەمان نیە ئەوەندەی مەبەستیان مانەوەی خۆیانەو لەبەر ئەوەی دووچاری شێواوییەکی زۆر بوون لەبڕیارداندا، وەك دەبینین PKK ماوەیەك داوای سەربەخۆی کوردستان دەکات پاشان فیدراڵیو لەکاتی شکستدا کە لەم دواییانەدا تووشی بوون بەمافە رۆشنبیرییەکانی نەتەوەی کوردی بن دەستی تورکیاو دانوستان لەگەڵ حکومەتی تورکیا رازی بوون. لێرەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی لەکوردستانی بندەستی تورکیادا بۆشاییەك دروست بووە لەخەباتدا بەتایبەتی لەڕووی سیاسیو دبلۆماسییەوە کە حیزبەکانی تری باکووری کوردستان دەتوانن بەزوویی ئەو کەلێنە پڕبکەنەوە، تاوەکو خەباتی رەوای نەتەوەکەمان لەباکوردا بەلاڕێدا نەبرێت.

بەروانین لەسیاسەت و ئامانجی ئەو حیزبانەی لەباشووردا هاوپەیمانی PKK دەکەن دەبینین لەنەفسیەت و شێوازی خەبات و بیر کردنەوەیان زۆر لەیەك نزیکن و شیعارات و ئامانجەکانیان شێوازێکی لاستیکی (مطاطي) لەخۆ گرتووە، وەك ئاشکرابووە لەناو ئەم جۆرە دروشمانەدا بەئاسانی دەتوانرێت لەکاتی ئاستەنگەکاندا بەرژەوەندی حیزب بپارێزرێو بەرژەوەندی نەتەوەش بخرێتە پشت گوێ، لەکۆتاییدا بڕوایەکمان لا دروست دەبێت هیچ کەسایەتیەك یاخود حیزبێك ناتوانێ هاوپەیمانی PKK بێت ئەگەر وەك ئەو سەرلێشێواو نەبێت، وە چارەنووسی داهاتووشیان وەك چارەنووسی PKK تەماوی نادیار دەبێت.

* ئەم وتارە لەژمارە ١٩ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی دووەم- رۆژی ١٩٩٧/٧/١٧ بلاّوکراوەتەوە.

# ئامانجی PKK
# لە (کۆنگرەی نەتەوەیی)دا

ماوەیەکە PKK سەدایەکی ئیعلامـی گـەورەی خسـتۆتە کـار، گوایـە هـەوڵ دەدات (کۆنگـرەی نەتـەوەیی) گـرێ بـدات و بـۆ ئـەم کـارەش لەهـەوڵێکی بەرفراواندایـە بـۆ کۆکردنەوەی دەنگ لەریزی حزب و کەسایەتیە کوردستانییەکان، هەر چەندە ئێمـە لـە YNDK بەسـتنی (کۆنگـرەی نەتـەوەیی) بـەکارێکی بـاش و هـەوڵێکی نەتەوەییانـە دەزانـین بـۆ ئـەوەی ببێتـە بنەمایـەك بـۆ بنیـات نـانی یـەکێتی نەتـەوەییمان (وحـدة القومیة)و دروست کردنی بڕیاری سیاسی یەککگرتوو لـەناو نەتـەوەی کورددا، بـەڵام ئـەوەی جێگـەی سـەرنج دانـە ئەوەیـە کـە (PKK) دەیـەوێت لەرێگـەی کـارکردن بـۆ کۆنگرەی نەتەوەیی خۆی لەو قەیرانە رزگار بکات، کە دووچاری بۆتەوە لەکوردستان بەتایبـەتی لەناوچەکـەدا بەگشـتی، چونکـە PKK خـاوەن ئـیرادەو بڕیـارێکی سیاسـی سەربەخۆ نی‌یە، تاوەکو بتوانێت کۆنگرەیـەکی نەتـەوەیی لـەداهاتوودا دابمـەزرێنێت، هەرچـەندە هـەوڵدان بۆ بەسـتنی کۆنگرەی نەتـەوەیی‌و کـاری لـەم جۆرە کـارێکی تـازە بابـەت نی‌یـە لەلایـەن PKK وە، چونکـە PKK پێشـتریش (پەرلـەمانی مـەنفاو بـەرەی سەرخۆبوون و پارتی ئازادی کوردستان– پاك)ی دروست کرد، تـاوەکو لەرێگـەی ئـەو کارانـەوە خـۆی بخزێنێتـە نـاو باشووری کوردسـتان و ئـەزموونی دیموکراتـی باشـور لەکەدار بکات و گرفتی بۆ دروست بکات، بۆیە دەبینین کە PKK هەر لەسەرەتای کارو بەسـتنی کـۆڕو کـۆبوونـەوە بۆ کۆنگـرەی نەتـەوەیی جـەخت دەخاتـەوە سـەر کارەکـانی پێشـتری کـە تـەنیا دژایـەتی کردنـی پەرلـەمان و حکومـەتی کوردسـتان بـووە، کەواتـە PKK هـەوڵ دەدات بەهـەر چ شـێوەیەك بـۆی بکرێـت حکومـەتی باشـووری کوردسـتان دووچـاری گرفـت بکـات، دەنـا (کۆنگـرەی نەتـەوەیی) دەبێـت ئامـانجی پێکـهێنانی یـەکریزی نەتـەوەییمان بێـت، نـەك دژایـەتی کردنـی خـەباتی رزگـاری نەتـەوەییمان لەباشووری کوردستاندا، لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیاری هەوڵدان بۆ بەستنی کۆنگرەکە PKKیـەو بـڕوای بەپـەیرەو کردنـی سیسـتەمی دیموکراتـی نییـە لەبـەڕێوەبردنی

کارەکاندا، سەرجەم ئەو حزب و لایەنانەی بەشدارن لەکارکردن بۆ بەستنی کۆنگرەکە لەکۆتاییدا دوو ڕێگەیان لەبەردەمدایە، یان دەبێت خۆیان تەسلیم بەئیرادەو خواستی PKK بکەن، یاخود دەست کێشانەوەی خۆیان رابگەیەنن، چونکە PKK ناتوانێت لەکوردستاندا هیچ دەسەڵاتێك قبوڵ بکات کە لەسەرووی ئەوەوە بێت، تەنیا دەسەڵاتی ئەو حکومەتانە لەسەرووی خۆیەوە دەبینێت کە داگیرکەری کوردستانن و سیاسەتی PKK دادەڕێژن، واتە PKK خاوەن سیاسەتێکی سەربەخۆ نییە بتوانێت ئازادانەو بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەییمان کار بۆ پێکهێنانی کۆنگرەی نەتەوەیی بکات.

لەلایەکی ترەوە دەبینین ئەو حزبانەی بەشداری لەکۆڕو کۆبوونەوەکاندا دەکەن بۆ دامەزراندنی (کۆنگرەی نەتەوەیی)، هەر یەکەیان مەبەست و ئامانجێکی جودای هەیەو هەوڵ دەدات لەو کۆنگرەیەدا بەدەستی بهێنێت، بۆیە دەبینین کە هەندێك لەحزب و ڕێکخراوە سیاسی‌یەکان ئەزموونێکی ئەوتۆیان لەگەڵ PKKدا نییەو بەشدارییان لەکارەکاندا کردووە، کە زۆر زەحمەتە بزانن چارەنووسی ئەو کارەیان چی بەسەردێت کە PKKی سەرکێش و سەرەڕۆ جڵەوی گرتۆتە دەست، وە دڵنیاشین لەکۆتاییدا سەرجەم نەتەوە پەروەران و وڵاتپارێزان، چ حزبەکان یاخود کەسایەتیە نەتەوەییەکان خۆیان لەو کارانە دەکێشنەوەو حەقیقەتی PKK یان بۆ دەردەکەوێت و تێدەگەن کە کاری PKK یەکبوونی نەتەوەییمان نییە، بەڵکو دژایەتی کردنی بزوتنەوەی رزگاری خوازی نەتەوەیی کوردە.

بەڵام هەندێك لایەنی تر وەك (هاوپەیمانی دیموکراتی) کە دیارە ئەو هاوپەیمانێتیەیان بۆ دژایەتی کردنی حکومەتی باشوور دامەزراندوەو هیچ بنەمایەکی فیکری ئەوتۆیان نییە تاوەکو تیایدا یەك بگرنەوە، تەنیا لەوەدا یەك دەگرنەوە کە دژایەتی پەرلەمان و حکومەتی باشووری کوردستان بکەن، وەلایەنەکانی ناو (هاوپەیمانی دیموکراتی) هەوڵ دەدەن لەڕێگەی کارکردن بۆ کۆنگرەی بەناو (نەتەوەیی) هەندێك سوودی مادییان دەست بکەوێت، چونکە حزبەکانی ناو (هاوپەیمانی دیموکراتی) شوێن کەوتووی بڕیاری سیاسی (YNK)ن و چارەنووسی خۆیان بەچارەنووسی (YNK) وە گرێ داوەو بۆ خەڵکی باشووری کوردستانیش دەرکەوت کە ئەو هاوپەیمانێتیە لەکاتی شەڕو ئاشتیشدا هیچ سەنگێکیان نەبوەو ناشتوانێت کاریگەرییان هەبێت لەسەر تەرازووی هێزەکان و گۆڕانی بەسەردابێنن.

ئەوەی جێگەی سەرنجە کە لەسەرەتای کارکردن بۆ کۆنگرەکە (YNK) وەك هێزی دووەم دەرکەوت، بەڵام هەر پاش ماوەیەکی کەم ساردییەك هەستی پێکرا، نەك لەبەر ئەوەی (YNK) بۆی دەوکەوتبێت کە ئەو کۆنگرەیە لەخزمەتی نەتەوەی کورددا نی یە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە (YNK) بۆی دەرکەوت،٭کە هێزی PKK نەیتوانی لەو قەیرانە مادیو سیاسیو عەسکەرییە رزگاری بکات کە لەئەنجامی شەڕ کردن لەدژی پارتی دیموکراتی کوردستان و حکومەتی باشووردا دووچاری هاتبوو ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە (YNK) بەئاواتەوەیە بەهەر چ شێوەیەك بووە وەك هێزی یەکەم لەگۆڕەپانی باشووری کوردستاندا دەربکەوێت و سەرجەم ئەو کەس و لایەنانە سەرکووت بکات کە کاردەکەنە سەر بەرژەوەندییەکانی و ململانێی دەکەن، بەڵام لەکاتێکدا سەیری کرد ئەگەر کۆنگرەی نەتەوەیش دابمەزرێت ئەوا هەر دەبێت گوێڕایەڵ و پاشکۆی سیاسەتی PKK بێت،و بەهۆی کاری ناشەرعی PKKشەوە چەندین رێگری ناوچەییو نێو دەوڵەتیشیان بۆ دروست دەبێت، کەواتە (YNK) بۆی دەرکەوت کە لەرێگەی کارکردن بۆ کۆنگرەی نەتەوەییو هاوکاری (PKK)وە ناتوانێت ببێتە هێزی یەکەم لەباشووری کوردستاندا، وە ناشتوانێت بەرێگەی شەڕو کوشتار هیچ مەرجێك بەسەر ئیرادەی نەتەوەی کورددا بسەپێنێ کە خۆی لەپەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا دەنوێنێت، سەرەڕای ئەوەی (YNK) خۆشی گومانی لەوە هەیە کەناتوانێت لەگەڵ PKKی تیرۆریستدا وەك هێزی دووەم لەگۆڕەپانی سیاسیدا بوونی هەبێت، کەواتە باشترین چارەسەر ئەوەیە بۆ ئەوەی YNK قەوارەی سیاسیو جەماوەری خۆی بپارێزێت، ئاشتی بکاتە تاکە رێگا بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی خۆی لەگەڵ (پارتی دیموکراتی کوردستان)و حکومەتی باشووردا.

لەئەنجامی ئەو لێکدانەوەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە هەر لەسەرەتای کارەکانەوە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان بیرو بۆچوون و ئامانج لەبەشداری کردنی حزب ولایەنە سیاسیو بەشداربووەکانی کارکردن بۆ کۆنگرەکە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا نیشانەی هەرەس هێنانی ئەو کارەیە کە PKK دەیەوێت، ئامانجەکانی خۆی تیادا بەدی بهێنێت، چونکە زاراوەی (کۆنگرە) بۆ ئەو کارەی (PKK) دەیەوێت بیکات ناگونجێت، تەنانەت زاراوەی (بەرە– الجبهه) ناتەبایە لەگەڵیدا، لەبەر ئەوەی لەناو (بەرە)شدا، دەبێت سەرجەم حزب و لایەنە بەشداربووەکان چەند ئامانج و بیرێك کۆیان بکاتەوەو هەوڵی بەدەست هێنانی بدەن، وە نەتەوەی کوردیش ئەوەندە

چەوسانەوەی جیاوازو سیاسەتی جینۆسایدی جیاوازی بەسەردا سەپێنراوە لەهەر پارچەیەکدا، دەبێت بەشێوەیەکی وردو یەکگرتووانەو دوور لەشەڕی ناوەخۆو بەکارهێنانی توندوتیژی باس لەخاڵە بنچینەیەکانی کۆنگرەی نەتەوەیی بکات، بەمەبەستی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەییمان، وەکارێکی نەتەوەییە کە نەتەوەی کورد لەباشووردا پێش هەر کارێك بیر لەوە بکاتەوە کە تاچەند لەبەرژەوەندی حکومەتی باشووردایە، چونکە رۆشنایی رزگاری نەتەوەییمان لەباشووری کوردستاندا دەرکەوتووە، بەلاّم لەکاتێکدا پەرلەمانی کوردستان خاوەن شەرعییەتە لەگشت بڕیارێکی چارەنووس سازدا، چۆن دەتوانین شەرعییەت بدەینە کاری لایەنێك کە خۆی جێگەی گومان بێت لەناو دەروونی ولاّتپارێزانی باشووردا و هیچ شەرعیەتێکی یاسایی و نێو دەوڵەتی نەبێت لەناوچەکەدا، هەر بۆیە ئەگەر نەتەوەی کورد لەباشووردا بەوردی مامەڵە لەگەلّ کارەکانی PKK نەکات و رێگەی لێ نەگرێت، دوور نی‌یە کە کارکردن بۆ (کۆنگرەی نەتەوەیی– PKK) ببێتە هۆی دروست بوونی گیروگرفتی زیاتر بۆ کوردستان، نەك بنیات نانی یەکریزی نەتەوەییمان، کەواتە کارکردنی PKKی گومان لێکراو بۆ کۆنگرەیەکی لەو جۆرە هیچ بەرهەمێکی باشی بۆ نەتەوەی کورد نابێت، تەنیا سەرنج راکێشانی زیاتری دوژمنانی نەتەوەیی کورد نەبێت بۆ باشووری کوردستان.

سەرەڕای ئەوەی کەحزبە کوردستانییەکان دەزانن کە هەڵسوڕێنەری سەرەکی کارکردن بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی PKKیە، وە PKKش هەر لەسەرەتاوە دژایەتییەکی تەواوی پەرلەمان و حکومەتی باشوورو حزبە هاوپەیمانەکانی دەکات، کەواتە گشت حزبە بەشداربووەکان یان دەبێت پشتگیری لەحکومەتی باشووری کوردستان بکەن، یان دەبێت پشتگیری لەسیاسەتی ناواقیعیانەی PKK بکەن، چونکە PKK (پەرلەمانی مەنفا) بەشەرعی دەزانێت نەك پەرلەمانی هەڵبژێردراو لەلایەن خەڵکی باشووری کوردستانەوە، وە دەیەوێت (فیدراسیۆنی دیموکراتی) دابمەزرێنێت لەبری فیدرالیزم بۆ باشوری کوردستان، چونکە PKK بەئاشکرا لەساڵی ١٩٩٥ دا (بەرەی سەربەخۆبوونی)ی راگەیاندو هەندێك لەحزبە کوردستانییەکان پشتگیری ئەو بەرەیان کرد، گوایە (فیدراسیۆنی دیموکراتی) لەنێوان باکوورو باشووری کوردستاندا ئاوا دەکەن و ئەم سیستەمە خەیاڵییەش ناوچەکەش دەگرێتەوە لەئەنجامدا PKK

شەڕێکی سەختی بەدژی ئەزموونی دیموکراتی نەتەوەی کورد لەباشووردا هەڵگیرساند.

مەسەلەی دیموکراتیەتیش کە بنەمایەکی بنچینەییە بۆ سەرکەوتنی هەر کۆنگرەیەك، دەبێت هەر لەسەرەتای کارکردن بۆ (کۆنگرەی نەتەوەیی)دا بەدی بکرێت، ئەگەر نەبوو ئەوا نابێتە کۆنگرەیەکی شارستانیو شەرعی، بەڵکو دەبێتە بازنەی کۆکردنەوەی حزب و کەسایەتییەکان و چەسپاندنی یاسایەکی دیکتاتۆرانە بەسەریاندا، وە ئاشکراش بووە کە سیستەمی دیموکراتیانە لەگەڵ عەقڵی سەرکردایەتی PKKدا ناتەبایەو ناتوانێت لەرێگەی گفتوگۆو شێوازی دیموکراتیانە کارەکانی ئەنجام بدات، هەر بۆیە لەسەرتاوە هەوڵی داوە بەشەڕو کوشتار جێگەی خۆی لەباشووردا بکاتەوە، هەوڵیشی‌دا کە بەرێگەی سەربازیو شەڕ کردن وا لەپەرلەمان و حکومەتی باشوور بکات کە بەشداری بکەن لەو کارانەدا کە PKK بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی پێی هەڵدەستێت کە ئەمەشی بۆ نەهاتەدی، یاخود لەرێگەی پشتگیری مادی بۆ هەندێ حزبی باشوورو سود وەرگرتن لەبارودۆخی باشووری کوردستانی هەوڵی‌دا هەندێك حزب لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، دیارە کە (هاوکاری مادیو بەکارهێنانی توندو تیژیش) دژی بنەماکانی دیموکراتیەتە لەجیهانی ئەمڕۆدا، وە هەر لەسەرەتایی کارەکانی PKKوە بۆ کۆنگرەی نەتەوەیی، پەرلەمان و حکومەتی باشوورو حزب و کەسایەتییە نەتەوەییەکان هیچ شەرعییەتێکیان پێ نەدا چونکە شارەزاییەکی تەواوی عەقڵی سەرکردایەتیو ئیرادەو توانای PKK بوون کەکارو کردەوەکانی PKK بۆ باشووری کوردستان هەر لە (پارتی ئازادی- پاك و پەرلەمانی مەنفاو بەرەی سەرخۆبوون و..) هیچیان لەسەر رووی واقیعدا جێگەیان نەبۆتەوە،و نەتەوەی کورد بۆی دەرکەوت کەهەموو کارەکانی PKK ناوی گەورەو ناوەرۆکی بەتاڵەو تەنیا بۆ دژایەتی کردنی نەتەوەی کورد لەباشوورو زیان بەدۆزی نەتەوەییمان دەگەیەنن لەناوخۆو دەرەوەدا، نەك گەیاندنی سوودو بەرژەوەندی بۆ نەتەوەی کورد، دەنا خۆ (YNDK) بە پەرۆشەوە بیری لە بەرژەوەندی باڵای نەتەوەییمان کردۆتەوەو کۆنگرەی نەتەوەیش بەکارێکی دڵسۆزانەو پێویست دەزانێت. بەڵام (کۆنگرەی نەتەوەیی)ش هەلومەرج و باودۆخی خۆی هەیە، نەك لەژێر پەردەی بیری نەتەوەییو کۆنگرەی نەتەوەییدا هەوڵی تێکدانی ئەزموونی باشووری کوردستان بدرێت، چونکە کارکردن بۆ کۆنگرەی نەتەوەییو پێك هێنانی یەکێتی نەتەوەیی (الوحدة القومیة)

پێویستی بەدەنگدانی جەماوەری هەیەو وە کۆمەڵێك ڕێگری ئیقلیمیمان لەپێشدایە، کە دەبێت نەتەوەی کورد زۆر بەوردیو سیاسییانە هەلسوکەوتیان لەگەڵدا بکات تاوەکو دەگاتە قۆناغی رزگاریو سەربەخۆیی کوردستان، ئەوەتا دەبینین دەوڵەتانی عەرەب سەرەڕای بوونی کیانی سیاسی سەربەخۆی خۆیان، تائێستا چەندین ڕێگری ناوخۆییو نێو دەوڵەتییان لەپێشە کە ناتوانن ببنە خاوەن بڕیارێکی سیاسی یەکگرتوو لەبەرانبەر ئەو گرفتانەی کە دووچارییان دەبێتەوە، ئیتر ئێمەی کوردی پارچە پارچە کراوی بن دەست چۆن بتوانین لەسایەی بارودۆخێکی ئاوادا بەئاشکراو بەو خێراییە بانگەشەی بەستنی کۆنگرەی نەتەوەیی بکەین، کە پێویست بوو PKK ئەگەر دڵسۆزی کێشەی رەوای نەتەوەییمانە دەبووا پێش هەر شتێك هەوڵی بدایە کەشەڕی ناوخۆی کوردستان و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی چارەسەر بکردایە، تاوەکو بتوانرایە کاری باشترو واقیعی تر ئەنجام بدرایە، دەنا خۆ لەستراتیژی (YNDK)دا بنیات نانی دەوڵەتی سەربەخۆی نەتەوەیی کوردو پێك هێنانی یەکێتی نەتەوەییمان کارێکی حەتمی‌یەو هەردەبێت بێتەدیو وە تاکە چارەسەریشە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی کوردو بڕانەوەی ناکۆکی لەناوچەکەدا. بۆ بەستنی کۆنگرەی نەتەوەیی بەر لەهەر شتێك دەبێ ئاشتیەکی سەرتاسەری لەکوردستان هەبێت بۆ ئەوەی تەواوی هێزو لایەنە سیاسییەکان بتوانن بەشداری کۆڕو کۆبوونەوەکان بن و بیروڕای خۆیان لەسەر ئەم کۆنگرەیە دەربڕن نەك چەند حزبێك بۆ مەرامێکی تایبەت بەم کارە هەڵسن لەبەر ئەوەی ئەم پرسە پرسێکی نەتەوەییە بۆ ڕای گشتی نەتەوەکەمانی پێویستە، ئەگەرنا هەر هەوڵێك دوور لەخواستی رەوای نەتەوەکەمان بێ ئەنجام دەبێت.

* ئەم وتارە لەژمارە (٢٧)ی رۆژنامەی میدیا- رۆژی ١٩٩٨/٢/١ بڵاوکراوەتەوە.

# PKK

# پاش قۆناغی تیرۆریستی ناوچەیی؟!

هەر لەکاتی هاتنە مەیدانی PKKوە بۆ ناو کاری سیاسیو چەکداری لەکوردستاندا، هەوڵی داوە کەرووی درێژی خۆی لەگشت لایەك بشارێتەوەو بەهەر چ شێوەیەك بووە جێ دەستی خۆی لەناو خەباتی رزگاری خوازانەی نەتەوەیی کورددا بکاتەوە، بەڵام لەئەنجامی درێژە کێشانی خەباتی رزگاری نەتەوەییمان و گرنگی پەیداکردنی کێشەی رەوای نەتەوەییمان لەئاستی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بەتایبەتی لەباشووری کوردستاندا PKK هەوڵیدا کە بەهەرچ شێوەیەك بووە نەیەڵێت نەتەوەی کورد لەباشووردا بەئامانجەکانی خۆی بگات، سەرەتایی دەست پێکی ئەم کارەشی لەرێگەی ئیدعا کردنەوە بوو بۆ بیری نەتەوەییو سەربەخۆ بوونی کوردستان، تاوەکو لەم رێگەیەوە بتوانێت شەرعییەت بداتە کارە تیرۆریستەکانی خۆی لەباشووردا و لەهەمان کاتیشدا بتوانێت چەکدارەکانی بۆ شەڕ کردن بەدژی پەرلەمان و حکومەت ئامادە بکات، بەڵام پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری سەرکردایەتی PKK بەهاوکاری دەوڵەتی دوژمن بەکوردو جار جارەش بەپشتیوانی هەندێ حیزبی باشووری کوردستان، هەوڵێکی زۆریدا کە ئەم ئەزموونە دیموکراتیەی باشوور لەبار بەرێت و گۆڕەپانێکی فراوانتری بۆ ئاوەڵا ببێت بۆ ئەوەی بتوانێت کاری قاچاخچێتیو بازرگانی کردنی نارەوای خۆی تیادا بکات، بەڵام بەهۆی خۆڕاگری حکومەت و پەرلەمانی کوردستان توانرا کە هەموو نیازە خراپەکانی PKK زیندە بەچاڵ بکرێت.

لەم دوایانەشدا PKK رێگەیەکی سەیرو سەمەرەو نوێی گرتۆتە بەرو بەیەکجاری کرێ گرتەیی خۆی بۆ داگیرکەران لەکوردستان راگەیاند، ئەویش لەرێگەی ئەو قسانەی کە (عبدالله اوج ئالان)ی سەرۆکی PKK لە گۆڤاری (ألوسط)و لەدواترین ژمارە (١٢٨٥٧) رۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنی رۆژی (١٧)ی ئایاری ١٩٩٨ درکاندی،

کە تائێستاش رژێمی بەغدای داگیرکەری کوردستان جورئەتی نەکردووە بەو راشکاوییەوە قسەی لەو بابەتە بکات، بەڵام ئەگەر PKK کەمێك ویژدانی نەتەوەیی هەبوایە نەدەبوو لەکاتێکی وەهاداو بەتایبەتی بەدرێژایی ژیانی سیاسی خۆشی قسەی نابەجێی بەو جۆرەی بکردایە، لەکاتێکدا نەتەوەی کورد بۆ ئەوەی بەیەك دەنگیو یەکڕیزییەوە بەشداری لەحیواری کورد- عەرەب بکات، پێویست بوو کە سەرجەم کێشە ناوخۆییەکانی خۆمان بەلاوە بنێین و زیاتر بایەخ بە بەرژەوەندی نەتەوەییمان بدەین، لەبەر ئەوەی هیچ هەستێکی نەتەوەیی لەدەروونیدا نەماوە زەحمەتە بتوانرێت چاوەڕێی هەڵوێستی لەو بابەتەی لێ بکرێت.

لێرەوەش هەڵوێستەکانی PKK بەرانبەر بە باشووری کوردستان لێك دەدەینەوە کە رێگە لەهەموو گومانێك دەگرێت و بەئاشکرا کرێ گرتەیی خۆی بۆ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان رادەگەیەنێت، چونکە لەسەرەتای راپەڕین و هاتنە مەیدانی PKK بۆ باشووری کوردستان و دژایەتی کردنێکی راستەوخۆی ئەزموونی دیموکراتی باشووری کوردستان و حکومەت و پەرلەمانی کوردستان، بەشێك لە خەڵکی کوردستان بڕوایان نەدەکرد یاخود گومانیان هەبوو لەوەی کە PKKی تیرۆریست کرێ گرتەی داگیرکەرانی کوردستانەو تەنانەت هەندێك حیزبی باشووری کوردستانیش هاوپەیمانییەتی PKK یان دەکردو هاوشانی PKK ش شەڕیان هەڵگیرساند بەدژی حکومەتی کوردستان، هەر چەندەش کە لەساڵانی ١٩٩٢-١٩٩٥-١٩٩٧و ئێستاش ١٩٩٨ هەر بەردەوامە لەدژایەتی کردنی بەرژەوەندی باڵای نەتەوەییمان لەباشووری کوردستان و تەنانەت لەپارچەکانی تری کوردستانیشدا، بۆ نموونە کوردستانی بندەستی سوریا کە بە بەشێك لەخاکی سوریا دادەنێو دیارە کە PKK کوردستانی بندەستی ئێرانیش بە بەشێك لەخاکی ئێران دەزانێت، بۆ سەلماندنی ئەو هەڵوێستانەی خۆشی بێ هیچ هۆو پاساوێك لەڕۆژی (١٩٩٨/٦/١) هێرشێکی ناڕەوایان کردۆتە سەر پێشمەرگەکانی (یەکێتی شۆڕشگێڕانی گەلی کوردستان) و لەئەنجامدا ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی یەکێتی شۆڕشگێڕانو و چەند هەڤاڵێکی تریان شەهید کردبوو.

هەر بەهۆی درێژە پێدانی کارە ناڕەواکانی PKK، حکومەتی باشووری کوردستان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە لەپێناو بەرژەوەندی نەتەوەییمان دەبێت PKK گۆڕەپانی باشووری کوردستان بەجێ بهێڵێو ڕوو بکاتەوە گۆڕەپانی راستەقینەی خۆی کە

باکووری کوردستانه، بەڵام سەیر لەوەدایە کە کورد لەباشووردا داوای کشانەوەی هێزەکانی PKKی کرد کەچی داگیرکەرانی کوردستان هەوڵ دەدەن PKK بێننەوە باشووری کوردستان بۆ خزمەت کردن و بەئامانج گەیاندنی نەخشە دوژمنکاریەکانی خۆیان بەرانبەر باشووری کوردستان، لێرەوەش دەگەینە ئەو بڕوایەی کە PKK وەك پارتێکی باکووری کوردستان هەڵسووکەوت ناکات، بەڵکو ناشیەویو ناشتوانێت بەو شێوەیە بێت و دەست بەرداری هەڵوێستی دوژمنکارانەی خۆی بێت، لەبەر ئەوە چیتر پێویست ناکات جەماوەرو پارتە سیاسییەکانی باشوور بەچاوی پارتێکی باکووری کوردستانییەوە سەیری PKK بکەن، چونکە دڵنیاین لەوەی کە جەماوەری وڵاتپارێزی باکوور هەستێکی نەتەوەییانەو دڵسۆزانەیان بەرانبەر بەحکومەتی باشوور هەیەو باشووری کوردستانیش بەبەشێکی گرنگ لەکوردستانی مەزن دەزانن، بەڵام PKKی کرێ گرتە، بەشانازییەوە باشووری کوردستان بەخاکی عەرەب و بەبەشێك لەدەوڵەتی عەرەبی دادەنێت، کەواتە بێ دوو دڵیش ئەگەر رۆژێك لەکوردستانی باکووردا پارتێکی نەتەوەیی باڵادەست بێت و حکومەتی تورکیاش رێگە بە PKK بدات و هاوکاری بکات کە شۆڕشگێران تیرۆر بکات، لەبەرانبەریشیدا هەندێك ئیمتیاز مافی بازرگانیو تیرۆریستی بداتە PKK، ئەوا ئەو کاتە (عبدالله اوج ئالان) دەڵێت کە کوردستانی باکوور، کوردستان نییەو خاکی تورکیایە.

کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە PKK پارتێکی کوردی نییەو نەك هەر تەنیا تیرۆریستێکی ناوچەییە، بەڵکو کرێ گرتەیەکی ناوچەیشە بۆ دژایەتی کردنی مافە رەواکانی نەتەوەیی کورد بەپێی بەرژەوەندی داگیرکەران لەیستۆکانە بەکار دەهێنرێت.

* ئەم وتارە لەژمارە (٣٣)ی رۆژنامەی میدیا- رۆژی ١٩٩٨/٦/٥ بڵاوکراوەتەوە.

# هەڵوێستەکانی PKK نیشانەی ونبوونی عەقڵی سیاسیانە

دەتوانـــین بڵێــین PKK لەســـەرەتایدا هـــەوڵی داوە سیاســـیانەو بـــەپێی بەرژەوەندییەکانی خۆی مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکاندا بکات و هەوڵی خۆ گونجانیشی داوە لەگـەڵیاندا (کـە دەرکـەوت لێرەشـدا مەبەسـتی خۆسـەپاندن بـوو بەسـەر دەوروبەرەکـەیدا)، بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی کـە PKK قۆنـاغی کـاری سیاسـی خـۆی بەشڵۆقترین قۆناغ هاتە بەرچاوو لەکارەکانیشیدا دووچاری قەیرانی سیاسـی بـوو. نەشیتوانی چارەسەری ئەو گرفتە فکریو سیاسییانە بکات کە لەواقیعی رۆژانەیدا ڕووبەرووی دەبووەوە، ئەمـەش بـەهۆی لاوازی بـیری سیاسـیو بەهەڵـە تێگەیشـتنی PKK لەواقیعی کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستان بوو، لەئەنجامی ئەم شکستە مەزنەشدا ناچار PKK ڕێگایەکی نامۆی بەبزووتنـەوەی نەتـەوەییمان گرتەبەر، ئەویش ئەوەبوو کە قۆناغی شکستی سیاسی خۆی گۆڕیو بەرژەوەندی نەتـەوەییمانی پشـت گـوێ خسـت و بـەرەو کـەنارەکانی تیرۆریسـتیو کـرێ گرتـەیی ملـی ڕێـی گـرت و لـەدوا جاریشدا هەر لەو ناوەندەدا ئۆقرەی گرت.

کەواتە PKK بەهۆی داڕمان و هەرەس هێنانی لەگۆڕەپانی سیاسـیو دبلۆماسـیدا وای لێهات کە بەلاڕێدا بچێت و وزەو توانای چەندەها مرۆڤی کورد بخاتە خزمەت بەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردسـتان، کە ئەمـەش زیانێکی گـەورەو گرفتێکیشـی بـۆ بزوتنەوەی کوردایەتی دروست کردووە، ئاشکرایە کە ئەم کارانـەی PKKش بەبڕیارو قەناعـەتی سـەرۆکایەتی PKKو عـەبدوڵڵا اوج ئـالانی سـەرۆکی PKK بـووە، کەواتـە دەبێـت کەسـانی وڵاتپـارێزو نەتـەوەیی چـەندە چـاوەڕێی سـەرکردایەتی PKK و هاوکـارانی بکـەن، تادەگاتـە ئـەو بڕوایـەی کـە تەنـها بـیری نەتـەوەیی لەخزمـەت

کێشەکەماندایە. دیارە کارێکی گرانە بۆ سەرکردایەتی لەخۆبایی PKK کە بتوانێت خۆی لەباوەشی داگیرکەران رزگار بکات و بگەڕێتەوە نێو مەیدانی خزمەت کردنی بەبیری کوردایەتی، لێرەوەش دەگەینە ئەو بڕوایەی باشترین رێگا چارە ئەوەیە کە بەهەموو تواناییەك هەوڵ بدرێت (چ لەڕێگەی راگەیاندنەوە بێت، یاخود هەر رێگایەکی تر)، بە تەنگ ئەو کەسانەوە بچین کە گیرۆدەی PKK بوون و کەوتوونەتە ناو گێژاوی پڕ لەکارەساتی بڕیارەکانی سەرکردایەتی PKKو هەوڵیش بدەین هەموو ئەو دەمامکانەی سەر رووی PKK هەڵماڵین، کە لەڕێگەی چەندین ئارم و شیعارەوە بۆ خۆی دروستی کردووە، تاوەکو چیتر نەتەوەکەمان نەکەوێتە ناو گێژاوی کارە تیرۆریستییەکانی رێکخراوێکی بێزراوی بەو شێوەیە.

با لێرەشدا پرسیارێك بکەین تاوەکو بتوانین زیاتر دەمامکەکانی PKK هەڵماڵین، ئەویش ئەوەیە ئایا ئەگەر PKK پارتێکی سیاسی کوردستانیە دەبێت چی بخوازێت؟!

ئاشکرایە کە هەر پارتێکی سیاسی کوردستانی دەبێت لەسەر بنەمای بەرژەوەندییە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکانی سیاسەتی خۆی دابڕێژێت و تاکتیك و ستراتیژیشی بخاتە خزمەت بەرژەوەندی نەتەوەییمان. بەڵام PKK لەئەنجامی کارو کردەوەکانی کە تەنیا لەدژایەتی کردنی پەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا بووەو بەدرێژایی دەست بەکاربوونی ئەم دوو دەزگا نەتەوەییەش لەباشووری کوردستاندا (پەرلەمان و حکومەتی کوردستان)، بۆ سەرجەم وڵاتپارێزان و دۆستانی نەتەوەکەمانی سەلماند، کە نەك تەنیا لەپرۆسەی کاری سیاسی‌و خزمەت کردن بەبیری نەتەوەیی دووچاری شکست بووە، بەڵکو دووچاری گێژاوی تیرۆریستی‌و کرێ گرتەیی بۆتەوە، بۆ خزمەت کردنی بەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردستان. لەلایەکی ترەوە بەپێی بارودۆخی سیاسی ئەمڕۆی جیهان گفتوگۆو دانوستان بۆتە تەنیا رێگە چارەیەکی شارستانیانە بۆ چارەسەر کردنی گرفتە ناوخۆیی‌و دەرەکییەکان، بەڵام PKK بەهۆی دابڕانی لەژیانی شارستانیانەی ئەم سەردەمە دووچاری ئەوە بووە، کە دەست تێکەڵییەکی فراوان لەگەڵ (موخابەراتی) وڵاتانی ئیقلیمی وەك عێراق- سوریا- ئێران دروست بکات، بەتایبەتی لەم دواییەدا بۆ رازی کردنی رژێمی عێراق. کوردستانی بن دەستی عێراقی کردە بەشێك لەخاکی عەرەبی، کە ئاشکراشە کوردستانی باشوور تاکە ئاسۆیەکە کە سەرجەم پارچەکانی تری کوردستان چاویان تێ بڕیووە، ئەم

وابەستەییەی PKK لەکاتێکدایە کە سەرجەم نەتەوە ی کورد لەو دەزگا جاسوسییانەی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بێزار بوون و بوونەتە رەمزی شەرمەزاری لای نەتەوەکەمان، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە کە نەتەوەی کورد لەسەر دەستی ئەو دەزگایانە دووچاری ئەو پەڕی سەرکوتکاریو جینۆساید هاتووە، کەچی تازە بەتازە PKK دەیەوێت لەو رێگە ناشەرعییەوە بگەڕێتەوە ناو گۆڕەپانی سیاسی بەمەبەستی زیاتر کۆکردنەوەی سامان بۆ بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی سەرکردایەتی PKK. ئاشکراشە کە دیرۆکی خەباتی رزگاری نەتەوەییمان کۆمەڵێك یاساو نەریتی لەشعوری ولاٌتپارێزاندا دروست کردووە، کە بتوانن زۆر بەئاسانی لەمەبەستە گومان لێکراوەکانی PKK تێبگەن و رووبەڕووی ببنەوەو رێگە نەدەن ئەو کێشەو نەخۆشییانەی کە PKK دەیەوێت لەباشووری کوردستاندا بلاٌوی بکاتەوە هەروا بەئاسانی بۆی بچێتە سەر، چونکە خەڵکی باشووری کوردستان خاوەنی پەرلەمان و حکومەتێکی شەرعییەو بەرگری کردنیش لەو دەستکەوتانە بەکارێکی نەتەوەییانەو مرۆڤانەو بەرەمزی شارستانیەت و پێشکەوتنی عەقڵی سیاسیمان دەزانێت، کەواتە خەڵکی باشووری کوردستان ئامادە نییە لەڕووی دزێوی PKK بێدەنگ بێت، تاوەکو PKK لەدیرۆکی خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەییماندا، ببێتە سمبولی شەرمەزاریو هیچ کەس و لایەنێك لەداهاتوویشدا نەتوانێت رووی خیانەتکارانەی سەرکردایەتی PKK سپی بکاتەوە، کە لێرەشدا تەنیا سەرکردایەتی PKKو هاوکارانی لێپرسراوێتیان دەکەوێتە ئەستۆ.

* ئەم وتارە لەژمارە (٣٤)ی رۆژنامەی میدیا- رۆژی ١٩٩٨/٧/١٥ بلاٌوکراوەتەوە.

# ئۆج ئالان بەدوای ئاشتی یاخود بەردەوامی ژیانی خۆیدا دەگەڕێ؟!

(عەبدوڵلا ئۆج ئالان)ی سەرۆکی PKK هەر لەو ڕۆژەوەی کە لەنایرۆبی دەستگیرکراو، بەفڕۆکەیەکی تایبەتی گوازرایەوە تورکیا... کەهێشتا لەناو فڕۆکەکە دانەبەزیبوو دەستی کرد بە پاکانەو تەنازولاتی سیاسیو مەبدەئی بەرامبەر ئەو کەسانەی کە لەناو فڕۆکەکەدا چاوبەست و قۆڵبەستیان کردبوو، دواتریش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قسەی سەیرو سەمەرەترو نا نەتەوەییانەمان لەزمانی (ئۆج ئالان)ەوە پێدەگەیشت، کە کەناڵە ڕاگەیاندنەکانی تورکیاو دەرەوەی تورکیا جەختیان لەسەر دەکردەوە، کەچی زۆر لە هەواداران و سۆزدارانی PKK پاساویان بۆ قسەکانی (ئۆج ئالان) دەهێنایەوەو دەیانگوت (سەرۆك! لەژێر ئەشکەنجەو تەخدیرو شوشتنەوەی دەماغدایەو ئەو قسانە ئیعتباریان نییە بۆیە ئەم قسانەش دەکرا، چونکە لەمێژووی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەییماندا زۆر سەرکردەو ڕابەری نەتەوەییمان بە پیلانی داگیرکەران دەستگیرکراوەو پاشان لەسێدارە دراون و بەڕێزو نەمریشەوە لەدڵی وڵاتپارێزانی کوردستاندا ماونەتەوە، کەچی ڕۆژێك لەڕۆژان نکوڵیان لەمێژووی خەبات ورەوایی مافی نەتەوەکەیان نەکردووە، هەر بۆیەش شتێکی سەیرو چاوەڕواننەکراو بوو کە (ئۆج ئالان)ێك خۆی بە (سەرۆکی نەتەوەیی!) دادەنا، واخێرا دابروخێت و لەناو فڕۆکەدا دەست بە تەنازولات بکات، لێرەوە دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە لەئەمسەرو سەری مێژووی خەباتی نەتەوەییماندا کەسێکی تری وەك (ئۆج ئالان) نابینینەوە، ئەمەش ڕاستییەك دەسەلمێنێ کە (ئۆج ئالان) نە سەرۆکی پارچەیەکی کوردستان بووەو نە سەرۆکی حیزبێکی شۆڕشگێڕی کوردستانیش، کە خودی (ئۆج ئالان) پێشتر ئیدیعای بۆ دەکرد.

هەرچەندە ئێمە لە YNDK لەو ڕۆژەی کە (ئۆج ئالان) دەستگیر کرا نارازی بووین و هەڵوێستی خۆمان دەرخست، بەڵام کە (ئۆج ئالان) ڕێگە بەخۆی بدات، موقەدەسات و حکومەتی باشووری کوردستان بخاتە ژێر باری شیکردنەوەو قسە دوژمنکارییەکانی خۆیەوەو لەهەمان کاتیشدا سەرکردایەتی حزبەکەی پابەند بوونی خۆیان بەو قسەو گوتارانەی (ئۆج ئالان) ڕابگەیەنن، ئەوا دەبێت ڕێگە بە کەسانی تریش بدرێت، نیاز خراپیو هەڵوێستی نا نەتەوەییانەی ئەو کەسانە ڕوونبکاتەوە، کە لەزێندانەوە بەپێی بەرژەوەندی داگیرکەرانی کودستان بڕیار بۆ حزبەکەی دەردەکات.

دواترین نامەی (عەبدولا ئۆج ئالان)، نامەیەکە کە لەڕۆژنامەی (سەرخوەبوون)ی

ئۆرگانی PKK لەئەوروپا بڵاو کراوەتەوەو دەقی نامەکەش لەگولآنی ژمارە ٢٤٥ی-ڕۆژی ٣٠ ئەیلولی ١٩٩٩دا، دیسان بڵاوکراوەتەوە، هەرچەندە نامەکە سەرانسەری پڕە لەهەڵگەڕانەوەو رەخنەکردنی ئاکارو سیفەتەکانی پێشتری خۆی، کە لێرەدا چەند بەشێکی لێدەکەینە نموونە، کە دەڵێت: (هەر بزاڤێك یاخود بەتایبەت ئەو وڵاتانەی کە گرفتیان تیادایە ئەگەر لەو حاڵەتەی ئێستای جیهان نەگەن و هەوڵ بدەن پێ لەسەر رێگە چارە کۆنەکان دابگرن ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەو بن بەستەی کە تێی کەوتوون قوڵتر دەکەنەوە. لەئاکامدا لەخۆ هەماهەنگ کردن لەگەڵ نەزمی نوێی جیهاندا رزگاریان نابێ. گەر سەرنج بدەین، لێرەدا ئەوە بەمانای خۆ بەدەستەوەدان بەهێزە مەزنەکان نییە).

ئەوەی سەرەوە وتەیەکی (ئۆج ئالان) بوو لەنامەکەیدا هاتووە، خۆ ئەگەر بێتوو پێش ئەوەی دەستگیر بکرێ‌و بگاتە ئەو رادەیەی لەترسی گیانی خۆی ئەم قسەیە بکات، بهاتایەتە ژێر باری ئەو هەموو رەخنە بنیات نەرانەی کە خەڵکانی نەتەوەیی‌و وڵاتپارێزی باشوور ئاراستەی (ئۆج ئالان)یان دەکرد لەبیقاع و پێیان دەگوت: (سەردەمی ئایدۆلۆژیای چەقبەستووی سۆسیالیزم و تیرۆرو خۆسەپاندن نەماوەو بەمناڵانی دزراوی خەڵکی کوردستانیش شەڕی گەریلایی ناچێتە سەر،و بەزۆر خۆسەپاندنیش نابێتە (سەرۆکی نەتەوەیی!) ئەوا ئەمڕۆ ئۆج ئالان داوای نەدەکرد کە چیتر (رێگا چارە کۆنەکان) باوی نەماوەو لەزیندانی داگیرکەرانەوە رەخنەی خۆی‌و PKKش بکات.

هەروەها ئۆج ئالان پێشتر، حزبەکانی باشووری کوردستانی بەئاغاو بورژوازی بچووك و کۆنەپەرست، وەسف دەکرد،و ئەم قسانەی چەندین جار لە MED.TV و بڵاوکراوەکانی تری PKK وە دووبارە دەکردەوە، کەچی ئەمڕۆ تێدەگات کە عەقڵی ئاغاواتی لەناو خودی PKK زاڵ بووەو هەر ئەو عەقڵیەتەش بووە ئیدارەی PKKی کردووە، بۆیە حاڵی گەیشتە ئەوەی چەك فرێ بداو ببنە حزبێکی (تەسلیم کار!) هەروەك ئۆج ئالان دەڵێ: (ئەگەر کار لەرووی هەستی ئاغاواتی‌و ئەو کارانەی کە پێشتر لەسەری راهاتوون دووبارە ببنەوە ئەوا نزیك کەوتنەکان بەبن بەست دەگەن و ئاگری شەڕ گڵپە دەسەنێتەوە). دیارە ترسی ئەم جارەی ئۆج ئالان لەهەڵگیرسانەوەی شەڕ لەبەر ئەوەیە، نەوەکو ئاگری شەڕ خودی خۆی لەدورگەی ئیمرالی بەرەو پەتی سێدارە بەرێت، دەنا خۆ (ئۆج ئالان) تا ئێستاش کە لەزیندان دایە زیاتر لەجاران دژی حکومەتی باشوورەو زیاتریش هەوڵ دەدات کە مێژوو بوونی نەتەوەییمان بسڕێتەوەو هەوڵیش دەدات کە PKKی باشوور بخاتە سەر پێی خۆی لەپێناو بەردەوام بوونی شەڕو دژایەتیکردنی حکومەتی باشووری کوردستان. خۆ ئەگەر

لەپێناو دژایەتی کردن دا نەبێت باشووری کوردستان چ پێویستی بە PKKیە کە بۆی دروست بکرێت و یاخود کێ رێگە بەخۆی دەدات خۆی بکاتە سوتەمەنی حزبێك کە لەباکووری کوردستان و مەڵبەندو گۆڕەپانی راستەقینەی خۆی هەرەسی هێنابێت و بگاتە ئەو قەناعەتەی کە دەبێت گەریلاکان بەخۆیان و چەکەکانی شانیانەوە تەسلیمی داگیرکەرانی کوردستان ببنەوە، هەروەکو ئۆج ئالان دەڵێت: (بۆیە لەباشووردا کۆششی حزب (مەبەستی PKKی باشووره)و بەرەکەی لەگۆڕانکارییە دیموکراتیەکاندا دەبنە (داینەمۆ)ی هێزی دیموکراتی.. دیدو بۆچوونی ئۆتۆنۆمی کلاسیکیش دیارە کە (شیاو نییە) بەراستی سەیرە، (ئاپۆ!) تا ئێستاش نایەوێت لەراستی خەباتی باشوور تێبگات، چونکە باشووری کوردستان بەحوکمی سیاسەتی حەکیمانەو واقیعیانەی (بارزانی نەمر) توانی لەشۆڕشی ئەیلولدا بەپێی بەیانێکی رەسمی لەساڵی ۱۹۷۰دا، داگیرکەرانی کوردستان بهێنێتە ئەو قەناعەتەی کەدان بە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان دابنێن، ئەمڕۆش فیدرالی بۆ باشووری کوردستان بۆتە ئەمری واقیع، کەچی ئۆج ئالان زۆر دوژمنکارانە دەڵێت (ئۆتۆنۆمی کلاسیکی)،و بەهاتنە خوارەوەو تەنازولاتی خۆیو حزبەکەشی لە(سەربەخۆیی بۆ کوردستانەوە بۆ ئۆتۆنۆمیو دواتر بۆ مافە رۆشنبیریەکان و ئێستاش کە تەنیا داوای بەردەوامی ژیان و مانەوەی خۆی دەکات) دەڵێت: (داینەمۆی هێزی دیموکراتی!)، هەروەها لەکاتێکدا دەوڵەتەداگیرکەرەکانی باشووری کودستان، چەندین جار بەرەسمی لەگەڵ وەفدو حزبە شۆڕشگێڕەکانی باشووری کوردستان دانیشتوون و گفتوگۆیان کردووە، کەچی سەرەڕای هەموو کردارێکی چەوسێنەرانەی داگیرکەرانیش لەباشووردا بڕیاری چەك دانانی هەتا هەتایی نەدراوە، کەچی تائێستا دەوڵەتی تورکیا نەك هەر نایەوێت گفتوگۆ لەگەڵ PKK بکات بەڵکو وەك حزبێکی سیاسیش دانی پیادا نانێت، هەروەك (ئۆج ئالان) لە نامەکەیدا بۆ سەرکردایەتی PKK ی ناردووە دەڵێت: (دەوڵەت نایەوێ بەلایەنێکی گفتوگۆتان دابنێ، پێم وایە وەکو بڵێی بێ بڕیارییەك هەیە، یانیش پێویستی بەماوەیەك هەیە تا بڕیار بدات).

(ئۆجەلان) لەپێناو ژیان و مانەوەی خۆیدا، ئەوەندە بێباکانە کەوتۆتە بەرگری کردن ودڵنیاکردنەوەی دەوڵەتی تورکیا، لەوەی کەدەبێتە کەسێکی پارێزەری ئاسایشی نەتەوەیی تورك و لەم پێناوەشدا ئامادەیە کە هەموو گەریلاکانی خۆی بخاتە خزمەت ئەو پیلان و نەخشانەی کە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان بەهیوای بەردەوام بوونین و هەر بۆیە دەڵێت: (تورکیا لەم بارەیەوە، لەپەیمانی سیڤەر) دەترسێ، بەتایبەتی کە لەلایەن هەندێك لەوڵاتە ئەوروپیەکانەوە بەدوودا چوون هەیە،

که ئەمە دەبێ بەتەواوی بسڕێتەوە. ئەوەی کە کراوە ئەوەیە لەناوەڕۆکی (پەیمانی لۆزان)دا ئەو بۆشاییە پڕکراوەتەوە). بەڵام لەراستیشدا بۆ داگیرکەرانی کوردستان و بۆ هاوکارو هاوپەیمانەکانیشیان ناچێتە سەر، کە لەم سەردەمی بەنێو نەتەوەیی بوونەی کێشەی نەتەوەییماندا درێژە بە سیاسەتی داگیرکاری خۆیان بدەن، هەروەها (ئۆج ئالان)یش بە چ ویژدانێکەوە رێگە بەخۆی دەدات لەپێناو چەند ساڵێك زیاتر بەردەوام بوونی ژیانی خۆیدا، خۆیو خەڵکانێکی تریش بخاتە خزمەت پرۆسەی داگیرکارییەوە، لەکاتێکدا (ئۆج ئالان) لەماوەی (١٤) ساڵ شەڕو (٢٠) ساڵ زیاتر لەدروست بوونی PKK هیچ دەستکەوتێکی ئەوتۆی بۆ نەتەوەکەمان بەدەست نەهێناوە تا ئەمڕۆش بتوانێت لێیبسەنێتەوە یاخود لێی پاشگەز بێتەوە، چونکە چواردە ساڵ شەڕی PKK (شەڕی لەپێناو شەڕدا) بووە، نەك لەپێناو بەرژەوەندی باڵای نەتەوەکەماندا، هەر بۆیەشە ئەوە بۆ حەوت ساڵ دەچێت شەڕی لەدژی خەڵکی باشووری کوردستان دەست پێکردووە، لەلایەکی ترەوەش (پەیمانی سیڤەر) ئەگەر بەپیلان و پەیمانێکی تری نێودەوڵەتی وەك (لۆزان)یش لەناو برابێت، بەرهەم و مانای واقیعی بوونی نەتەوەییمانەو بەهیچ کەس و لایەنێکیش ناسڕێتەوە،و ئەوەی ئەو هەولانەش بدات لەبەردەم مێژوو ئایندەی نەتەوەکەماندا خۆی بێزارو شەرمەزار دەکات.

هەروەها (ئۆج ئالان) دەیەوێت، لەو نامەیەدا کە بۆ سەرۆکایەتی PKKی ناردووە هەموو هەڵەو کەمو کورییەکانی ئەو بیست ساڵەی PKK لەڕووی تەنزیمییەوە چارەسەر بکات، بۆ نموونە (ئۆجەلان) لەخۆی رانابینیۆ هێزو توانای نییە باس لەمەسەلەی ئافرەتان بکات لەناو حزبەکەیدا، خۆی بەشەرمەزار دەبینیۆ دەڵێت: (دەمویست مەسەلەی هەست پێکراوی ئافرەتانیش چارەسەر بکەم، بەڵام بەنیوەچڵی مایەوە، ئەگەرچی بۆ ئەمە زۆریش دەرەنجێم بەڵام بۆ ئەنجام دانی ئەمە بۆ ئێستا هێزو توانا نابینم). ئۆجەلان زۆر باش دەزانێت کە لەو چەند ساڵەی کاری سیاسیدا، چەندە بەهەڵەوە تێکەڵ بەکاری سیاسیو کۆمەڵایەتی بووە لەکوردستاندا بەگشتیو لەسەر مەسەلەی ئافرەتان بەتایبەتی بۆیە (ئۆج ئالان لەباری ئێستادا (هێزو توانا لەخۆیدا نابینێت) کە ئەو هەڵانەی لەرابردوودا دەرهەق بەشێوازی رێکخستنی ئافرەت کراوە چارەسەر بکات. هەروەها ئەستەمە هەڵەیەك کە بیست ساڵە لەناو PKKدا بەردەوامە، بەتاکە نامەیەکی (ئۆج ئالان)ی زیندانی کراو چارەسەر بکرێ.

* ئەم وتارە لەژمارە (٥٣)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- رۆژی ١٥/١٠/١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.

# یەکگرتنی چەپ
# یان چەپاندنی (کبت)ی راستییەکان؟

ماوەیەکی درێژەو، بەشێوەیەکی بەرچاویش لەدوای راپەڕینی ئازاری ١٩٩١وە، لەم لاو لەولای گۆڤارو رۆژنامەو سیمنارەکانی باشووری کوردستاندا باس لەبزووتنەوەی چەپ و واقیعی تاڵی چەپ دەکرێت لەباشووری کوردستاندا، چونکە ئەم رەوتە هزرییە دووچاری چەندین گرفتی فکریو لێك جوداو دژ بەیەك بووە، هەر بۆیەشە لەرۆژانی ئەمڕۆماندا کار گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە چەندین گروپ و لایەنی چەپ لەکوردستاندا هەبێت (کە بەگشتی سوسیالیزم"و ئامانجی دەرهاویشتەی هزری سوسیالیستیان لەخۆ گرتووەو لەهەوڵی بەدیهێنانیدا کار دەکەن). وە ئەگەر لەڕووی سیاسییەوەش سەیری ئەم بزووتنەوەیە بکەین دەبینین خاوەنی چەندین بیروڕای جیاوازو دژ بەیەکن، سەرەڕای ئەوەی کە هەر یەکەیان ئەوی تریان بە (لادەر- منحرف)ی ڕێبازی (مارکسیزم- لینینزم) دەزانێت.

بەهەر حاڵ نەماندەخواست قسە لەسەر ئەم بوارە بکەین و بیکەینە تەوەرێك، بەڵام ئەوەی ناچاری کردین ئەوە بوو کە دوای چەندین وتار لەرۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)دا لەسەر (مەسەلەی چەپ و چەپگەری)و دواترینیان وتارێکی کاك کەریم ئەحمەد ) بوو لەژێر ناوی (یەکگرتنی چەپ!) لەرۆژنامەی (ڕێگای کوردستان)ی رۆژی (١٩٩٩/١/١٣)ی ژمارە (٣٣٥)دا بڵاو کرایەوە، ئێمەش لەروانگەی بڕوابوونمان بەهزری جودا لەکوردستاندا، هەوڵ دەدەین بیروڕای خۆمانی لەبارەوە دەربڕین و هەندێك ڕاستی مێژوویی‌و هزری لەناو گۆڕەپانی سیاسی باشووری کوردستاندا دیار بخەین، تاوەکو بتوانین زیاتر لەخزمەت بەرەوپێش چوونی بیری نەتەوەیی‌و روون کردنەوەی راستییەکاندا بین.

واتە ئەم وتارەمان زیاتر جەخت دەخاتە سەر ناوەڕۆکی وتارەکەی کاك (کەریم ئەحمەد) کە پێشتر ئاماژەمان بەسەرچاوەکەی کردووە، لەو وتارەدا چەندین لایەنی مێژوویی بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەییمان و بواری فکری وروژێنراوە، ئێمەش لایەنە فکریو مێژووییەکان بەشێوازێکی واقیعی‌و بەڵگەدار دەخەینە روو، ئەوەی

زیاتر سەرنجی کەسانی نەتەوەیی رادەکێشێت و وای لێ دەکات بەدوایدا بچێت، ئەوەیە کە وتارەکە لەسەرەتادا کەباس لەپێگەیشتنی بیری نەتەوەیی دەکات لای مرۆڤی کورد، زۆر بە خێرایی رەت دەبێت و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش هەوڵ دەدات کە دەرکەوتنی بیری نەتەوەیی کوردی بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە سیستەمی فیودالی (دەرەبەگی) لەکوردستاندا دووچاری رووبەڕوو بوونەوەو لەناوچوون هاتبوو، ئەمەش لەپێناو ئەوەدایە کە پێوانەکەی (مارکسیزم) بۆنەتەوە راست دەربچێت و ئیدی بەلای (کاك کەریم)وە گرنگ نەبووە کە مێژووی کۆمەڵایەتیو هزری نەتەوەیی کورد غەدری لێبکرێت یاخود لێنەکرێت، بەڵکو گرنگ ئەوەبووە کە رابردوو ئاییندەی نەتەوەییمان بخاتە چوارچێوەی ئایدۆلۆژیاکەی خۆی، هەروەك لەسەرەتای وتارەکەدا دەڵێت: (ماوەی سەدساڵ زیاترە هۆشیاری نەتەوەیی لەناو گەلی کوردماندا پێگەیشتووە، هەر چەندە ئەم هۆشیارییە لەچوارچێوەی هەرێمەکانی کوردستاندا بووەو بۆ رزگار بوونی ئەو هەرێمانە بووە لەدەسەڵاتی عوسمانیو سەفەوییەکان..) بەڵام ئەگەر سەیر بکەین دەبینین کە بیری نەتەوەیی مێژوویییەکی کۆنتری هەیەو وشیاری نەتەوەییشمان لەپێناو دروست بوونی دەوڵەتی کوردیو سەربەخۆبوونی کوردستان، زۆر پێش ئەو مێژوویەی کە (کاك کەریم) باسی دەکات بوونی هەبووە، بەڵگەشمان بوونی (مەم و زینی)- ئەحمەدی خانی- یە، کە لەساڵانی (١٦٩٥) نوسراوەتەوە، گەر بەوردی بیخوێنرێتەوە، هەست بەوە دەکەین، کە بنەماو زەروورەتی دەوڵەت لەم مەم و زینەدا بەتەواوی بەدی دەکرێت، هەر لەباسی (پارەی کوردیو یەککگرتنی کوردان و خراپیو زوڵم و زۆری داگیرکەران و.. هتد)، هەروەها لایەنێکی تری (مەم و زین) ئەوەیە کە (خانی) مەزن، لەبەر ئەوەی لەخەمی بیری نەتەوەییدا بووەو هەوڵی بڵاوکردنەوەی داوە، هاتووە بە شیعر ئەم شاکارەی داڕشتووە، ئەمەش بۆ ئەوە بووە کە بەئاسانی بگاتە خەڵك لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوەش بۆ ئەوە بووە کە لەو سەردەمەدا گۆڤارو بڵاوکراوەی کوردی نەبووە، ئەگینا دڵنیاین کە (خانی) مەزن و (حاجی قادری کۆیی)ی بەرهەمە نەتەوەیییەکانیان بەشێوەی وتار بڵاو دەکردەوە.

کەواتە لێرەدا دەردەکەوێت کە پێوانەی (مارکس) بۆ دەرکەوتنی بزاڤی نەتەوەیی، لەبەرانبەر نەتەوەیی کورددا، دووچاری رەخنەو ناڕاستی بۆتەوە، هەق وا نییە کۆمۆنیستە کوردەکان، بەشێوەیەکی لەقاڵب دراو، پێوانە هەڵەکانی ئایدۆلۆژیای مارکسیزم بکەنە پێوانە بۆ بزووتنەوەی نەتەوەییمان.

لەشیوێنێکی تردا کاك (کەریم) کەدێتە سەر سیاسەتی شۆڤینی داگیرکەرانی کوردستان و بەرگریو رابوونی نەتەوەییمان، هەر بەهەمان پێوەری ئایدۆلۆژیا لەقالب دراوەکە، کارەکان لەچوارچێوەیەکدا چڕ دەکاتەوە، کە گوایە لەرابردووماندا هەر جیاوازی چینایەتی زوڵمی لێکردووین و چینی بالادەست (دەرەبەگ)ی کورد تاکە خیانەتکاری ناو چوارچێوەی مێژووی خەباتی نەتەوەییمانەو دەڵێت: (ئەم سیاسەتە شۆڤینیە پاڵی بەگەلی کوردمانەوە ناوە کە بۆ بەرگری لەخۆیو کوردستانەکەی راپەڕێ، ئەم رابوونەش تەواوی چین و توێژە کۆمەلایەتییەکانی گرتۆتەوە جگە لە مشتێك دەرەبەگ و مشە خۆر کە خۆیان خستبووە خزمەتی چەوسێنەرانی گەل و داگیرکارانی نیشتمانەکەمان.)

لێرەدا ئەگەر سەیر بکەین (کاك کەریم) بە ئەنقەست هەوڵی داوە، رەهەندێکی چینایەتی بەمێژووی خەباتی نەتەوەییمان بدات و لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی راستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ بەپێی ئایدۆلۆژیاکەی لێکدانەوەی خۆی لەبەرانبەر کێشەکەماندا دەربڕێت، بەلام بەپێی بڕواو تێڕوانینی ئێمەو وەك ڕاستییەکی چەسپاویش، ئەوەی خیانەتی لەنەتەوەی کورد کردووە لەرابردوو داو ئەوەی لە داهاتووشدا خیانەت دەکات، کەسانی نا نەتەوەیین، نەك (ئاغاو شێخ و دەرەبەگ و مەلاو..تد)، ئەوانەشی خزمەتی نەتەوەی خۆیان دەکەن کەسانی هەڵگری بیری نەتەوەیین (لەراستیشدا ئەمە بەرگری کردن نییە لەدەرەبەگ و سیستەمی دەرەبەگایەتی، بەڵکو راستییەکەو پێویستە دانی پیادا بنێین)، هەروەها کاك کەریم کەناوی دەرەبەگ و مشە خۆری لەدوای یەك هێناوە مەبەستی ئەوەیە کە یەکڕیزی نەتەوەییمان دووچاری شڵەژان بکات، لەکاتێکدا لەسەردەمی ئێستاماندا سیستەمی دەرەبەگایەتی خەریکە بە تەواوی بەسەر بچێت و کاریگەری ئەوتۆی نەماوە، لەهەمان کاتدا هەموو لایەك دەزانن کە لەمێژووی شۆڕشی نەتەوەییماندا، زۆر (شێخ و ئاغاو مەلا) هەبوون، خزمەت و پشتگیری شۆڕش و راپەڕینە نەتەوەییەکانی کردووەو قوربانیشیان داوە، کەواتە پێوەری چینایەتی بۆ لێکدانەوەی شۆڕشی نەتەوەییمان و دیاری کردنی خیانەتکاران کارێکی هەڵەیەو تەنیا بیری نەتەوەیی دەتوانێت ببێتە تاکە پێوانەیەکی راست و دروست بۆ لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی سەرجەم لایەنەکانی بزووتنەوەی رزگاری نەتەوەییمان.

هەروەها (کاك کەریم) لەچەند شوێنێکی تردا، هەوڵی داوە بە پێوەرێکی چینایەتی ریزی پێشەوەی خەبات و شانازی کردن بەسەر نەتەوەکەماندا دابەش بکات و دەڵێت:

(بەلاّم دەبیّ مەسەلەیەکی گرنگی پەرەسەندنی ژیانی کۆمەلاّیەتی گەلی کوردستانمان باس بکەین، ئەویش (ریزبەندی چینایەتییە) تا بتوانین ئەو چینە کۆمەلاّیەتییانە بناسینەوە کە دیّنە کۆڕی خەباتی نیشتمانی نەتەوەیی)و ریزی پیّشەوەی ئەم خەباتە دەگرن.. بەلاّم چین و تویّژە کۆمەلاّیەتییە نیشتمانییەکان کە گەلی کوردستانیان لیّ پیّك دیّت ئەمانەن:

١-چینی ناوەنجی: ئەم چینە دەیەویّ کوردستان رزگاربیّ، بۆ ئەوەی کارگەکانی فراوان بکاو لەبواری (پیشەسازیدا سەرمایەکەی تازە بکاتەوە).

لیّرەدا کاك کەریم (چینی ناوەنجی)مان پیّ دەناسیّنیّ، هیچ حساب بۆ هەست و شعوری نەتەوەیی ئەم چینە ناکات و شۆڕشگیّری ئەم چینەش وابەستە دەکاتەوە، بە بەرژەوەندییە ئابوورییەکانەوە، لەکاتیّکدا کە هەموو لایەك دەزانین کە لەشۆڕش و راپەرینەکانی کوردستاندا، سەرجەم چین و تویّژەکانی کوردستان قوربانی گیانیان داوەو تاکە ئامانجییان رزگار بوون بووە،و ئەگەر بەپیّی لیّکدانەوەکەی (کاك کەریم) بوایە، ئەوا هەرگیز چینی ناوەنجی قوربانی نەدەدا، چونکە ئاشکرایە کە مرۆڤ گیانی بەخشی، هیچ بەرژەوەندییەکی ئابووری لەبەرانبەریدا بوونی نامیّنیّ، کەواتە ئەوەی وای لەسەرجەم چین و تویّژەکانی کوردستان کردووە بەشداری شۆڕشەکانی کوردستان بکات، هەست و بیری نەتەوەیی بووە، نەك بەرژەوەندی مادیو ئابووری.

هەروەها لەشویّنیّکی تری وتارەکەدا، کەدیّتە سەر باسی میّژووی خەباتی نەتەوەییمان لەباشووری کوردستانداو هەلّویّستی (لقی کوردی حزبی شیوعی عیّراق) لەبەرانبەر مافە نەتەوەییەکانماندا، هەولّ دەدات هەلّویّستی (حیزبی شیوعی)مان لیّ بشاریّتەوە، یاخود هەر نەبیّت وەهامان نیشان بدات کە (حیزبی شیوعی) هەلّویّستیّکی ئیجابیانەی هەبووە لەبەرانبەر کیّشەی رەوای نەتەوەییمانداو خۆی کردۆتە هاوشانی (پارتی دیموکراتی کورد) لەسەردەمی ئەوکاتداو دەلّیّت: (پاش سالّی ١٩٤٦ ژیانی حیزبایەتی لەکوردستاندا بەوە یەکلا بۆوە کە دوو حیزبەکە، واتە پارتی دیموکراتی کوردو لقی کوردی حیزبی شیوعی عیّراق هاتنە کایەوە، ئەم دوو ریّکخراوە وەك دوو ریّکخراوی سەرەکی لەسەر کار دریّژەیان دا، تا سالّی ١٩٦٤..) جاریّ ئەوەندی ئیّمە هەست دەکەین، کە لیّرەدا (کاك کەریم ئەحمەد) هەولّ دەدات شیّواندنیّك دروست بکات و بەشیّوازیّکی ناڕاستەوخۆش زەمینەی پروپاگەندە بۆ هەلّبژاردنی داهاتوو خۆش بکات، تاوەکو بەهۆی بەشداربوونیان لەپەرلەمانی داهاتوودا لەهەندیّك گرفتی فکریو سیاسی رزگاریان ببیّت، بە بیروڕای ئیّمەش

هەموو حیزب و ڕێكخراوێك مافی خۆیەتی لەهەموو كاتێكدا پروپاگەندە بۆ خۆی بكات، بەڵام بەمەرجێك حەقیقەتە مێژووییەكانی نەتەوەی كورد نەشێوێنێ، لێرەوەش چەند نموونەیەك لەهەڵوێستەكانی (لقی كوردی- حشع) دەهێنینەوە سەبارەت بە كوردستان و ئەو گۆڤارەی كە (لقی كوردی- حشع) بەناوی (یەكێتی تێكۆشین) لەساڵانی (١٩٤٤- ١٩٤٥) دەری كردووە، بۆ نموونە گۆڤاری (یەكێتی تێكۆشین) لەژمارە (٢) لاپەڕە (٧)دا، ڕەخنە لەحكومەتەكەی (شێخ مەحموود) دەگرێت و بە حكومەتێكی دواكەوتووی لەقەڵەم دەدات، ئەمەش لەپێناو ئەوەدایە كە دڵی سۆڤیەت ڕازی بكات و لەو پێناوەشدا حكومەتی (مەلیك مەحموود) بەدەستكردی ئیستعمار لەقەڵەم دەدات، بۆیەش یەكێتی سۆڤیەت پشتگیری نەكردووە، بەم شێوەیە دەڵێت: (هەتا لەناو پیاوەكانی شێخ مەحموود تێك دانی ئیش و كار لەلایەن بەكریَ گیراوەكانی ئیستعمار بوو كەوابوو ئەم دەسائسە ئیستعمارییە چۆن لەلایەن سۆڤیستانەوە تەئیدێك وەر ئەگریَ)[1].

هەروەها (د. جەمال نەبەز) بەم شێوەیە باسی گۆڤاری یەكێتی تێكۆشین دەكات: ((سەیر ئەوەیە ئەم گۆڤارە نەباسی جەنگ دەكات (بەمەستی جەنگی جیهانی دووەمە- نووسەر)، نەباسی مەسەلەی كوردی ئێران،و نەباسی كشانی لەشكری سۆڤیەت بە كوردستاندا،و نەباسێكی شۆڕشی نیوچەی بارزان دەكات. بەڵام لەهەردوو ژمارەكەیدا (٢) و (٣) وتارە سەرەكییەكانی لەسەر دۆزی كوردەو دەیەویَ مەسەلەكە بخاتە چوارچێوەیەكی ماركسیانەوە))[2].

بەپێی ئەو چەند نموونە كەمەی هێنامانەوە، دەردەكەوێت كە حیزبی شیوعی)، ئەوەندەی چارەنووس و بەرژەوەندی حیزبی لەلا گرنگ بوو، بەرژەوەندی نەتەوەییمانی لەلا گرنگ نەبووەو، هەوڵی داوە دۆزی ڕەوای نەتەوەییمان بخاتە خزمەت ئایدولۆژیاكەی خۆیو لەشوێنێكی تری وتارەكەدا، كاك كەریم) دەڵێت: (پارتی دیموكراتی كوردستان بە سەرۆكایەتی بارزانی لەساڵی ١٩٦١دا گەلەكەمانی لەشۆڕشە نیشتمانییە دیموكراتیەكەیدا كۆكردەوەو تا ساڵی ١٩٧٥ سەركردەیی كردو تەواوی چین و توێژە كۆمەڵایەتییە پێشكەوتنخوازو دیموكراتیەكان لەریزەكانیدا كۆبوونەوەو هەر لەسەرەتاوە حیزبی ئێمە، حیزبی شیوعی عێراق، پاڵپشت و لایەنگری كردو ڕێكخراوی حزبمان لەهەرێمی كوردستان لەساڵی ١٩٦٢ وە تێدا بەشدرای كرد).

هەروەك ئاشكرایە كە حزبی شیوعی عێراق لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا، كەوتە خزمەت كردنی رژێمی عبدالكریم قاسم و چووە سەنگەری دژە شۆڕش ئەمەش لای هەموو لایەك ئاشكرایە (كاك كەریم) كەباسی پشتگیری‌و پشتەوانی حزبەكەی دەكات بۆ شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەییمان، رادەگەیەنێت كە ئەوان لەساڵی (١٩٦٣)وە پشتگیری شۆڕشیان كردووە، بەڵام بابزانین پێشتر هەڵوێستیان چۆن بووە، چونكە لەبەیاننامەیەكدا لەژێر نێوی (حول تطورات الوضع في كوردستان) كە لە (١٤-١٠-١٩٦١) دەریان كردووە، زۆر بەشێوازێكی نارەواو خراپ باسی شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەییمان دەكەن. هەروەها دكتۆر جەمال نەبەز) بەم شێوەیە باسی هەڵوێستی كۆمۆنیستەكان دەكات لەسەردەمی حوكمی عبدالكریم قاسم)دا: (كۆمۆنیستەكانیش بە شانازی‌یەوە لەدەزگەی جاسوسیێتی رژێمی عێراقدا كاریان دەكرد، هەواڵ و دەنگوباسی خەڵكیان بەڕاست و بەدرۆ دەگەیاندە دەزگەی ئەمنی رژێمی قاسم و بەمەشیان دەگوت (پاراستنی كۆمار)، (صیانة الجمهوریة)و لەهەموو وەزارەتێك و دائیرەیەكدا لیژنەیەكیان لەم بابەتە پێك هانیبوو كە بە (لیژنەی پاراستنی كۆمار) (لجنة صيانة الجمهورية) نێودەبرا بۆ جاسوسی كردن بەسەر ئەوانەوە كە كۆمۆنیست نەبوون و بیرو باوەڕیان جیاواز بوو..)[٣]

هەروەك ئاشكرایە كە پشتگیری شیوعییەكان بۆ شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەییمان لەساڵی (١٩٦٣)وە بوو، لەكاتێكدا كە شۆڕش لە (١٩٦١)وە دەستی پێكردبوو، ئەمەش بەهۆی ئەو ڕەوشە ئاڵۆزو نالەبارەوە بوو، كە حزبی شیوعی تێی كەوتوو، پاش رووخانی رژێمی قاسم دووچاری راوەدوونان هاتن لەلایەن بەعسییەكانەوەو لەم كاتەشدا بەناچاری خۆیان هاویشتە باوەشی شۆڕش و (بارزانی نەمر)یش وەك سەركردەیەكی بەوەفای نەتەوەیی باوەشی بۆ كردنەوەو رێزی لێنان.

دەبینین لەوتارەكەیدا كەدێتە سەر ئەوەی كە شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەیی، بە دەستی سیاسەتی نێو دەوڵەتی دووچاری شكست هات، (كاك كەریم) دەڵێت: (دوای تێكشكانەكەی شۆڕش لەساڵی ١٩٧٥دا شۆڕشەكە كەوتە تەنگوچەڵەمەیەكی سیاسی‌و فكرییەوە، هەندێك ڕێگەی خۆ بەدەستەوە دانیان بۆ رژێمی شۆڤینی گرتەبەر، زۆربەی زۆریش رێگەی پەنابەری كاتیان لەودیو سنوور هەڵبژارد).

ئاخۆ كێ بوون ئەوانەی بۆ جارێكی تر دەستیان لەگەڵ داگیركەرانی عێراقی تێكەڵ كردەوە، باشتر وابوو (كاك كەریم) بۆ خوێنەرانی روون بكردایەوە، تاوەكو ئێمەش

ناچار نەبووینایە روونی بکەینەوە، بەهەر حاڵ پاش گفتوگۆی (حزبی شیوعی عێراق)و رژێمی بەعسی عێراقی لەساڵی ١٩٧٣دا بەرەی بەناو (نیشتمانی)یان راگەیاندو تا ساڵی ١٩٧٩ بەردەوام بوون. کەواتە ئەوەی لەدوای شۆڕشی ئەیلولی نەتەوەییمان خۆی خستە خزمەت سیاسەتی بەعسییەکان هەر کەسانی نا نەتەوەیی‌و ناشۆڕشگێڕ بوون، چونکە زۆر کوردی بەشەرەف و نەتەوەیی لەدوای شۆڕشەکە چوونەوە ماڵی خۆیان و ئامادەش نەبوون بۆ یەك چرکەش خزمەتی داگیرکەرانی بەعس بکەن، یاخود لەگەڵ سەرکردە بەوەفاکانی شۆڕش رێگای ئاوارەییان گرتەبەر.

هەرچەندە وتارەکەی (کاك کەریم) لە (رێگای کوردستان)دا لەسەر مەسەلەی یەکگرتنەوەی چەپ بوو، بەلام زەروورەت بوو کەراستیەکان بخەینە روو، چونکە هەروەك وتمان نووسەری (یەکگرتنی چەپ) خۆی ئەو مەسەلانەی وروژاندبوو، لێرەشدا زیاتر لەسەر مەسەلەی چەپ و مارکیسزم لەواقیعی ئێستاماندا رادەوەستین، تا ئەو رادەیەی کە وتارەکەی (رێگای کوردستان) باسی کردووە، چونکە بەڕاستی ئەم کۆتایی بە وتارەکەی بێنێ، باسی بزووتنەوەی چەپ و رەوشی سیاسی‌و فکری ئەو بزووتنەوەیە دەکات لەکوردستانی فیدراڵداو دەگاتە ئەو بڕوایەی کە زەمینەی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی رێگە خۆشکەرو گونجاو نین بۆ یەکگرتنی چەپەکانی کوردستان، و بە ئاشکراش بەرەیەکی نەتەوەیی هاوبەش هەن، لەم قۆناغەی خەباتی نیشتمانی رزگاریخوازیماندا، تەواوی هێزە کوردستانییەکان لەبەرەیەکی نیشتمانی بەرفراواندا کۆدەکەنەوە.. لەبەر ئەوە وا پێویستە هاوپەیمانییەکی نیشتمانی بەرفراوان لەرێی بەرەیەکی نیشتمانی کوردستانییەوە پێك بێت). بەحەقیقەت باشووری کوردستان لەرەوشێکی دیموکرات و ئازاد دایەو سەرجەم لایەنە چەپ و راستەکان توانیویانە لەسایەیدا هەست بە ئاسوودەیی بکەن و بەتێکچوونی ئەم ئەزموونەش سەرتاپای خەڵکی کوردستان، دووچاری مەرگەسات دەبێتەوە، هەر بۆیەش پێویستە هەموو لایەکمان لەخزمەتی ئەم ئەزموونەدا بین.

بەلام لەراستیدا (یەکگرتنی چەپی کوردستان) لەژێر سایەی سیاسەتی حزبی شیوعیدا کارێکی زەحمەت و گرانە، چونکە سەرجەم چەپە مارکسییەکانی کوردستان، مێژووی کارکردنیان لەچاو مێژووی حزبی شیوعی دا تازەیەو لەڕووی پێکهاتەشیانەوە زۆر بەیان راستەوخۆ لەحزبی شیوعی جیابوونەوەو ئێستاش خاوەنی حزب و رێکخراوی خۆیانن، یاخود لەرابردوودا ئەندام و کادیری حزبی

شیوعی بوون و ئێستاش لەناو حزبی چەپ و مارکسی تردا کار دەکەن، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەو کەس و لایەنانە لەکارو سیاسەتی (حزبی شیوعی) رازی نەبوون و ناچار بوون ریزەکانی حزبی شیوعی بەجێبهێڵن، یاخود خۆیان هەستن بە دروستکردنی حزبێکی مارکسی تر، لەبەر ئەوە مەسەلەی یەکگرتن و یەك نەگرتنی چەپەکانی کوردستان سەرەڕای جیاوازی فکریان، جیاوازیشن لەداڕشتنی سیاسەتی رۆژانەیانداو چەپەکان ئەوەندەی لەگەڵ سیاسەت و ستراتیژی (ناچەپەکان) گونجاون، ئەوەندە لەگەڵ یەکتردا تەبانین، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە واقیعی ئەمڕۆی کوردستان، بیرو ئایدۆلۆژیای چەپی مارکسی قبوڵ نییەو ئەم یایدۆلۆژیایەش تەنیا لەچوارچێوەکانی دوور لەواقیعدا دەمێنێتەوە، هەر لەبەر ئەوەی ئەم لایەنانە ئەگەر لەواری فکریشدا بگەنە خاڵی هاوبەش، ئەوا بەرژەوەندییە سیاسییەکانیان وایان لێ دەکات کە لەیەکتر دوور بکەونەوە، کەواتە بزووتنەوەی چەپی مارکسی لەکوردستاندا بە گشتی دووچاری نارێکیو شێواوی بوون لەناو خۆیانداو ناتوانن هاوسەنگی نێوان (سیاسەت و فکری) خۆیان راگرن.

دەتوانین لەکۆتاییدا بڵێین تا ئەمڕۆش مەسەلەی عێراق چێتیو کوردستانی بوونی، چەپەکان لەگەڵ حزبی شیوعیدا جێگەی گفتوگۆیەو خاڵێکی تری جیاوازی نێوانیانە.

## سەرچاوەکان


١-گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتی تێکۆشین ١٩٤٤-١٩٤٥، جەمال نەبەز، ستۆکهۆڵم، ١٩٨٨، لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر، دەقی گۆڤاری یەکێتی تێکۆشین. ل٧).

٢-گۆڤاری کۆمۆنیستانەی یەکێتی تێکۆشین، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٦٦-٦٧.

٣-من شێواندوومە لێتان یان هەر خۆتان سەر لێشێواون، جەمال نەبەز، ١٩٨٩، لاپەڕە ٢٨.


* ئەم وتارە لەلایەن نووسەرەوە بۆ رۆژنامەی رێگای کوردستان رەوانە کرا، بەڵام بڵاویان نەکردەوە، لەبەر ئەوە نووسەر ئەم وتارەی لەژمارە (٤٢)ی رۆژنامەی میدیا-ساڵی سێیەم- لەڕۆژی ١٩٩٩/٣/١ بڵاوکردەوە.

# روانینێکی نەتەوەییانە بۆ ئایندەمان

کارێکی بەڵگەنەویست و حەتمییە، کە تێڕوانین و دیگای کەسانی نەتەوەیی جیاوازی هەیە لەگەڵ تێڕوانین و بۆچوونەکانی ئەو کەسانە کە هەڵگری ئایدولۆژیایەکی ترن (ئەم جیاوازیانەش بەئاشکرا لەخوێندنەوەی رابردوو، داهاتوودا دەردەکەوێت)، هەر لێرەوەش دەتوانین روانینێکی نەتەوەییانە دەربڕین کەبێ گومان واقیعترین روانین دەبێت بۆ بەرەو پێشچوونی بوارە (کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابوورییەکان) لەکوردستاندا، بۆ نموونە بە پێی بۆچوونی ئێمە تەنیا پێشکەوتنە ئابوورییەکان نابنە هۆی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی ئیجابی، بەڵکو دەبێت بۆ ئەوەی ئەو بەرەوپێش چوونە ئابوورییانە رێچکەیەکی سروشتیو ئیجابی بگرنە بەر، دەبێت کەسانێك هەبن کە بتوانن داهاتی وڵات بخەنە خزمەت رەوشی کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستان و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەییمان، چ لەناوخۆو چ لەدەرەوەدا، هەروەها ململانێیو گۆڕانکارییەکان لەمێژوودا، تەنیا جیاوازی چینایەتی رابەرایەتی نەکردووە، بەڵکو ناکۆکی نێوان میللەتان و دەوری کەسانی سەرکردەو ئیمپراتۆرەکان و ململانێی دەسەلات و.. دەورێکی چالاکترو کرداری تریان هەبووە لەجیاوازی چینایەتی لەناو چوارچێوەی گۆڕانکارییەکان لەمێژووی مرۆڤایەتیدا.

لەمێژەش بۆمان روون بۆتەوە کە سەرجەم بیرو ئایدولۆژیا نامۆکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری، دووچاری شکست و قەیران هاتوون و ناتوانن خۆیانی لێ دەرباز بکەن، بەدڵنیاییەوە لەداهاتوویشدا تەنیا رێگا چارەیەك بۆ رزگار بوون لەو قەیرانەیان ئەوەیە کە خۆببەستنەوە بەخواست و ویستەکانی بیری نەتەوەییەوە. دەنا لەداهاتووی کوردستاندا ژیانی سیاسی دوور لەبیری نەتەوەیی دەکەوێتە پەراوێزی رووداوەکان و بێ کاریگەری دەمێنێتەوە، دەبێت ئەم خۆگرێدانەیش لەواری کرداریدا رەنگ بداتەوە، واتە لەئاست گرفتە نەتەوەییەکانماندا دەبێت گشت ئایدولۆژیایەکی نامۆو گرفتە لاوەکییەکان بخرێتە پەراوێزەوەو بیری نەتەوەییو روانینی نەتەوەییانە داڕێژەری نەخشەکانی داهاتوومان بێت.

لەم سەردەمەی ئێستامانداو لەداهاتوویشدا، بێگومانین لەوەی، تا چەوسانەوەی نەتەوەیی لەسەر نەتەوەی کورد بەردەوام بێت و کوردستان کۆلۆنیال کراوبێت، ناتوانرێت لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە بەبڕوبیانووی هیچ جۆرە چاکسازییەکی (ئابوری، کۆمەلأیەتی، رۆشنبیری..) بەر لە شۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان بگرێت، (کە ئاشکرایشە تا ئێستا هیچ جۆرە چاکسازییەك لەلایەن داگیرکەرانەوە بۆ گەلی کورد نەکراوە). کەواتە ئێمە لەگەلٚ داگیرکەرانی کوردستاندا گرفتی ئایدولۆژیو چاکسازی ئابووریمان نییە، بەلٚکو چەوسانەوەی نەتەوەیی سەر مەشقی دروست بوون و سەرهەلٚدانی گشت شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی نەتەوەیی کورد بووەو تا ئێستاش بیری نەتەوەیی توانیوویەتی بەردەوامی بەشۆڕشی رزگاری نەتەوەییمان ببەخشێت. هەر لەم روانگەیەوە YNDK بیری نەتەوەیی کردۆتە بەرنامەی خۆیو هەولٚی کۆکردنەوەی ولأتپارێزانی داوە لەدەوری خۆیدا، ئەمەش بەشێوەیەکی کرداری بەدەرکەوت و هەر لەدوای کۆنگرەی دووەمی YNDK لە(مانگی ئایاری ١٩٩٦)وە، تا ئەمڕۆ توانیوویەتی درێژە بەکارو خەبات بدات و بەپێی بەرژەوەندی نەتەوەیشمان هەلٚسوکەوت لەگەلٚ رووداوە سیاسییەکان بکات، کە بەئاشکرایش لەلایەن کەسانی نانەتەوەییەوە هەولٚ دراوە ئاستەنگ بخرێتە بەردەم بەرەو پێش چوونی YNDK، بەلأم لەبەر ئەوەی YNDK خاوەنی بیرێك بوو کە لەوابەستە بوونییەوە بەمێژووی خەباتی نەتەوەییمانەوە سەرچاوەی گرتبوو،و لەئاست گشت ململانیٚ ناوخۆییەکانیش دا هەلٚوێستێکی نەتەوەییانەی هەبووە، کارێکی ناواقیعی دەبوو کەسانی نانەتەوەیی بتوانن ڕێچکەی مێژوویی‌و بیری نەتەوەیەك بەلاڕێدا بەرن و دووچاری نائومێدی بکەن، هەروەها واقیعی کۆمەلأیەتی خەلٚکی کوردستان ناتوانێت ئەوە قبولٚ بکات کە ئایدولۆژیا نامۆکان کارو بارەکانی بەڕێوەببات، بەهەر حالٚ YNDK توانی سەرجەم گرفتەکان دەرباز بکات و ئێستاش لەهەولٚ و خۆ ئامادەکردندایە بۆ بەستنی کۆنگرەی سێیەم و هەنگاونان بەرەو قۆناغێکی نوێو داڕشتنەوەی کارەکانی بەشێوازێك کە بتوانێت زیاتر لەخزمەتی نەتەوەکەماندا بێت. وەلأم دەرەوەی ئەم قۆناغەی خەباتمان بێت.

دیارە کە هەنگاونانی YNDK بەرەو کۆنگرە لەکاتێکدایە کە پرۆسەی ئاشتی بەرەو چەسپاندن و برانەوەی ناکۆکییەکان هەنگاو دەنێت و رەوشی داهاتوویشمان پێویستی بە لێتوێژینەوەی ورد هەیە، بۆ ئەوەی بتوانین زیاتر لەخزمەت ئاشتییەکی بەردەوامدا بین، چونکە دەبێت بەشێوەیەك هەلٚسوکەوت لەگەلٚ داهاتوومان بکەین، کە

ئەنجامی هەڵبژاردن بە هەرچ شێوەیەك بێت، دەبێت گشت لایەنە سیاسییەکان ڕۆحێکی ولاتپارێزانە بچێنن و ئەوەش روون بکەنەوە کە سەرکەوتن و بردنەوە لەهەڵبژاردن یاخود شکست هێنان لەهەڵبژاردنی داهاتووی پەرلەمانی کوردستان، لەگۆڕەپانەکە دوورمان ناخاتەوە، بەڵکو دەتوانین ئەگەر لەدەرەوەی پەرلەمانیش بین، وەك (ئۆپۆزسیۆنێکی ئیجابی) خزمەتی بەرەوپێش چوونی ئەزموونە دیموکراتییەکەمان بکەین، سەرەڕای ئەوەی واقیعی ژیانی مرۆڤایەتیش ئەوەی سەلماندووە ئەگەر ململانێ نەبێت، ئەوا بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگا دووچاری راوەستان دەبێتەوە، دیارە ئەم ململانێیەیش دەبێت بەشێوەیەك بێت کە خزمەتی رەوشی ئایندەمان بکات، چونکە شێوازی ململانێی مرۆڤایەتی چەندین قۆناغی بڕیوە تا گەیشتۆتە ئەم قۆناغەی ئەمڕۆمان، کە تاکە شێوازێکی شارستانی قبوڵ کراو لەجیهاندا ئەوەیە کە سیستەمی دیموکراتی ململانێیە ناوخۆییو دەرەکییەکان بەڕێوە ببات، لەبەر ئەوەی ناکرێت لەیەك کاتدا (شەڕو سیستمی دیموکراتی) وجودیان هەبێت، لەبەر ئەوەی ئامادەبوونی تەواوی هەریەکەیان لەگۆڕەپانەکەدا دەبێتە هۆی نە هێشتنی ئەوی تریان.

لێرەوە دڵنیا دەبین لەوەی کە کۆنگرەی داهاتوومان دەرئەنجامەکانی دەتوانێت خزمەتێکی زیاتر بەڕەوشی ئایندەی نەتەوەییمان بکات، چونکە پاشخانی هزری YNDK لەڕابردووماندا و دەرئەنجامەکانی کۆنگرەی دووەم توانیوویەتی لەگشت قەیرانە سەختەکان رزگارمان بکات، بێگومان بەپشت بەستن بەئەزموونی رابردوومان و خوێندنەوەیەکی واقیعیانە بۆ داهاتووی کارەکانمان، دەتوانێت بمانگەیەنێتە ئەوەی کە بتوانین لەئایندەدا زیاتر رەوشی ئایندەی باشووری کوردستان بخەینە خزمەت بەرژەوەندی نەتەوەییمان و کۆکردنەوەی زیاتری ولاتپارێزان لەدەوری YNDK دا، ئاشکرایشە کە بەتەنها بوونی سۆزی نەتەوەیی لای خەڵکی کوردستان ناتوانێت کاریگەرییەکی سەرتاپاگیر بکاتە سەر گۆڕانکارییەکان، لەبەر ئەوە دەبێت بەپێی سیستەمێکی عەقڵانیو بەپێی قۆناغی دابەشکردنی کارەکان، بتوانرێت رابەرایەتی سۆزی نەتەوەییمان بکرێت و بەرەو دوائامانجەکانی خۆی ببرێت کە ئەویش هێنانەدی کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادو یەکگرتوو دیموکراتە، کە سەرجەم خەڵکی کوردستان بتوانێت لەسایەیدا بەمافە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی خۆی بگات، کەواتە تاکە ڕێگا بۆ هێنانەدی ئامانجەکانمان و

گونجانیشـــی لەگـــەڵ واقیعـــی ئێســـتاماندا بـــەردەوام بوونـــە لەســـەر سیســـتەمی ڕێکخراوێکی (سیاسـی- جەماوەری- دیموکراتـی) هـەر لـەم ڕوانگەیـەوەش دەتوانـین هەوڵی بەرەوپێش چوون و بەردەوام بوونمان بدەین لـەناو ریزەکـانی YNDKداو توانا مـادیو مەعنەوییـەکانی کەسـانی ولاتپارێزیش بەگشـتی بخرێتـە خزمـەت ئامـانجێکی پیرۆز کە ئەویش پەیڕەوکردنی ڕێبازی نەتەوەییە لەناو ریزەکانی YNDK دا.

هـەروەها لایـەنێکی هـەرەگرنگی تـر کەزیاتر هاندەرمانـە بۆ ئـەوەی لەهـەوڵی ئـەوە دابین کە دەسەلاتی کوردی لەچوارچێوەی فیدرالیدا بەرەو سەربەخۆیی بەرین، ئەوەیە کـە کـارە خزمەتگوزارییـەکانی کابینـەی سـێیەمی حکومـەتی کوردســتان توانـی خزمـەتێکی مـەزن بـە نەتەوەکـەمان بکـات، لـەکاتێکدا کـە دووچـاری چـەندین کێشـەی سیاسیو قەیرانی ئابووری بووەوە لەسـەر دەسـتی داگیرکـەرانی کوردسـتان و شـەڕی ناوخۆی چوار ساڵمان، کە ئاشکراشە لەرەوشی ئاشتیدا خـەڵکی کوردسـتان دەتوانن زیاتر سوود لەداهاتـەکانی حکومـەتی کوردسـتان وەربگـرن و هەسـت بەئاراميیـەکی زیـاتریش بکـەن و ژیـانی سیاسـیش لەکوردسـتاندا دەتوانێـت هـەنگاو بـەهانگاو ڕێچکەیـەکی شارسـتانیانە بگرێتـە بـەرو زەمینـەش خـۆش بکرێـت بـۆ بنیاتنـانی کوردستانێکی سـەربەخۆ. کەواتـە لەبـەر گرنگـی ئـەم قۆناغـەی خـەباتی نەتـەوەییمان پێویستە لەئاسـت ئـەو بەرپرسیارێتیەدا بین کـە خـەڵکی کوردسـتان بەگشـتیو بـیری YNDK بەتایبەتی چاوەڕێی هێنانەدی ئامانجە نەتەوەییەکان دەکەن.

لـەکۆتاییدا ئەگـەر بـەوردی سـەیر بکـەین کەتێکهەڵکێشـیەك و وا بەسـتە بوونێـك دەبینـین لـەنێوان (ڕابـردوو- داهـاتووی) ژیـانی سیاسـی- کۆمەلایـەتی لەکوردسـتاندا لەگـەڵ بـیرو سیاسـەتەکانی YNDK دا، ئەمـەش مانـای ئەوەیـە کـە YNDK بـەکردار ســـەلماندوویەتی کـە هـەڵقوولاوی نـاو هـەناوی ئەزموونـە دیموکراتییەکەمانـەو لەبەرئـــەوە نـــاتوانین لـــەواری تیۆریشـــدا سیاســـەت و ڕێبـــازی YNDK لـــەواقیعی سیاسـیو کۆمەلایـەتی خـەڵکی کوردسـتان و حکومـەت و پەرلـەمانی کوردسـتان جودا بکەینەوە.

* ئـەم وتـارە لەپێشوازی بەسـتنی کۆنگرەی سـێیەمی YNDK لەلایـەن نووسـەرەوە لـەژمارە (٣٩)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- رۆژی ١٩٩٨/١٢/١٥ بلاوکراوەتەوە.

# پیرۆزبایی کۆنگرەی سێیەم

سەرەتا پیرۆزبایی کۆنگرەی سێیەم لەخۆمان و سەرجەم ولاتپاریزان دەکەین.

ئاشکرایە کە کۆنگرەی سێیەمی YNDK، لەرەوشێکی وەها دابوو، کە پرۆسەی ئاشتی باشووری کوردستان، هیوایەکی مەزنی بەخەلکی کوردستان بەخشیوەو رەوشی عێراقیش دووچاری گرژیو ئالۆزییەکی زۆر هاتووە، لەم حالەتەدا کۆنگرەکەمان توانی بەهزرێکی نەتەوەییانە شیکردنەوەی خۆی دەرببڕێت و لەهەمان کاتدا توانرا، رەوشی باکوورو رۆژهەلات و رۆژئاوا (کوردستانی بن دەستی سوریا)ی کوردستان بخرێتە ژێر تیڕوانین و وەك بەشێکی دانەبڕاو لەباشووری کوردستان مامەلەیان لەتەکدا بکرێت.

لەلایەکی ترەوە توانرا هەلوێستێکی نەتەوەییانەی گونجاو دەربارەی (ئایین و ئۆپۆزسیۆنی عێراقیو سەربەخۆی کوردستان.. تد) دەربڕین و هاوفکرییەکی پتەوتر لەجاران بە YNDK ببەخشین بەپێی شێوازی گونجاو رێکخستنەکانی YNDK بەرەو فراوانبوون ببەین و بەشێوەیەکی سەرتاپاگیرتر لەهەولی کۆکردنەوەی سەرجەم کەسانی نەتەوەییو ولاتپارێزدا بین.

لێرەوەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە، کە تاکە رێگای سەرکەوتن و ئازادیمان پێڕەو کردنی بنەما دیموکراتیەکانەو، چونکە ئاشکرایە بەسوود وەرگرتن لەئەزموونی YNDK بۆ دیموکراتیەت توانرا کۆنگرەی سێیەممان بەو بڕیارو ئامانجانە بگات.

دووبارە بەرەو سەرکەوتنی مەزن لەپێناو (کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادو یەکگرتوو دیموکراتدا) کۆنگرەی سێیەممان پیرۆز دەکەین.

* ئەم پیرۆزبایی نامەیە لەژمارە (٤٠)ی رۆژنامەی میدیا- سالی سێیەم- رۆژی ١٩٩٩/٢/١ بلاوکراوەتەوە.

# YNDK چوار ساڵ بەرخودان و سێ کۆنگرەی پڕ بایەخ

۲۱-۳ی هەموو ساڵێك دەکاتە ساڵیادی دامەزراندنی YNDK، ئاشکراشە کە ئەم ڕۆژەش لەپانتایی فکری گشت کوردێکدا پیرۆزییەکی مەزنی هەیە، کە دەکاتە جەژنی نەورۆزی نەتەوەییمان، هەر لێرەوە هەست بەوە دەکرێت کە YNDK هەڵقوڵاوی بیری نەتەوەییەو ڕووداوە مێژووییەکانی نەتەوەکەمان پاڵنەرو پاڵپشتی دروست بوونی YNDK بوون، لەبەر ئەوەی دەبینین مانگی ئادار سەرانسەری پڕیەتی لەبۆنەو یادی تاڵ و شیرین لەدیرۆکی نەتەوەییماندا، دامەزراندنی YNDKش لە ۲۱ی ئاداری ۱۹۹۵دا وەرچەرخانێکی دیرۆکی بوو لەدوای ڕاپەڕینی ئاداری ۱۹۹۱ی خەڵکی کوردستان، لەبەر ئەوەی لەو کاتدا خەڵکی کوردستان، بەگشتیو بیری نەتەوەیی بەتایبەتی بەهۆی شەڕی ناوخۆوە، بەسەختترین قەیراندا تێدەپەڕیو نائومێدی سەرتاپای خەڵکی داپۆشیبوو، YNDKش وەك زەرورەتێکی سیاسی- کۆمەڵایەتیو لەپێناو دەرباز کردنی قەیرانەکانی شەڕی ناوەخۆی کوردستان خۆی ڕاگەیاند، هەوڵی کۆکردنەوەی وڵاتپارێزانیدا لەدەوری خۆی، ئیتر هەر لەو ڕۆژەوە YNDK توانیویەتی بەگوێرەی بەرژەوەندی نەتەوەییمان مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستاندا بکات و بەگیانێکی شۆڕشگێڕانەو دیموکراتییانەو هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانە دەرباز بکات کە دێنە سەر ڕێگای خەباتی نەتەوەییمان، هەروەها کە دەبینین YNDK توانیوویەتی لەکاتی شەڕو ئاشتیدا لەکوردستان پارێزەری بیری نەتەوەیی بێت و لەهەوڵی پراکتیزە کردنی ئەو بیرەدا بێت لەناو ئەندامانی YNDKو وڵاتپارێزانی کوردستانیشدا.

حەقیقەتێکی ئاشکراش هەیە کە جەماوەرو سەرکردایەتی YNDK، لەماوەکانی رابردوو داو لەبەرنامەی داهاتووشیدا، لەهەوڵی پێشڤەچوونی بیری نەتەوەییدایە، کۆنگرەی سێیەمیشمان لە (۱۰-۱۱-۱۲-۱-۱۹۹۹) سەلمێنەری ئەم ڕاستییەن؛ چونکە پێشڤەچوون و جیاوازییەکی بەرچاوی هەبوو بە بەراورد لەگەڵ کۆنگرەکانی پێشووترمان، هەر چەندە هەر یەکێك لەکۆنگرەکانی پێشووترمان هەڵقوڵاو و ڕەنگدانەوەی ئەو بارودۆخە سیاسیو کۆمەڵایەتییانە بووە، کە بیری نەتەوەییو YNDKی تیادا بووەو دەرئەنجامەکان و سەرکەوتنەکانی کۆنگرەی (یەکەم و دووەم)یشمان بووە هۆکاری ئەوەی کە کۆنگرەی سێیەممان بەو مەزنییە بگات. هەر

بۆیەش بەپێویستمان زانی لەیادی چوارەمین ساڵەی YNDK تیشکێك بخەینە سەر دەرئەنجامەکانی کۆنگرەی سێیەممان، کە YNDK لەو کۆنگرەیەدا توانی بەگیانێکی دیموکراتیانەوە مامەڵە لەگەڵ واقیعی کوردستان و هزرەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستان بکات و لەچەند راپۆرتێکی فکریو پڕ بایەخدا توانی بیرێکی نەتەوەییانەو لێکدانەوەیەکی لۆژیکیو زانستییانە دەربڕێت لەبەرامبەر نەتەوەکانی سەر خاکی کوردستان و سەرخۆبوونی کوردستان و بیری نەتەوەییو ئۆپۆزسیونی عێراقی...)، هەروەها جەخت لەسەر ئەوە کرایەوە کە بیری نەتەوەیی تاکە بیرێکی واقیعییە کە دەتوانێت لەخزمەتی سیستەمی سیاسیو کۆمەڵایەتی خەڵکی کوردستاندا بێت و بۆ بەختەوەری خەڵکی کوردستانیش دەبێت هەموو یاساو سیستەمەکانی ئیداری لەکوردستاندا هەڵقوڵاوی بیری نەتەوەیی بێت، هەروەها YNDK وەك رێکخراوێکی سیاسی خاوەن بڕیاری نەتەوەییانەو دەست پێشخەر لەنیشاندانی هەڵوێستەکانی خۆی لەبەرامبەر رووداوە سیاسییەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان، وەك زەروورەتێکی پێویست بۆ قۆناغی خەباتی رزگاری نیشتمانیمان و لەپێناو یەکخستنی ئەو بزاڤە رزگاریخوازە بەپێویستی زانی کە کەسێکی شایستە دەست نیشان بکات بۆ رابەرایەتی کردنی ئەم بزاڤە، بۆ ئەم مەبەستەش بڕیاریدا (بەرێز کاك مەسعود بارزانی- بەرێبەری بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان) هەڵبژێرێت.
دیارە ئەمەش دەبێتە هەنگاوێکی عەمەلی لەواری یەکخستنی بزاڤی نیشتمانیمان و رزگار کردنی ئەو بزاڤەش لەو پەرت و بڵاوییەی ئێستا بەدەستییەوە دەناڵێنێ، بەهەر حاڵ دڵنیاین لەوەی کە داهاتوومان دەیسەلمێنێ کە YNDK دەتوانێت سوودێکی زیاتر بەئەزموونی باشووری کوردستان بگەیەنێو زیاتریش خزمەتی بەرەو پێش چوونی بیری نەتەوەیی بکات لەکوردستاندا، لەبەر ئەوەی بیری نەتەوەییشمان بەشێوەیەکی زۆر دڵڕەقانە لەلایەن داگیرکارانی کوردستانەوە دژایەتی دەکرێت لەلایەکەوەو، لەلایەکی ترەوەش لەناوەخۆی کوردستانیشدا، لەسەر دەستی ئایدولۆژیا نامۆکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان هەوڵی لەناوچوونی دەدەن، یاخود لانی کەم هەوڵ دەدەن ئەم بیرە پیرۆزە بەلاڕێدا بەرن، کەواتە لەهەلومەرجێکی ئاوەهادا YNDK زەروورەتێکی حەتمییەو ئەمەش حەقیقەتێکەو واقیعی چوار ساڵ بەرخودانی YNDK و هەڵوێستە سیاسییەکانی سەلمێنەری ئەم راستییەلەرەوشێکی ئاوەهادا بۆ سەرجەم وڵاتپارێزانی کوردستان ئاشکرا بووە، کە YNDK دەتوانێت لەسەختترین قۆناغ و لەکاتی شەڕو ئاشتیشدا داکۆکیکار بێت لەبنەماکانی بیری نەتەوەییو لەهەوڵی بەردەوامیشدا بێت بۆ ئەوەی سۆزو هەستی نەتەوەیی لای خەڵکی

کوردستان، بکاتە بنەمایەکی پتەو بۆ بنیات نانی بیرێکی نەتەوەیی سەربەخۆ خواز، لەدەروون و مێشکی سەرجەم وڵاتپارێزانداو لەسەر بنەمای ئەم فکرەیەش دەتوانێت کەلتوور و شارستانییەتی کوردیمان لە لەناو چوون بپارێزێ. هەروەها چوار ساڵ خەباتی YNDK حەقیقەت- ێکی دەرخست کە بیری نەتەوەیی خاوەنی رابردوویەکی فکری- سیاسی فراوانەو YNDKش درێژە پێدەری ئەو رێبازەیە، دیرۆکی نەتەوەییشمان سەلماندوویەتی کە تاکو بیری نەتەوەیی هەبێت، لەناوچوون و سڕینەوەی نەتەوەییمان لەو گۆڕەپانەدا هیچ مەترسییەکی ئەوتۆی لەسەر نابێت، چونکە لەبەرامبەر هەر ئایدولۆژیایەکی داگیرکاریدا، بیری نەتەوەیی دەتوانێت ببێتە ئەلتەرناتیڤ (بدیل)و رزگارکاری نەتەوەکەمان لەسەر گەردانیو وەلامدەرەوەی هەر پرسیارێکیش بێت کە لەمێشکی هەر کەسێکی کوردو هەر نەتەوەیەکی سەر خاکی کوردستاندا بۆتە جێگەی قسەو باس و گفتوگۆ کردن.لەرۆژانێکی وەك ئەمڕۆماندا کە YNDK یادی چوارەمین ساڵەی بەرخودانی دەکاتەوە، لەکاتێکدایە کە پەرلەمان و حکومەتی کوردستان بۆتە جێگەی بڕواو متمانەی سەرجەم خەڵکی کوردستان و لەلایەن YNDK شەوە وەك دوو دەستکەوتی پیرۆزی نەتەوەیی پێناسە کراوە، کەواتە لەم حاڵەتەدا بێگومانین کە YNDK و کەسانی نەتەوەیی بیر لەژیان و خۆشگوزەرانی دەکەنەوەو ئومێدو هیوای مەزنیش بەدەوڵەتی نەتەوەییمان بەهێزتر دەبێت، هەر بۆیەش لەمڕۆماندا هاوکێشەو ململانێکانمان لەگەڵ داگیرکاران پێچەوانە بۆتەوە، چونکە ئەگەر جاران نەتەوەکەمان ترسی لەناوچوونی هەبوو، ئەوا ئێستا بیری وابەستەیی داگیرکاریو داگیرکاران، رووەو لەناوچوون دەچن و لەبەرامبەر وشیاری نەتەوەییشماندا رۆژ بەرۆژ داگیرکاران بەرەو کەنارەکانی بێ دەسەلاتیو بێ ئومێدی دەچن.

کەواتە YNDK سێیەم کۆنگرەو چوارەم ساڵیادی، بەسەرکەوتنی فکریو سیاسی لەواری نەتەوەییماندا پیرۆز دەکات و، لەبەرانبەریشدا هەرەسی بیری داگیرکاری لەکوردستاندا رادەگەیەنێت، لەهەوڵ و بەرخودانی بەردەوامیشدا دەبێت کە ساڵی (٢٦٩٩-ی کوردی) بکاتە ساڵی پەرەسەندن و بوژانەوەی زیاتری بیری نەتەوەییو هەڵمالینی هەموو دەمامکە ئاشکراو نائاشکراکانی بیری داگیرکاری لەناوەخۆو دەرەوەی کوردستان.

* ئەم وتارە لەژمارە (٤٤)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- لەرۆژی ١٩٩٩/٣/٢١ بلاوکراوەتەوە.

## له پێنجه‌م ساڵیادی دامه‌زراندنی YNDKدا :

# تیشك خستنه سه‌ر چه‌ند لایه‌نێكی بیری نه‌ته‌وه‌یی

با سه‌ره‌تا ئه‌گه‌ر به‌كورتیش بێت پێناسه‌یه‌ی بیری نه‌ته‌وه‌یی كوردی بكه‌ین، كه ده‌توانین به‌(كوردایه‌تی) ناوی بهێنین و پاشان به‌پێی ره‌وشی سیاسی‌و كۆمه‌لآیه‌تی ئه‌مڕۆمان چه‌ند لایه‌نێكی ئه‌م هزره رۆشن بكه‌ینه‌وه، یاخود ده‌رگایه‌ك له‌ڕووی (كوردایه‌تی) ئاوه‌لا بكه‌ین، به‌و هیوایه‌ی بگه‌ینه پێناسه‌و روانێكی به‌رفراوان له‌ئاستی جه‌ماوه‌ری‌و سیاسی له‌كوردستاندا، واقیعی ئه‌مڕۆمان سه‌لماندوێتی (كوردایه‌تی) ئه‌و هزره‌یه، كه له‌پرۆسه‌ی ژیانی هاولآتیانی كوردستاندا، كه‌موكورتی‌و بۆشاییه‌كانی رۆحی‌و عه‌قلی مرۆڤه‌كانی كوردستان پڕ ده‌كاته‌وه واته هزری نه‌ته‌وه‌یی ته‌نیا له‌سه‌ر لایه‌نی سۆزو رۆح یاخود له‌سه‌ر لایه‌نی‌پابه‌ند بوونی یه‌ك لایه‌ن به‌عه‌قڵ دانه‌مه‌زراوه، به‌ڵكو به‌و شێوه‌یه كه سه‌رتاپاگیر كێماسییه رۆحی‌و عه‌قلآنییه‌كانی مرۆڤ چاره‌سه‌ر ده‌كات (ئه‌گه‌ر به‌شێوه‌یه‌كی زانستیانه پێڕه‌و بكرێ‌و لێكۆڵینه‌وه‌ی له‌سه‌ر بكرێ)، هه‌ر بۆیه‌ش له‌مڕۆماندا هزری كوردایه‌تی زیاتر له‌هه‌ر بیرێكی تری سه‌ر گۆڕه‌پانی سیاسی‌و جه‌ماوه‌ری كوردستان به‌شێوه‌یه‌كی سه‌رتاپاگیر خۆی ده‌نوێنێ‌و رۆژ له‌دوای رۆژیش به‌جه‌ماوه‌ریتر ده‌بێته‌وه.

ده‌بینین ئه‌مڕۆ له زۆر لاوه هه‌وڵده‌درێت كه نه‌ته‌وه‌كه‌مان دووچاری سه‌رگه‌ردانی بكرێت، سه‌رگه‌ردانی له‌هه‌موو رووبه‌كه‌وه (سیاسی- جه‌ماوه‌ری- كلتوری..)، به‌لآم تائێستا نه‌توانراوه به‌یه‌ككگرتوویی به‌ره‌نگاری ئه‌م (سه‌رگه‌ردانییه) ببینه‌وه، به‌ڵكو هه‌ر كه‌سه‌و به‌پێی هزری خۆی تێیده‌ڕوانێ‌و هه‌وڵی چاره‌سه‌ر كردنی ده‌دات و، هه‌ندێ كه‌س و لایه‌نی تریش به‌(هۆشیاری یاخود ناهۆشیاری) پشتیوانی له‌پرۆسه‌ی (سه‌رگه‌ردان) كردنی نه‌ته‌وه‌كه‌مان ده‌كه‌ن، بۆ خۆ پاراستن له‌م حاڵه‌ته پێویستیمان به‌وه هه‌یه، ره‌وشت (ئه‌خلاق)ی كار كردنی خۆمان بناسین و بزانین تا چ سنوورێك، تا چ راده‌یه‌ك و به‌چ شێوه‌یه‌ك كار كردنی سیاسی‌و جه‌ماوه‌ری‌و كلتوری ده‌بێته نیشانه‌ی ره‌وشت به‌رزی‌و خزمه‌تكردن، دیاره ناساندنی ره‌وشت (ئه‌خلاق) له‌بواری

سیاسی‌و ئابووری.. پێناسه‌ی جیاواز له‌خۆ ده‌گرێت و گونجاویشه‌ که‌ به‌پێی گۆڕانکارییه‌کی سه‌رده‌میش پێناسه‌ کردنی هه‌ر چه‌مکێکی کۆمه‌لایه‌تی- سیاسی.. گۆڕانی به‌سه‌ردا بێت، به‌لام ئه‌مڕۆ له‌پێناو پاراستنی ده‌ستکه‌وته‌کانی راپه‌ڕیندا حه‌قیقه‌تێك خۆی، ده‌چه‌سپێنیٚ که‌ ره‌وشی سیاسی‌و کلتووری‌و کۆمه‌لایه‌تیمان له‌خزمه‌تی یه‌کتردا بن و رێگه‌ نه‌درێت به‌هیچ بیانوویه‌ك ناته‌بایی له‌ناو لایه‌نه‌کانی ژیانی خه‌لکی کوردستان دروست ببێت، به‌لام ئاشکرایه‌ که‌ بوونی بیروڕاو شیکردنه‌وه‌ی جیاواز بۆ ره‌وشی کوردستان شتێکی مه‌ده‌نی‌و پێشکه‌وتنخوازانه‌یه‌، به‌مه‌رجێك له‌خزمه‌تی به‌ره‌و پێشتر بردنی ژیانی خه‌لکدا ببێت.

(کوردایه‌تی)یش وه‌ك بیری مرۆڤی نه‌ته‌وه‌یی، پێویسته‌ زیاتر له‌هه‌ر کاتێکی تر قسه‌ له‌سه‌ر ئه‌و چه‌مکانه‌ بکات که‌ واقیعی ژیانی ئه‌مڕۆی کوردستان ده‌یهێنێته‌ ئاراوه‌، ته‌نیا له‌ڕێگه‌ی تێگه‌یشتن له‌ڕه‌وشتی (کوردایه‌تی) ده‌توانریٚ پێشڤه‌چوونه‌کان بخرێته‌ خزمه‌ت خه‌لکی کوردستان. ئه‌م حاله‌ته‌ی بیری کوردایه‌تی بۆ هه‌موو تاکێکی ولاتپارێزه‌کانی تاکه‌ ره‌وشت و بیری راستی خزمه‌تکردنه‌ به‌واقیعه‌که‌، واته‌ حزب و که‌سایه‌تییه‌ کوردییه‌کان ده‌بیٚ سه‌ره‌ڕای جیاوازی هزری‌و ئایدۆلۆژیان خزمه‌ت به‌رێچکه‌ی به‌رو پێش بردنی (کوردایه‌تی) بکه‌ن، به‌لام ئه‌م حاله‌ته‌ بۆ نه‌ته‌وه‌کانی تری سه‌ر خاکی کوردستان که‌مێك جیاوازتره‌، چونکه‌ ئه‌وانیش خاوه‌ن زمان و کلتووری تایبه‌ت به‌خۆیانن، ئه‌گه‌رچی له‌ڕاستیشدا تێنه‌گه‌یشتنی نه‌ته‌وه‌کانی تری سه‌ر خاکی کوردستان له‌ڕاستی (کوردایه‌تی)، ئه‌وا دوور نییه‌ دووچاری کێشه‌مان بکات یاخود به‌شێکی هاولاتیانی کوردستان دووچاری سه‌رگه‌ردانی بکات و ئاسووده‌یی له‌به‌شێکی تری خه‌لکیش تێك بدات، یاخود دووچاری کێشه‌و ململانێی نادروستمان بکات، که‌ ئه‌مڕۆ به‌هۆی هه‌ندێك لایه‌نی لاواز له‌ (حزبه‌ تورکمانییه‌کان) خه‌ریکن جۆرێك له‌تێنه‌گه‌یشتن و ئاژاوه‌ دروست بکه‌ن (به‌هاوکاری ولاتانی ناوچه‌که‌)، واته‌ لێره‌وه‌ تێده‌گه‌ین مه‌سه‌له‌که‌ دوو لایه‌نی هه‌یه‌، له‌لایه‌ك حزبه‌ کوردییه‌کان له‌داڕشتنی به‌رنامه‌ی کاریاندا (چه‌پ یا راست بن) ده‌بیٚ له‌به‌رژه‌وه‌ندی بیری کوردایه‌تیدا بن و له‌لایه‌کی تریشه‌وه‌ ده‌بیٚ که‌مه‌ نه‌ته‌وه‌کانی تر ئه‌وه‌یان له‌لا روون بێت که‌ ته‌نیا له‌ڕێگه‌ی به‌حاکم بوونی (کوردایه‌تی)یه‌وه‌ ده‌توانن له‌کوردستاندا به‌مافه‌ کلتووری‌و رۆشنبیرییه‌کان شادبن

(پەرلـەمان و حکومـەتی کوردسـتانیش باشـترین ئـەزموونن بـۆ سـەلماندنی ئـەم راستیانە).

لێرەوە دەگەینە ئەو بڕوایەی کە پێویستە حزبە نەتەوەییە کوردییەکان، هەنگاوی مەزنتر بهاوێن بۆ کۆکردنەوەو تێگەیشتنێکی جەماوەری بەرفراوان، تا ئەو رادەیەش کە کەسانی سـەر بەنەتـەوەکانی تـری سـەر خـاکی کوردسـتانیش لـەدەوری خۆیـان کۆبکەنەوەو رێکیان بخەن، چونکە هەروەك روونمان کردەوە کە (کوردایەتی) خزمەتی سەراپای خەڵکی کوردستان دەکات، ئیتر هیچ رێگەییەك نامێنێ کە بەر بەوە بگرێت کـە (تورکمـان و ئاشـووری)ییـەك لـەریزی بزاڤـی کوردایـەتییدا خـەبات نەکـەن. ئـەم تێڕوانینـەی بـیری کوردایـەتی بـۆ (نەتـەوەکانی تـری کوردسـتان) بەرانبـەر بەئایینـە جیاوازەکانی کوردستانیش هەر هـەمان شـتە، چونکـە ئاینـەکانیش دەتوانـن بـەڕێگای خۆیانـەوە خزمـەتی ئـەم هـزرە بکـەن، بـۆ ئـەوەی ئاسـودەیی دابـین بکـرێ‌و تـیرۆرو تۆقاندیش بنـبڕ بکرێـت، دیـارە کـە ناتوانرێـت ستەمکاری نـەهێڵدرێت تـاوەکو گشـت لایـەك لـەژێر چـەترێکی ئاسـوودەدا کۆنەبینـەوە، لـێرەدا بۆمـان دەردەکـەوێت کـە (کوردایـەتی) بـیرێکی قـاڵب بەسـتووی بەرتەسـك نییـە، بـەڵکو لەبەرانبـەر بـیری داگیرکاری‌و هێرشـی دوژمنـانیدا هیـچ درزو کەلەبـەرێك ناهێڵێتـەوە، بـەڵام لەبەرانبـەر خەڵکی ولاتپارێزی کوردستاندا (بەهەموو چین و توێژو نەتەوەو ئاینە جوداکانییەوە) دەرگاکانی خۆی بەکراوەیی هێشتۆتەوە، جا کە ئەم شێوازە خەسڵەت و پێناسـەی (کوردایەتی) بێت، کەواتـە بۆ ئـەوەی بەنـەمری بمێنێتـەوە، هەمیشـە پێویستی بەخۆ نوێکردنەوەو خۆگونجاندن هەیە لەگەڵ بارودۆخەکاندا بەپێی بەرژەوەندی‌و ئاسایشی نەتەوەییمان، ئەمەش حەقیقەتێکە کە مێژووی خەبات و هـزری گۆڕەپـانی کوردستان سـەلماندویەتی.. هـەر بۆیـە ئەگـەر ئاورێك لـەرابردومان بدەینـەوە دەبینـین زۆر کـەس و هەندێك لایەنی سیاسیش پێیان وابووە کـە (کوردایـەتی) بیرێکی (مەرحەلییـە)، بـەڵام واقیعی ژیان سەلماندی کە ئایدۆلۆژیا هێنراوو نامۆکـان (مەرحـەلیین)..، هـەر بۆیـەش ئەو هزرە نامۆیانە نەیانتوانی یاخود واقیعی ژیان رێی پێنەدان کە لەگەڵ رەوتی ژیان و خۆڕاگری (کوردایەتی)دا بەردەوام بن، هەر بۆ نموونە سەردەمانێك دەوترا کە دەبێ (بیری پرۆلیتاری) رابەری بزوتنەوەی رزگاریخوازییمان بکـات، یـاخود تـەنیا لەڕێگـەی ئایینەوە رزگارمان دەبێت.. کەچی ئەمڕۆ سەراپای هزرو ئایینەکانی کوردستان ئەگەر

لەپێناو مانەوەی خۆشیاندا بێت، ئەوا پشتیوانی خۆیان بۆ هزری کوردایەتی دووپات دەکەنـەوە، کەواتـە مایـەی خۆشـحاڵییە کـە ئێسـتاو پاشـەڕۆژیش بـۆ بـیری (کوردایەتی)یە، نەك لەبەر ئەوەی کە YNDK هەڵگری ئەم بیرەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە بەرابەر بوون و دەسەلات گرتنە دەستی بیری (کوردایەتی) کە ئەمڕۆ بالادەستە نەتەوەکـەمان لـە زۆر کـردەوەی کۆمـەڵکوژیو تـیرۆرو چەوسـانەوەی ئـاینیو نەتـەوەییو.. دوور دەکەوێتـەوە، کـە دوور نـەبوو ئەگـەر ئـەمڕۆ هـەر بـیرێکی تـر لەکوردسـتاندا بالادەسـت بوایـە ئـەوا لەجێگـەی ئـەم ئاسـوودەییەی ئـەمڕۆ ئـەوا سەرگەردانیو ستەمکارییەکی سەرتاپاگیر بالادەست دەبوو.

YNDKش لەکاتێکدا یادی پێنجەم ساڵیادی خـۆی دەکاتـەوە، کـە (٢٧٠٠) سـاڵ بەسەر یادی ئیمپراتۆریـەتی (میدیا)شـدا تێدەپەڕێت، کەواتـە ئـەرکێکی مـەزن لەسـەر شانی گشت حزب و کەسایەتییە نەتەوەییەکان بەگشتیو YNDKیش بەتایبەتییەکە هـەوڵی ئـەوە بـدەن مێـژوو کلتـورو ئاینـە نەتەوەییـەکانمان (زەردەشـتیو یـەزیدیو مـانی..) بەنـەمری بهێڵنـەوەو چیـتر ڕێگـە نـەدرێت مێـژوو جوگرافیـای کوردسـتان بەدەستی داگیرکەرانەوە لەکەدار بکرێت، بۆیە لێرەشـدا باسمـان لەلایـەنی ئاینیش کـرد، چونکـە ئـەو ئاینانـە سـەردەمانێکی زۆر بناغـەو سـەرچاوەی ڕۆحـی نەتەوەکـەمانیان پێـك هێنـاوەو نـاکرێت بـاس لـەمێژووشمان بکـەین ئەگـەر لایەنـە ڕۆحییەکانی رابردووی نەتەوەکەمان لەلا روون نەبێت، واتە دەبێت لەساڵی (٢٧٠٠)ی کوردیدا مۆزەخانەیەك بۆ کۆکردنەوەو پاراستنی ئەو دەق و لێکۆڵینەوانە بکرێتـەوە، کە بایەخیان بەلایەنە ڕۆحیو ئایینەکانی نەتەوەی کورد داوە.

* ئـەم وتـارە لـەژمارە (٦٣)ی ڕۆژنامـەی میدیـا- سـاڵی چـوارەم- ڕۆژی ٢٠٠٠/٣/٢٧ بلاوکراوەتەوە.

# روانینێکی نەتەوەییانە بۆ ئۆپۆزسیۆنی عێراقی

بوونی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەشێوازێکی وەها، کە لەڕابردوو ئێستاشدا، کارو چالاکییەکانی لەدەرەوەی عێراق ئەنجام دەدات و بەهەموو شێوەیەك لەناو خۆی عێراقدا ڕێگە نادرێت بەئاشکرا ئۆپۆزسیۆن چالاکی ئەنجام بدات، کە ئامانجی ئەم ئۆپۆزسیۆنەش سەندنەوەی دەسەڵاتە لە بەعسییەکانی بەغدا، کەواتە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەرهاوێشتەی ڕەوشتێکی دیکتاتۆریانەیەو هەموو هێزێکی دیکتاتۆریش دەبێت بەکاردانەوەیەکی هاوشێوەی وەك خۆیو بگرە توندتریش لەناو ببرێت، ئایا ئەگەر حوکمی دیکتاتۆری بەم شێوەیە لەناو بچێت زەمینە خۆشکەر نابێت بۆ دووبارە بوونەوەی سیستمێکی دیکتاتۆریانەی تر لەسەر دەستی ئەو ئۆپۆزسیۆنەی کە ئێستا داوای چەسپاندنی سیستمی دیموکراسیو مافی مرۆڤ دەکات لەعێراقدا، یاخود ئایا هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن بەهۆی ململانێیان لەسەر دەسەڵات، گەلانی عێراق دووچاری شەڕێکی ناوخۆی درێژخایەن ناکەنەوە. ئەمەو چەندین گومان و ئەگەری تر کە لەدەروونی گەلانی عێراقیدایە تەنیا لەواری پراکتیکدا بۆمان ڕون دەبێتەوە. بەهەر حاڵ ئەوەی لەم نووسینەدا ئامانجی ئێمەیەو بەگرنگی دەزانین، ڕوانینێکە لەچارەنووسی باشووری کوردستان لەناو ئەم گێژاوو ململانێیەدا، کەهەر لەسەرەتاوەش باشووری کوردستان بەزۆر مۆرکی (عێراقی بوونی) پێوە لکێنراوەو ئێستاش ناچارە کە تا ئەو ڕۆژەی کوردستانێکی سەربەخۆو ئازاد بنیات دەنێت، لەناو هەموو ململانێکانی عێراقیدا بەرژەوەندییەکانی خۆی بپارێزێت و بەراستەوخۆو ناڕاستەوخۆش هەمیشە وەك لایەنێکی بەهێزی ململانێیەکان حسابی بۆ کراوە، وەك لەکاتی شۆڕشی ئەیلولدا کە عێراق لەپەیمانی شوومی جەزائیردا (کەنداوی عەرەبی) کردە (کەنداوی فارسی)و هەروەها لەشەڕی هەشت ساڵەی عێراق– ئێران.. تد کەواتە لەحاڵەتێکی ئاوهادا لەکاتێکیشدا کە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لەساڵانی هەشتاکاندا کە لەڕووی سیاسیو جەماوەرییەوە، لەناوخۆو دەرەوەی عێراقیشدا لەوپەڕی لاوازدا بوو، لەو کاتانەشدا هیچ مافێکی نەتەوەیی بەکورد ڕەوا نەبینیوەو هەمیشە لە کۆنگرەکانی خۆیدا (ئۆپۆزسیۆن) تەنانەت کێشەی کوردی دان پیانەناوەو ئەگەر باسیشیان کردبێت، ئەوا چارەسەریان بۆ ئەوکاتە هەڵگرتووە، کە بەحسابی خۆیان

حوکمـی عێراقیـان گرتـه دەسـت، کـه دواترین نموونـەشمان دوای راپەرینـه جەماوەرییەکەی خەڵکی کوردستان بوو، کە لەسەر خاکی ئـازاد کراوی باشووری کوردسـتان، کۆنگرەیـەکی ئۆپۆزسـیۆن بەسـتراو پاشـان بەشـی زۆری لایەنـەکانی ئۆپۆزسیۆن ئەو کۆنگرەیەیان بەشەرعی نەزانیو ئەوانی تریش رازی نەبوون فیدراڵی بۆ باشووری کوردستان دابنێن.

هـەروەك دەزانین کە لەم رۆژانەشدا، بەشێوەیەکی گەرم دەنگوباسـی سـەر لـەنوێ بەگەڕ خستنەوەو چالاکتر کردنی ئۆپۆزسیۆن لەئارادایەو وولاتانی رۆژاوا بەگشتیو ئەمریکا بەتایبەتی لەهەوڵی سەر لەنوێ رێکخستنەوەو کۆکردنەوەی ئۆپۆزسیۆندان، ئاشکراشـه لـەباروودۆخێکی ئاوهـادا، سـەرجەم هـێزو کەسـایەتییە نەتـەوەییو وڵاتپارێزەکان بەهیوای ئەوەن، کە مەینەتیو زوڵم و زۆرەکانی سەر شانیان کۆتایی پێبێت، هەروەها پەرلەمان و حکومەتی کوردستانیش دەبێت لەهەوڵی جدیدا بێت کە ململانێییەکان بخاتە خزمەت ئاسایشـی نەتـەوەییمان، چونکـه واقیعـی نەتـەوەییمان سـەلماندوویێتی کـه سـەرەڕای زوڵـم و چەوسـانەوەی داگیرکـەران و هـەوڵدانیان بـۆ نەهێشتنی مۆرکی نەتەوەییمان، کەچی لەڕووی پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە جیاوازییەکی بەرچاو هەست پێدەکرێت لەنێوان نەتەوەی کوردی بندەست و نەتەوەی عـەرەبی سەردەسـت لـەعێراقدا، کەئێسـتاش بەئاشـکرا ئـەو جیاوازییـه لـەنێوان بزوتنـەوەی کوردایـەتیو ئۆپۆزسـیۆندا هەسـتی پێدەکرێـت، کـە ئـەویش دەتوانرێـت بەلانی کەمەوە لەچەند خاڵێکدا چڕ بکرێتەوە:

١-لـەپێش دروست بوونـی سـەرجەم هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن کەئێسـتا ئامادەییـان هەیە، کێشەی کورد بوون و ئامادەیی هەبووە، ئەمەش بەهۆی بوونی پرۆسەی زوڵم و داگیرکـاری لەکوردسـتاندا، هــەر بۆیــەش لەســەردەمی مەلەکیەتــەوە لەباشـووری کوردسـتاندا، حزبـی کوردسـتانیو رێکخـراوی نەتـەوەیی دامـەزراوە، ئامانجیشـی نەهێشتنی چەوسانەوە بووە لەسەر کورد. باشترین نمونەشمان دروست بوونی پارتی دیموکراتی کوردستانه لەساڵی ١٩٤٦دا بەڕێبەرایەتی بارزانی نەمر، لـەکاتێکدا کـە ئۆپۆزسـیۆن بـەهۆی زوڵـم و تـاکڕەوی بەعسـی عـێراقی دروسـت بـووە، خـۆ ئەگـەر بەعس و (سەدام حسین) بەم شێوازەی ئێستا حوکمی عێراقی نەکردایە و رێگەی بەو کەسانەی ناو ئۆپۆزسیۆن بدایـه کـه بەشداری لەدەسەڵاتدا بکـەن، ئـەوا ئەگـەر کـورد سـەد هێنـدەی تر چەوساوە بوایـە، ئـەوا زەحمـەت بوو کـە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بـەو شێوەیەی ئێستای دروست ببوایە، باشترین نمونـەش بوونـی حزبـی شـیوعی عێراقـە،

که خۆی بەپێشکەوتنخواز ترین هێزی ناو ئۆپۆزسیۆن دەزانێت، کەچی لەساڵانی (١٩٥٨-١٩٦٣) لەگەڵ رژێمی (قاسم)دا هاوپەیمان بوو، بەئاشکراش چاوی لە چەوسانەوەی کوردان دەپۆشی‌و دواتریش لەساڵانی (١٩٧٣-١٩٧٩) هەر هەمان حزبی شیوعی (بەرەی نیشتمانی!) لەگەڵ بەعسییەکان دروست کردو چاوی لەو زوڵم و چەوسانەوەیەی سەر نەتەوەکەمان پۆشی.

٢-لەئاستی ناوخۆیدا، پەرلەمان و حکومەتی کوردستان بڕیاری سیستەمی فیدراڵی داوە بۆ باشووری کوردستان، کەواتە دەبێت لەم حاڵەتەدا هەوڵی چەسپاندن و سەپاندنی فیدراڵی بدات بەسەر دەسەڵاتدارانی بەغدادا (جا دەسەڵاتدارانی بەغدا هەر کێیەك بن!)، بەڵام ئۆپۆزسیۆن دەبێت هەوڵی لەناوچوونی دەسەڵاتدارانی ئێستا بدات بۆ ئەوەی جێگەیان بگرێتەوە، لەم حاڵەتەشدا شتێکی سروشتیە کە ئۆپۆزسیۆن لەلایەك و حاکمانی ئێستای عێراق لەلایەکی ترەوە، لەهەوڵی ئەوە دابن کە خۆیان لەم ئەزموونەی باشووری کوردستان نزیك بکەنەوەو هەوڵی ئەوە بدەن بیخەنە خزمەت بەرژەوەندییەکانی خۆیان، چونکە ئۆپۆزسیۆن دەزانێت کە باشووری کوردستان کراوەترین دەرگایە بۆ ئەوەی لێرەوە بێتەوە ناو خاکی عێراق (ئەرزی واقیع)و حکومەتی عێراقیش هەوڵ دەدات ئەم دەرگایە لە ئۆپۆزسیۆن دابخات، بۆ ئەوەی چالاکییەکانیان دووچاری شەلەل بێت، کەواتە ئەمڕۆ باشترین زەمینە رەخساوە کە حکووتی کوردستان و بزووتنەوەی کوردایەتی لەباشووردا، لەنێوان ئەم ململانێیە ناو خۆییەدا بەرژەوەندییەکانی خۆی بەدیبهێنێ، کە ئەویش رزگار کردنی تەواوی خاکی باشووری کوردستان و چەسپاندنی فیدراڵیەتە، وەك تاکە رێگایەکی واقیعیانەو سەردەمانە بەرەو سەربەخۆیی کوردستان.

هەروەك ئاشکراشە لەئاستی دەرەکی‌و نێو دەوڵەتیشدا، ئێستا کێشەی کورد جیاواز لەکێشەی ئۆپۆزسیۆن حساب و مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، هەر ئەمەش وایکردووە کە کێشەکەمان ببێتە کێشەیەکی نێو دەوڵەتی، کەواتە حەق نییە بزوتنەوەی کوردایەتی بەتەواوی کێشەی خۆی تێکەڵ بەکێشەی ئۆپۆزسیۆن بکات، چونکە لەم حاڵەتەدا دووبارە کێشەکەمان لەواری نێو دەوڵەتیدا دووچاری پاشەکشە دەبێت، هەر چەندە حکوومەتی کوردستان و پارتی دیموکاتی کوردستان، تا رۆژانی ئەمرۆمان حەکیمانە مامەڵەیان لەگەڵ ئەم کێشەیەدا کردووەو خستوویانەتە بەرژەوەندی باشووری کوردستان، بەڵام هەندێك لایەنی سیاسی لەهەوڵی ئەوەدان کە کێشەکەمان تێکەڵ بەکێشەی (المجلس الاعلی الاسلامی) بکەنەوە، کە لەڕووی

هەڵوێستەوە خراپترین باڵی ئۆپۆزسیۆنە لەئاستی نێودەوڵەتیدا، کە ئەمەش تەنیا زیان بەکێشەی ڕەوای نەتەوەییمان دەگەیەنێت. واتە با ئەو بایەخ و گرنگییەی ئێستای ناوچە ئازادکراوەکانی باشووری کوردستان (لەواری ناوخۆیو نێو دەوڵەتیدا) بخەینە خزمەتی ئاسایشی نەتەوەییمان، نەك خزمەتکردنی بەرژەوەندییەکانی هێزو لایەنی سیاسی تر.

٣-پەراگەندەیی ناو هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەبێت حسابی بۆ بکرێت، چونکە هێزو لایەنەکانی ناو ئۆپۆزسیۆن هەریەکەیان لەهەوڵی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیانن، کە بەرژەوەندییەکانیشیان بەندە بە بەرژەوەندی وولاتێکی ئیقلیمیەوە یاخود وولاتێکی ترەوە، سەرەڕای ئەوەش تاوەکوو ئێستا ئۆپۆزسیۆن بەگشتی نەیتوانیوە لەبەرانبەر چارەنووسی باشووری کوردستاندا ڕایەکی مەعقوول و واقیعیو یەکگرتووی هەبێت، و هەریەکەیان بەپێی بەرژەوەندیو ئایدیای خۆی لەکێشەکەمان دەڕوانێت، لەکاتێکدا پەرلەمانی شەرعی کوردستان و بزووتنەوەی نەتەوەییمان و نەتەوەکانی تری سەر خاکی باشووری کوردستانیش، سەرجەمیان هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە سیستمی فیدراڵی لەبارودۆخی ئێستاماندا چارەسەرێکی واقعییە بۆ کێشەکەمان، لەم قۆناغەدا، خستنە ڕووی ئەم جیاوازییانە مانای ئەوە نییە، کە ئێمە لە YNDK دەسەڵاتدارانی ئێستای بەغدامان لە ئۆپۆزسیۆن پێباشترە، بەڵکو ئەمە خستنە ڕووی واقعێکە کە لەئێستادا بزووتنەوەی نەتەوەییمان ڕووبەڕووی بۆتەوە، هەرچەندە نەتەوەکەمان لەباشووردا لەسەر دەستی بەعسی عێراقی دووچاری سیاسەتی قڕکردن و جینۆسایدێکی لەڕادەبەدەر بۆتەوە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە بزووتنەوەی نەتەوەییمان لەباشووردا، بێ ئەوەی سەیری بەرژەوەندییەکانی خۆی بکات بڕیاری ئەوە بدات یاخود ڕێگە بە ئۆپۆزسیۆن بدات باشووری کوردستان بکاتە پێگەو خاڵی دەست پێکردنی چالاکییەکانی، چونکە مێژووی خەباتی نەتەوەییمان لەباشووردا سەلماندوویەتی کە گۆڕانی دەسەڵاتی دەوڵەت لە تاقمێکەوە بۆ تاقمێکی تر لەعێراقدا، مەرج نییە ببێتە هۆی هێنانەدی ئامانجە نەتەوەییەکانمان، یاخود سووك کردنی چەوسانەوەو زوڵم و زۆر لەسەرمان بەڵکو لەعێراقدا زۆر جار کەسانی دەسەڵاتدار گۆڕاون، بەڵام ڕەوشی نەتەوەییمان هەروەك خۆی یاخود خراپتر بووە.

* ئەم وتارە لەژمارە (٤٧)ی ڕۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- لەڕۆژی ١٩٩٩/٦/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

## کۆنگرەی ئەم جارەی ئۆپۆزسیۆن:

# سەرکەوتنی خواستێکی نەتەوەیی‌و دابەشبوونی لایەنە بەشدار نەبووەکان

رەخنەیەکی سەرتاپاگیر لەئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەگیرێ، چ لەلایەن دۆست و چ لەلایەن دژەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە، دۆستەکان بەدیدێکی بنیات نەرانە رەخنە لەئۆپۆزسیۆن دەگرن، کە ناتوانن کاریگەرو هاوهەڵوێست بن بۆ بنیاتنانی عێراقێکی فیدراڵ و دیموکرات..، دژەکانی ئۆپۆزسیۆنیش گاڵتە بەرەوشی ئێستای ئۆپۆزسیۆن دەکەن و دەیانەوێت جەماوەری عێراق دڵنیابکەنەوە، کە ئۆپۆزسیۆن ناتوانێت لەئایندەدا حوکمڕانی عێراقێکی ئارام و دیموکرات بکات.

بەڵام هێزە دژەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی تەنیا رژێمی بەعسی حاکم نییە، چونکە بەپێی دابەشبوونی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن بەسەر بەرژەوەندی وڵاتانی ئیقلیمی‌و جیهانیدا، وایکردووە کە وڵاتێك پشتگیری هێزێك یاخود رەوتێکی ئۆپۆزسیۆن بکات و دژی لایەنێکی تری ناو ئۆپۆزسیۆنی عێراقیش بێت، ئەمەش وایکرد لەکۆنگرەی ئەم جارەی ئۆپۆزسیۆندا (کە بۆ ماوەی سێ رۆژ لەنیویۆرك بەردەوام بوو) چەند لایەنێکی ناو ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەشداری نەکەن، ئاشکراشە هەر لایەکی بەشدار نەبوو لەکۆنگرەکەدا (بەمەرجێك پێشتر دەعوەتی کۆنگرەکە کرابێ) لەپشت هۆکاری بەشدار نەبوونیەوە وڵاتێکی ئیقلیمی هەیە..، بەشداربووانیش هاوکاری‌و هاوپشتی ئەمریکایان هەیەو داواکارن کە ئەمریکا زیاتر هاوکاری ئۆپۆزسیۆن بکات بۆ ئەوەی بتوانن گۆڕانکاری لەسیستمی دەسەڵاتداریێتی ئێستای بەغدا بکەن.

بەهەرحاڵ ئێمە لە YNDK هەمیشە لەو باوەڕەدا بووین کە لایەنە سیاسیەکانی کوردستان بەگشتی، لەبەرانبەر هەر بڕیارێکی ناوخۆیی‌و دەرەکی کە پێوەندی بە ئایندەی نەتەوەییمانەوە هەبێت دەبێت هاودەنگ و هاوپشتی یەکتربن و، ململانێی ناوخۆییەکانی خۆیان لەبیربکەن و بەرژەوەندی باڵای نەتەوەییشمان بخەنە سەرووی هەموو بەرژەوەندییەکانی ترو، هەر لەروانگەی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانمانەوە ستراتیژو تاکتیکی خۆیان دابڕێژن، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە سەدەی داهاتوو ببێتە سەدەی تیمارو چارەسەرکردنی ئەو هەموو برین و پارچە پارچەبوونەی نەتەوەکەمان بەدرێژایی سەدەی بیستەم رووبەڕووی بۆتەوە. هەر لەم روانگەیەوە سەرەڕای ئەو هەموو تێبینی‌و پرسیارانەی کە بەرانبەر باڵی عەرەبی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی هەمانە، بەرەسمی ناسین و خستنە بەرنامەو شەرعییەت پێدانی فیدراڵیزم بۆ کوردستان بەدەستکەوتێکی مەزن و هەنگاوێکی ئیجابی بەرەو سەربەخۆبوونی کوردستان دەنرخێنین، و دیارە ئەم بڕیارەش لەئەنجامی کۆششی سیاسی‌و دبلۆماسیانەی لایەنە ولاتپارێزە کوردییەکان هاتۆتە بەرهەم، چونکە هەروەك دەزانین لەکۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی ساڵی (١٩٩٢)، کە لەسەر خاکی باشووری کوردستان بەسترا، ئۆپۆزسیۆن ئەوکات ئامادەنەبوو دان بە مافی فیدراڵیەتدا بۆ باشووری کوردستان دا بنێت، بەلاّم دیارە لەئەنجامی هەوڵ و کۆششی حزبە بەشداربووەکانی ناو کۆنگرەی ئەم جارەی ئۆپۆزسیۆن لەنیویۆرکدا، توانراوە فیدراڵیەتی باشووری کوردستان بەرەسمی بناسێنرێت، ئەمەش هێنانەدی خواست و ئامانجێکی پەرلەمانی هەڵبژێردراوی کوردستانە، کە سەرجەم حزب و لایەنە سیاسییەکان و جەماوەری کوردستانیش پشتگیریان لەم داخوازییە کردووە.

بەلاّم ئەوەی لێرەدا دەمانەوێ جەختی لەسەر بکەینەوەو سەرنجی خوێنەرانی بۆ رابکێشین بەشدار نەبوونی چەند لایەنێکی ئۆپۆزسیۆنی عێراقییە، لەکۆنگرەی ئەم جارەی ئۆپۆزسیۆندا لەنیویۆرك، کە دیارە سەرەڕای جیاوازی بیروڕاو بەرژەوەندی ئیقلیمی ئەو لایەنە بەشدارنەبووانە، کەچی چەند خاڵێکی هاوبەش و خیتابێکی چوونیەك و موبەریراتی وەك یەکیان هەیە، کە دەیکەنە پاساوی بەشدارنەبوونیان لەکۆنگرەکەی ئەم جارەی ئۆپۆزسیۆن کە لەنیویۆرك بەسترا، چونکە ئەمریکاییەکان دەیانەوێت عێراقی داهاتوو، عێراقێکی پارێزەری بەرژەوەندییەکانیان بێت، نەك دژی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا بێت، لەم حاڵەتەشدا هێزە بەشدارنەبووەکانی ئۆپۆزسیۆنی

عێراقیش بۆیە بەشدارییان نەکرد، چونکە دڵنیابوون لەوەی ناتوانن خواستەکانی وڵاتە دراوسێیەکانی عێراق (جا چ ئێران یاخود سوریا یاخود تورکیا بێت) بەدیبهێنن و لەم حاڵەتەشدا دیارە لەبارەی ئایندەی عێراقەوە بەرژەوەندیەکانی (ئێران و سوریا) یەکیان نەگرتۆتەوە، بۆیەش (ئێران و سوریا) هانی لایەنە ئۆپۆزسیۆنە وابەستەکانی خۆیاندا کە بەشداری لەو کۆنگرەیەدا نەکەن.

ئیتر لێرەوەش ئۆپۆزسیۆنی بەشدار نەبوو، دابەشی سەر دوو لایەن دەبن، یەکەم ئەوانەن کە هێزێکی جەماوەرییان لەناو عێراقدا هەیە، وەك (مجلس الاعلی الاسلامیو حزبی دەعوە) کە جەماوەرێکی مەزهەبی (شیعە)یان هەیە، ئەوا دوورنییە بەهاوکاری؛ (ئێران) دەست بخەنە ناو عێراق و هەوڵی نەهێشتن و سەرنەکەوتنی کاری ئۆپۆزسیۆنەکانی کۆنگرەی نیۆیۆرك بدەن، لایەنی دووەمی بەشدارنەبوو، ئەو حزب و کەسایەتیانەن کە لەناو باشوورو ناوەڕاستی عێراق و باشووری کوردستانیشدا جەماوەرێکی کاریگەریان نییەو ناتوانن ببنە هێزێکی دیار لەگۆڕەپانەکەدا، ئەم لایەنانە (لایەنی دووەم) بەناچاری چاوەڕێی ڕەوشەکە دەکەن و وەك بێلایەنێك لەبەرانبەر ململانێکانی ناو ئۆپۆزسیۆن مامەڵە دەکەن، و لەحکومداری کردنی عێراقی پاش (سەدام حوسێن)یش باوەڕناکرێت کاریگەرییەکی ئەوتۆیان هەبێت. بەڵام هەردوو لایەنە بەشدارنەبووەکە لەکۆنگرەکەی نیویۆرکدا (چ خاوەن جەماوەر یاخود بێ جەماوەرەکان) خاوەن چەند سیفاتێکی هاوبەش و هاوشێوەن، لەوانە:

أ- هەردوولایان وڵاتێکی ئیقلیمی پشتیوانیان لێ دەکات و داڕێژەری نەخشەو سیاسەتەکانیانە لەداهاتوودا.

ب- هەردوولا دژی سیاسەتەکانی ئەمریکان و پێیان وایە هاوکاریکردن لەگەڵ ئەمریکا، لەنیشتمان پەروەرییان کەم دەکاتەوە، چونکە هەندێکیان ئەمریکا بە(هێزی کوفرو ئیلحاد)و هەندێکی تریان بە(ئیمپریالیزم و چەوسێنەر)ی دادەنێن.

ج- لایەنە بەشدارنەبووەکان لەگوتارو خیتابیاندا جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دەبێ لەسەر دەستی گەلانی عێراق ڕژێمی (سەدام حوسێن) بروخێنرێ، نەك لەسەر دەستی ئەمریکا.

د- بەقسەی لایەنە بەشدارنەبووەکان کۆنگرەکەی (نیویۆرك) بۆ ئۆپۆزسیۆنی عێراقی هیچ ئەنجامێکی ئیجابی نابێت، چونکە گوایە ئەوان (هێزی مەزهەبی شیعەو دژە ئیمپریالیزم) بەشداریان تیادا نەکردووە.

لەسەر ئەو تێڕوانینەی سەرەوە لەبارەی هێزی خاوەن جەماوەری (شیعە)و لایەنی بێ جەماوەری (دژە ئیمپریالیزم) لەڕاستیدا ئەمڕۆ زاراوەی ئیمپریالیزم باوی نەماوەو بەو زاراوانەش ناتوانرێت سۆزی جەماوەر رابکێشرێت، چونکە لەسەر دەستی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی توانراوە بەپێی سیستمی (دەستێوەردان) چەندین نیزامی دیکتاتۆری جیهانی لەناو چووەو سەرکوتکراوە،و ئۆپۆزسیۆنی عێراقیش کە لەکۆنگرەکەی ئەمساڵی ١٩٩٩دا، نەیتوانیوە خۆی بە جەماوەری (باشوورو ناوەڕاست)ی عێراقی بناسێنێت جا چ لەبەر بێئیرادەی سەرکردە ئۆپۆزسیۆنە عەرەبەکان بێت، یاخود لەبەر شارەزاییو دڕندەیی رژێمی (سەدام حوسێن) بێت، بۆ سەرکوتکردنی نەیارەکانی لەناوخۆو دەرەوەدا، کەواتە لەم حاڵەتەدا ئۆپۆزسیۆنی عێراقی ناکرێت دەستەوەستان بێت و چاو لەزوڵم و زۆرداریيەکانی حوکمدارانی ئێستای بەغدا بپۆشێت، بەڵکو مافی رەوای خۆیەتی لەپێناو دەسەڵات گرتنە دەستدا، سوود لەسیستمی (دەستێوەردان) وەربگرێت، چونکە ئێستا سیستمی (دەستێوەردان) شەرعیەتێکی نێودەوڵەتی هەیە،و هەر بۆیەش کارێکی شەرعییە کە هاوکارییەکی نێودەوڵەتی هەبێت، لەپێناو گۆڕانکارییەکی ئیجابی لەعێراقدا، لەنیزامێکی دیکتاتۆرییەوە بەرەو هەنگاونان بۆ پیادەکردنی بنەماو سیستەمە دیموکراتییەکان، ئەمەش تاکە رێگەیە کە ئۆپۆزسیۆن بتوانێت لەناوخۆو دەرەوەی عێراقدا سوودی لێببینێت، لەهەمان کاتدا بۆ ئێمەی کورد کارێکی نەتەوەییانەیە کە هەوڵ بدەین سیستمی فیدراڵی- دیموکراتی بەسەر حاکمانی عێراقدا بسەپێنین، جا چ ئەم سەپاندنە بەسەر (رژێمی ئێستا یاخود داهاتوودا بێت)و کارێکی نەشیاویشە لەپێناو بەرژەوەندی وڵاتێکی ئیقلیمیدا هاوکاری خۆمان بۆ کۆنگرەیەك دەرنەبڕین کە ئیدانەی سیاسەتی تەعریب و جینۆسایدی دەکات لە (کەرکوك و خانەقین و مەخموور.. تد) کە رژێمی (سەدام) بەسەر نەتەوەی کوردیدا هێناوە هەروەها ئەو کۆنگرەی (نیویۆرك) بڕیاری چەسپاندن و شەرعییەت پێدانی فیدراڵیزمی بۆ باشووری کوردستان بەڕەسمی ناساندووە.

* ئەم وتارە لەژمارە (٥٥)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- لەڕۆژی ١٩٩٩/١١/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

# قۆناغە ترسناك و سەختەكانی شەڕی ناوخۆ كە نەتەوەی كوردی دووچاری هەڕەشەی سڕینەوە كردبوو كۆتایی هاتووە

# زۆربەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی ئارەزووی حكومەتێكی فیدرالی دیموكراتیی‌یان نەكردووە

دیمانە: میدیا - بەشی چاوپێكەوتن

مەكتەبی ناوەندی رێكخستنی (YNDK)، یەكێكە لەو دەزگا ناوەندییە زۆر گرنگانەی، یەكێتیمان.. كە سەرباری كەمی تواناو ئیمكانیات.. توانیویەتی، لەخۆبووردوانە، بنكەیەكی رێكخستنی‌و جەماوەری بەرین لەدەوری (YNDK) كۆبكاتەوە. بەحوكمی نزیكی‌و تێكەلاویان لەگەڵ مەسەلە جەماوەری‌و سیاسی‌یەكانی گۆرەپانی سیاسی كوردستان، بەچاكمان زانی بەم دیمانە كورتە، ئاخاوتنێك لەگەڵ بەرێز هەڤاڵ (سەربەست مەحموود) بەرپرسی (مەكتەبی ناوەندی رێكخستن) سازبدەین و چەند پرسیارێكی ئاراستە بكەین بەمەبەستی ئاشناكردنی خوێنەران بەبیروڕاو تێڕامانی یەكێتیمان YNDK، سەبارەت بەهەندێ مەسەلەی پەیوەندار بەدۆزی كورد.

**میدیا: ئێوە وەکو (مەکتەبی ناوەندی ڕێکخستن) چ تەنزیراتێکتان هەیە بۆ وەزعی حزبیو ڕێکخراوەیی ئەمڕۆ ی کوردستان؟**

**هەڤاڵ (سەربەست):** لەپێش ڕووداوەکانی ئەم دواییەو لەساتەکانی شەڕی ناوخۆدا بەدرێژایی ئەم ماوەیە، هەردوو (حیزب) کە لەپەرلەماندا بوون بەشکلێك خۆیان نمایش کردبوو، کە لەواقیعیشدا هەر بەو شێوەیە بوو کە هەردوو حیزب بوونەتە سەبەبی ڕێگرتن لەئازادی سیاسیو فکریو حزبیو هەریەکەیان بەپێی بۆچوونی خۆیو ئەوەندەی پێویستە بۆ ئەوە ڕێگەی بەئازادی سیاسی دەدا. چونکە هەردوولا ترسێکی زۆریان لەتێکچوونی مەوقیعی خۆیان و کەم بوونەوەی نفوزیات لەناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیاندا. وە ئەو حزبانەی تریش کە لەپەرلەماندا نەبوون دەوری بەرگریان دەبینی لەئازادی سیاسی، چونکە لەبەر هەڕەشەی ئەوەدابوون کە لەشەڕی ناوخۆدا تێوەبگلێن و ببنە خۆراکی هەردوو زلهێزەکە لەبەر ئەوە وەك زەرورەتێکی عەقڵیو سیاسی ناچاربوون ببنە هێزی بەرگری لەئازادی ڕێکخراوەیی حزبی.

بەلام دوای ئەوەی شەڕی ناوخۆ بەتێکشکانی (ینك) کۆتایی هات و وردە وردە ناوچەکە ئارام دەبێتەوەو زۆر لەحزبەکان بەشداری لەحکومەتی هەرێم دا دەکەن. وای بۆدەچین کە وەزعی ناوخۆو وەزعی حزبیو ڕێکخراوەیی گۆڕانی بەسەردا بێت و حیزبەکان کە ئامانجیان بەرژەوەندی خەلکەو حکومەتی هەرێمیش کەهەمان خواستی هەیە بتوانن پێکەوە، حکومەتی هەرێم و پەرلەمان و حزبە سیاسیەکان و ڕێکخراوەکان نەك تەنها بەرگری لەئازادی فکریو ڕێکخراوەیی بکەن بەلکو ببنە سەبەبی چارەسەر کردنی ئەو پێشێلییەی کە لەمەوپێش لەلایەن هەردوو زلهێزەوە پیادە دەکرا. وە دەبێ ئەو ئازادیو دیموکراتیەی کە دێتە بەرهەم بۆ مەبەستی وشیار کردنەوەی خەلك و تێگەیشتن لەدیموکراسیو کێشەی بالای نەتەوەکەمان و قۆناغەکانی ڕزگاری نیشتمانی بەکاربهێنرێت. تاوەکو بتوانرێت کۆمەلگەی کوردستان وشیار بکرێتەوەو بەرەو بیرێکی نەتەوەیی پێشکەوتنخوازو کۆمەلگایەکی مەدەنیو شارستانی هەنگاو بنێت.

**میدیا: ئایا بەڕەئی ئێوە هەرەس هێنانی YNK لەشەڕی ناوەخۆ دەتوانین بلێین یەکلایی بوونەوەی تەواوی شەڕی ناوخۆیە؟**

**هەڤاڵ ( سەربەست ):** ئاشکرایە کە بوونی شەڕی ناوخۆ لەکوردستاندا بەواقیعی ئەوەی سەلماند کە شەڕی ناوخۆ واتە بەفیڕۆدانی داهاتی خەڵکی کوردستان بەکوشت دانی ڕۆڵەکانی گەل، هەرەس هێنانی ڕۆحی بەر گری‌و پێشێلی ئازادی فکری‌و سیاسی. جێهێشتنی ئاسەواری خراپی سایکۆلۆژی‌و بونیادنانی ڕۆحی شەڕەنگێزی لەسەر خەڵکی کوردستان کەواتە شەڕی ناوخۆ هیچ ئیجابیاتێکی نی‌یە، بەلاّم بەهەڵگیرسانی شەڕ تەنها قازانجی خەڵك لەوەدایە کە کۆتایی پی‌بێت. وای دەبینین کە قۆناغە ترسناك و سەختەکانی شەڕی ناوخۆ کە نەتەوەی کوردی دووچاری هەڕەشەی سڕینەوە کردبوو کۆتایی هاتووە، شتێکی ئاشکرایە کە (ینك) لەشەڕی ناوخۆدا دووچاری هەرەس هێنان بوو، بەلاّم نەبۆتە هۆی سڕینەوەی یەکجاری، کەواتە دەورو کاریگەری (یەکێتی) لەمەودوا پلەو پایەی دڵسۆزی ئەو ڕێکخراوە (یەکێتی) دیاری دەکات، ئەگەر هەڵوێستی (یەکێتی) وەك ئۆپۆزسیۆنێکی سلبی بەمەبەستی دیسانەوە ئاژاوەو شەڕ دروست کردن و بەردەوامێتی شەڕی ناوخۆ، ئەوا ئاشکرایە کە ئەگەر لەگۆڕەپانی سیاسی کوردستاندا مەوقعیەت و جەماوەرێکی مابێت ئەوا لەدەستی دەدات و تووشی هەرەسی یەکجارەکی دەبێت.

بەلاّم بەداخەوە وەك دەردەکەوێت کە زمان حاڵی ڕەسمی (یەکێتی) لەراگەیاندنەکانیان شەرعیەت بە حکومەتی هەرێم نادەن دژی ئەو کەسایەتیە دڵسۆزانەن کە لەکوردستانی باشووردا لەناو حکومەت و پەرلەماندا ماونەوەو خزمەتی کێشەی ڕەوای گەلەکەمان دەکەن و دژی ئەو حزب و ڕێکخراوانەشن کە پشتگیری‌و بەشداری لەم کابینە تازەیە دەکەن. بەبۆچوونی ئێمەو تەئکیدی لەسەر دەکەینەوە گەر ئەوە هەڵوێستی داهاتووی یەکێتی بێت، واتە (ینك) دژی بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کوردستانەو تەنها لەهەوڵی پاراستنی بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی خۆیدایەو دواجار تووشی شکستێکی وەهادەبێت کە لەگۆڕەپانی سیاسی‌دا هیچ وجودێکی نامێنێت.

**میدیا : ئەی سەبارەت بە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دەڵێن چی؟**

**هەڤاڵ ( سەربەست ):** مەوقیعیەتی گشت هێزێکی ئۆپۆزسیۆن ئەوەیە کە لە هەوڵی جدی دابێت بۆ گرتنەدەستی دەسەلاّت، دەبێ بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێ ڕوئیای نوی‌ی هەبێت بۆ کۆ کردنەوەی جەماوەرو بونیاتنانی پێگەکانی دەسەلاّتی

خـۆی لـەدوارۆژدا، بـۆ بەئـەنجام گـەیاندنی ئـەم كـارەش دەبـێ یەكگرتوویـیـەكی سـەرتاپاگیری هـەبێت و عـەقڵێكی دیموكراسـیانەی ئـەوتۆ حوكمـی بكـات، كـە لەداهاتوودا نەبێتە هـۆی تێكچوونـی ئەو هێزە ئۆپۆزسیۆنەی كە دەسەڵاتی گرتۆتـە دەسـت. بەنیسـبەت ئۆپۆزسـیۆنی عـێراقی هـەر لەسـەرتاوە نـەیان توانیـووە بەیەكگرتوویی بمێننەوەو زیاتر خەریكی كێشەو گرفتـی خۆیان بوون نـەك لەهەوڵی لەناوبردنی دیكتاتۆری لەعێراقدا.

ئاشكرایە كە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی پێش راپەرین ئەوەی كە جێی بایەخ نەبووەو بەلایانەوە گرفت نەبووە چارەسەرێكی شارستانیانەی كێشەی رەوای نەتەوەیی كورد بووە، دوای راپەرینیش لەسەر خاكی كوردستان و دواتریش لەكۆنگرەی دیمەشـق زۆربەی هەرە زۆری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی ئارەزووی حكومەتێكی فیدراڵی دیموكراتی نەكردووە بەپێی توانا دژایەتیان كردووە، كەواتە ئەوە هەڵوێستی كۆنەپەرستانەیان بێت لەكاتێكدا هیچ دەسەڵاتێكیان نییەو لەناو خۆشیاندا ناكۆكن، دەبێ لەپاشـە رۆژدا چ سەرگەردانیەك چاوەڕێی میللەتی كورد بكات ئەگەر ئەوان حوكمی عـێراق بكەن. بەڵام لەبەر پەرش و بڵاوی هێزەكانی ئۆپۆزسیۆن تائێستا نەیان توانیوە ئەلتەرناتیڤێكی واقیعیانەبن بۆ داهاتووی عێراق، ئێمە دڵنیاین كە ئۆپۆزسـیۆنی عێراقی جگە لەناوێكی گەورەو هیچ لەبارنەبوو هیچی تر نییەو ناشتوانن ببنە بەدیلی دیكتاتۆری لەعێراقدا.

* ئەم چاوپێكەوتنە لەژمارە (٨)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی یەكەم- مانگی (١٠)ی ١٩٩٦ بڵاوكراوەتەوە.

# هەندێ لایەنی تورکمانی زەحمەتە بتوانن کوردستان بکەنە قوبرسێکی تر

**دەنگی گەلی تورکمان، رادیۆی پارتی برایەتی تورکمان، لەرۆژی ١٩٩٩/١٢/٤ بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی پرۆژەکەی ( پارتی برایەتی تورکمان ) کە بۆ چارەسەری کێشەی عێراق خستوویەتیەرو، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ هەڤاڵ سەربەست مەحموود- ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتیمان YNDK کرد، ئەمەش پووختەی چاوپێکەوتنەکەیە :**

**دەنگی گەلی تورکمان : دەکرێ بەڕێزت بۆچوونی خۆت دەربڕی سەبارەت بە پرۆژەکە وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی، هەروەها هەڵسەنگاندنی بەڕێزت چییە بۆ دەق و ناوەڕۆکی سیمنارەکە لەکۆتاییدا چ تێبینیو پێشنیارت هەیە کە بۆ جەنابت ئەکرا لەکات و ساتی پرۆژەکەدا دەری ببڕیت؟**

**سەربەست مەحموود :** زۆر سوپاستان دەکەم، بەحەقیقەت بەنیسبەت پرۆژەی تورکمانیەوە پێشتر لەلایەن دوو حزبی تورکمانیەوە، دوو حزبی پاشکۆو دەست کێشی وڵاتێکی ئیقلیمی خرایە روو، کە پرۆژەکەیان هیچ سوودێکی بۆ گەلی تورکمان و ئەزموونی دیموکراتی باشووری کوردستان نەبوو، لەبارەی رەئی ئێمە لەسەر پرۆژەی دوو حزبە تورکمانییەکە لەژمارە (٥٦) رۆژنامەی (میدیا) رەئی خۆمان دەربڕیوە، دواتر لەلایەن پارتی برایەتی تورکمانییەوە پرۆژەیەکی تاڕادەیەك باشتر خرایەڕوو، ئێمە بەخۆشحاڵیەوە ئامادەبووین، بەهەرحاڵ لە هەردوو پرۆژەکەدا گرفتێك هەبوو کە ئەویش بوونی گەلی تورکمانە، کە لەوانەیە بەهۆی دەستێوەردانی وڵاتانی ئیقلیمییەوە مەسەلەی (گەلی تورکمان) ئیستغلال بکرێت، زۆرجار وڵاتە ئیقلیمییەکان شتی وەها بەحزبە تورکمانییەکان دەکەن، کە واقیعی کوردستان قبوڵی

ناکات، چونکە لەسایەی پەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا، بەهۆی سیستەمی دیموکراتییەوە، تورکمان و ئاشووری زۆر بەسەراحەتەوە باس لەگرفتەکانیان دەکەن و لەمێژووی عێراق و ناوچەکەشدا هیچ وەختێک (تورکمان و ئاشووری) نەیانتوانیوە بەو شێوەیەی ئێستایان ئازادبن، کە لەژێر سایەی پەرلەمان و حکومەتی کوردستاندا بوونەتە خاوەنی رێکخراوی سیاسیو رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆنی خۆیان، هەر لەسایەی ئەو ئازادییەی رەخساوە. زۆرجار هەندێك لایەنی تورکمانی ئەم رەوشە ئازادە هەڵدەقۆزنەوەو بۆ مەسائیلی تر بەکاریدەهێنن، لەوانەیە بوونی تورکمان کێشەی زۆربێت، چونکە بیروڕایەکی وا هەیە کە تورکمانەکان بەهۆی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە هاتوونەتە کوردستان.. ئیتر بەهەر شێوەیەك تورکمانەکان هاتبێتنە ئێرە ئەوا لەحاڵەتی ئێستادا بوونیان هەیەو دەبێت تورکمانەکانیش لەکوردستاندا بەمافە کلتووریو رۆشنبیرییەکانی خۆیان شادبن کەئێستاش بەزۆربەی هەرە زۆری مافەکانیان شادن. بەڵام کەدێن لەسایەی ئەو مافانەدا وەك ئەو دوو حزبەی ناو (بەرەی تورکمانی) دێن لە پرۆژەیەکدا کوردستان دابەشی سەر دوو (ویلایەت) دەکەن، کە ئەمەش پێشێل کردنی هەموو موقەدەسات و خوێنی خەڵکی کوردستانە، چونکە رێگە بەکەس نادرێت کوردستان دابەش بکات. بەنیسبەت پرۆژەی چارەسەری کێشەی عێراق ئەوا باشووری کوردستان هەر لەساڵی (١٩٩٢)، لەرێگەی پەرلەمان و حکومەتی شەرعی کوردستانەوە بڕیاری داوە کە بەپێی سیستمی فیدراڵی چارەسەری کێشەی کوردستان بکات، کە لەمەشروعەکەدا باشتربوو و جوانتربوو کە هەوڵ بدات تەنیا پشتگیری لە فیدراڵیەت بکات، چونکە فیدراڵیەت بۆ باشووری کوردستان چارەسەری کێشەکە دەکات و مەسەلەی دەستوورو یاسا ناوخۆییەکانی فیدراڵیەتە کە بۆ پەرلەمانی هەڵبژێردراو جێدەهێلرێت و بۆ تورکمانەکان هەر ئەوەندە بەس بوو کە دژی مەشروعەکەی دوو حزبە توورکمانییەکەی ناو (بەرەی تورکمانی) بن، ئەوەندەش بڵێین کە ئێمە فیدراڵیەتمان بۆ کوردستان قبوڵە، چونکە فیدراڵیەتی کوردستان، بەرەئی ئێمە هەنگاوێکە بۆ سەربەخۆیی کوردستان.

بەڵام باشتر بوو پیرۆژەکەی (پارتی برایەتی تورکمان) باسی لەوە بکردایە ناوچەکانی عەرەبی لەعێراقدا دابەشی سەردوو هەرێم بکات ئەویش بە شێوەی

هەرێمی سوونەو هەرێمی مەزهەبی شیعە، بۆ ئەوەی ئەو زوڵم و چەوسانەوەیەی کە لەسەر (شیعە)کانی عێراق هەبووە نەمێنێت، کەواتە مەشروع بۆ ناوەڕاست و باشوور گونجاوە، بەڵام بۆ باشووری کوردستان تەنیا پشتگیری فیدراڵی کارێکی باشە، چونکە مەشروعی چارەسەر لای پەرلەمان و حکومەتی کوردستانە، کەواتە پرۆژەی چارەسەر بۆ کوردستان شتێکی زیادەو باش نییە.

ئەوەی دەمەوێ ئاماژەی پێبکەم، ئەوەیە کە مەشروعی دوو حزبە تورکمانیەکەی ناو بەرەی تورکمانی ناوی کوردستان بە (المنطقة الجبلية) دەبەن، کەواتە ئەرکی هەموو گەلی تورکمان و ئاشووریشە کە دژی ئەو جۆرە کارانەبن کە خزمەتی هیچ لایەکمان ناکات، لەبەر ئەوەی پێش ئەوەی تورکەکان بێنە ناوچەی ئەنادۆڵ و ناوچەکە بەگشتی حوکمی کوردیو ئیمپراتۆریەتی (میدیا) هەبووە، کەواتە هەر لایەك ئەگەر بیەوێ ئایندەی سیاسی لەکوردستان بێت جوان نییە کوردستان بە (ناوچەی شاخاوی) ناوببات چونکە لەم حاڵەتەدا جەماوەری خۆیان لەدەست دەدەن.

بەڵام جێگەی خۆشحاڵییە کە چەندین حزبی تورکمانی ولاّتپارێز لەم دواییەدا بەڕاشکاوانە بیروڕای خۆیان لەبارەی کوردستانی بوونیان و پشتگیریان بۆ پەرلەمان و حکومەتی کوردستان دەربڕی.

بەڵام هەندێ لایەنی توکمانی کە داوای ئۆتۆنۆمیو سەربەخۆی بۆ تورکمان دەکەن، ئەمە هەڵەیەو زەحمەتە بتوانن کوردستان بکەنە (قوبرس)ێکی تر، چونکە خەڵکی کوردستان لەپێناو ئازادیو رزگاریدا خوێنێکی زۆری ڕشتووە. کەواتە داواکردنی (ئۆتۆنۆمی) بۆ تورکمان، کارێکی ئاژاوە گێڕییەو داواکردنی مافە رۆشنبیرییەکان بۆ تورکمان و پشتگیری لەسیستمی دیموکراتی کوردستان لەخزمەت رەوشی کوردستاندا دەبێت، لەکۆتاییدا زۆر سوپاسی دەنگی گەلی تورکمان دەکەم و بەخێربێن.

* ئەم چاوپێکەوتنە لەژمارە (٥٧)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- رۆژی ١٩٩٩/١٢/١٥ بڵاوکراوەتەوە.

# ئەگەر خەڵكانێك خیانەتكار بن بەوڵاتی خۆیان و دژی وڵاتی خۆیان بن، دەبێ ئەم خەڵكانە تاچ رادەیەك لەدیموكراتیەت گەیشتبن، هەتاوەكو بڵێن لێرە دیموكراتیەت نییە

ئێزگەی دەنگی گەلی توركمان-ی پارتی برایەتی توركمان لەرۆژی ٢٠٠٠/٤/٢٤ لەبەرنامەی سەكۆی برایەتی خۆیدا میوانداری هەڤاڵ سەربەست مەحموود- ئەندامی مەكتەبی سیاسی یەكێتیمان YNDKی كردو ئەم هەڤپەیڤینەی لەگەڵ هەڤاڵ سەربەست مەحموودا سازدا لەبەر گرنگی بابەتەكە دەقی هەڤپەیڤینەكە بلاودەكەینەوە:

* دەنگی گەلی توركمان: دیارە لەدوای راپەرینە شكۆدارەكەی ئاداری ١٩٩١ كەش و هەوایەكی ئازاد بۆ گەلی كوردستان هاتۆتە ئارا تەنانەت كار بەوە گەیشتووە هەندێ لایەن بەجۆرێكی تر وەسفی ئەم دیموكراتیە دەكەن بیرو بۆچوونی جەنابتان و شێوازی شیتاڵ كردنتان بۆ مەفهومی دیموكراتیەت لەهەرێمی كوردستانی ئازاد كراودا چییە؟

- هەڤاڵ سەربەست مەحموود: سەرەتا زۆر سوپاسی رادیۆكەتان دەكەین كە زۆر جاران لەرووداوە سیاسیە گرنگەكاندا راو بۆچوونی خەڵك و حزبە سیاسیەكان وەردەگرێت. ئەمەش شتێكی زۆر باشەو زیاتر خزمەتی پرۆسەی دیموكراتیو وشیاری جەماوەری دەكات و دیارە رادیۆكەشتان بەشانازیو بەجەرائەتەوە ئەم كارانە دەكات.

سەبارەت بەبوونی دیموكراتیەت لەباشووری كوردستاندا دەتوانین بڵێین كە دیموكرتیەت پرۆسەیەكی سیاسیو كۆمەڵایەتیو فەرهەنگییەو، لەزۆربەی وڵاتاندا

شێوازی جیا جیای بەخۆوە گرتووە، بەڵام سەرجەمی دیموکرتیەت دەتوانین بڵێین و لەوەدا چڕی بکەینەوە کە ئامانجی پاراستنی مافی ئینسانەکانە بەگشتی، جا ئەم مافانەش کە وەك وتمان شتێکی زۆر ئاساییە کە گۆڕانی بەسەردا بێت و لە جێگەیەکەوە تا جێگەیەکی تر، خاڵێکی تریش هەیە کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەهۆی ئەو پێشکەوتنانەی بەخۆیەوە بینیوە. حەتمیەت شێوازی تێگەیشتنیان لەدیموکراتیەت دەگۆڕێت، وە شتێکی زۆر واقعیشە لەکۆمەڵگایەکیشدا چین و توێژە جیاوازەکان هەریەکەو بەپێی تێڕوانین و ئاستی تێگەیشتن و ڕۆشنبیریان سەیری دیموکراتیەت بکەن و پێناسەی بکەن و لەگەڵ واقعی دیموکراتیشدا بەپێی ئاستی تێگەیشتنیان هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکەن، ئەمە شتێکی سروشتیەو لەهەموو جێگایەکیشدا هەیە، بەڵام دیموکراتیە ت لەهەموو جێگەیەکی سەر زەمیندا کە بریتیە لەفکری مرۆڤ بۆ ئیدارەکردنی خۆی. شتێکی باشە کە بەپێی هەل و مەرج و بنەماکانی هەر وڵاتێك و بەپێی ڕەوشی گونجاوی ئەو وڵاتە لەناو خۆو دەرەوەدا دیموکرتیەت پیادە بکرێ‌و ڕێك بخرێ بەڵام مەفهومی دیموکراتیەت لەئاداری ١٩٩١ەوە لەکوردستاندا شکڵێکی وەهای لەخۆ گرت کە نەتەوەکەمان سەرەتا بوو لەژێر چنگی ڕژێمی فاشی عێراقی کە چەندین ساڵ بوو لەسایەیدا دەژیا ڕزگاری ببوو، کە زوڵم و جینۆسایدێکی بەرفراونمان لەسەر بوو، ئەوە بوو لەراپەڕینەکەشدا نەتەوەکەمان توانی سەربەخۆییەکی تاڕادەیەك فراوان بەدەست بێنێ‌و زۆر کاری جەماوەری بکاو ببێتە خاوەنی پەرلەمان و حکومەتی شەرعی خۆی‌و.. ئیتر ئەم ڕەوشە وایکرد کە خەڵکی ئێمە سەرەتا بەشێوەیەکی هەڵە لەدیموکراتیەت تێبگەن، بەڵام وردە وردە لەژێر سایەی حکومەتی باشووردا پرۆسەی دیموکراتیەت شکڵێکی جەماوەری واقعیانەی گرتە بەرو لەو ڕۆژەوە سەیر دەکەین ڕۆژ بەڕۆژ خەڵك زیاتر هەست دەکات کە دیموکراتیەت مانای چەسپاندنی یاساو پاراستنی مافی ئینسانەکان، واتە خەڵکی ئێمە لەئەنجامی بوونی حکومەتی کوردستاندا لەمەفهومی دیموکراتیەت تێگەیشتووە دەزانێت کە دیموکراتیەت (بەرەڵایی) نییە، شیتەڵکردنی مەفهومی دیموکراتیەت لەکوردستانی ئازاددا بەڕەئی ئێمە بوونی دیموکراتیەت لەباشووری کوردستاندا شێوەیەکە، کە لەهەموو وڵاتە ئیقلیمیەکانی ناوچەکەدا دیموکراتیەتێك نییە بەو شکڵەی ئێمە واتە دیموکراتیەتێك هەیە کە مافی ئاینی‌و کەلتوری‌و نەتەوەیی هەموو لایەك دەپارێزێ‌و خزمەت بەبیری

هەموو نەتەوەو حزبە سیاسییەكانیش دەكات و لەماوەی ئەو نۆ ساڵەشدا بۆ داگیركەرانی كوردستانیش سەلمێنراوە كە بوونی دیموكراتیەت لێرە ئەوەندە بەرفراوانە كە پێویستە ولاتە داگیركەرەكانی كوردستان و هەموو دیكتاتۆرەكانی ناوچەكەش سوود لەو ئەزموونەی باشووری كوردستان وەربگرن.

*** دەنگی توركمان: ئایا ئەوانەی پڕو پاگەندەی نەبوونی دیموكراتیەت دەكەن، دەبێ چ مەبەستێكیان هەبێت؟!**

- **هەڤاڵ سەربەست مەحموود:** لەبابەت پڕو پاگەندەی دیموكراتیەت، بەقەناعەتی ئێمە لەوانەیە زۆر حزبی سیاسی لێرە هەبن و لەپشت ئەوەوە بن كە بڵێن دیموكراتیەت نییە، جا ئەم حزبانە دەكرێ ئێمە لەهەر رووداوێكی سیاسیدا كە روودەدات قسە لەسەر سیاسەتی ئەو حزبانە بكەین، واتە سیاسەتی ئەو حزبانە لەڕووداوە سیاسیەكاندا ڕوون بكەینەوە، بۆ نموونە ئەگەر حزبێكی سیاسی پێشێلی دیموكراتیەت دەكات، ئەوا پێویستە ئێمە لەڕاگەیاندنەكانی خۆمانەوە قسە لەسەر سیاسەتەكانی ئەو حزبە بكەین، لەڕۆژانی ئەمڕۆشماندا دەتوانین بڵێین لایەنێك كە زۆر بەرەقی پڕوپاگەندەی ئەوە دەكات كە لێرە چەوسانەوە لەسەر برا توركمانەكان هەیە لایەنێك بەناو (بەرەی توركمانی)یە كە هەرچەندە هەڵوێستی سیاسی ئێمە هەر لەسەرەتای دروست بوونی بەناو (بەرەی توركمانی)یەوە ڕوونبووە، زۆر حزبی سیاسی هەبوو رۆژانێك سەردانی بەناو (بەرەی توركمانی)یان دەكرد. كە وەك هەموو لایەك ئاگادارن هەر لەیەكەم رۆژەوە پەیوەندیمان لەگەڵدا نەبەستوون، چونكە زۆرجار لەرۆژنامەكەماندا مەلەفمان كردۆتەوەو پارتی برایەتی توركمانیش قسەی خۆی كردووە، واتە وتوومانەتە جەماوەر كە ئەوانە نوێنەری خەڵكی توركمان نین و، ئەو ئاشەی كە بەناو بەرەی توركمانی هەڵدەسوڕێنێ خیانەتە. ئەگەر بێتوو خیانەت نەمێنێ ئەوا بەناو (بەرەی توركمانی)ش رادەوەستێ‌و نامێنێ جا ئەوڕۆش مەسەلەی بەناو بەرەی توركمانی بۆتە بابەتێك كە دەڵێن لێرە دیموكراتیەت نییە، بەقەناعەتی هەموو لایەك ئەگەر خەڵكانێك خیانەت كار بێت بەولاتی خۆی جاسووسی بۆ ولاتان بكات دژی ولاتی خۆی كە چەندین ساڵە تیایدا دەژی، دەبێ ئەم خەڵكانە تا چ رادەیەك لەدیموكراتیەت گەیشتبن هەتاوەكو بێت و بڵێت لێرە دیموكراتیەت نییە. بەقەناعەتی ئێمە بەناو (جەبهەی توركمانی) كە دەیەوێت بڵێت (منیش توركمانم لەسەر ئەم خاكە) ئەوا لەمەفهومی دیموكراتیەت نەگەیشتووەو، ئەو ولاتە ئیقلیمیەش

که هاوکاری بەناو (جەبهەی تورکمانی) دەکات هەتاوەکو ئێستا لەکاری تیرۆرستیو جینۆسایددا نوقم و غەرق بووە. واتە ئەگەر حکومەتی تورکیا چەوسانەوەی (١٣-١٤) ملیۆن کورد لەکوردستانی بن دەستی تورکیادا بەڕەوا دەبینێو دێت لێرە هاوکاری جەبهە)ش دەکات بۆ ئەوەی بڵێ دیموکراتیەت نییە، بەناو (بەرەی تورکمانی) ئەگەر دیموکراتیە با بچێت رەخنەی حکومەتی تورکیا بکات کە حەفتا ساڵە زوڵم لەمیللەتی کورد دەکات، ئەمە بۆ مەسەلەی دیموکراتیەت، بەقەناعەتی ئێمە ئەگەر یەکێك خیانەتکارو جاسووس بێت زەحمەتە بزانێ دیموکراتیەت چۆنەو چییە. چونکە دیموکراتیەت هەر قسە نییە، دیموکراتی وەك وتمان پرۆسەیەکی سیاسی کۆمەڵایەتییە لەواقیعدا دەردەکەوێ ئەو حزبانە کە واقعی خۆیان جاسووس بێت چۆن ئەتوانن لەدیموکراتیەت بگەن، خۆ دیموکراتیەت مانای بەرەڵایی نییەو دیموکراتیەتی حکومەتی کوردستانیش کۆمەڵێ یاساو پرنسیپی هەیە کە هەوڵ دەدات دیموکراتیەت بخاتە خزمەتی خەڵکی کوردستانەوە، بەڵام بەناو (بەرەی تورکمانی) دەیەوێ دیموکراتیەت بخاتە خزمەت رەوشی خیانەتکارانەی خۆیەوە، جا ئەمەش پرۆسەیەکە بەقەناعەتی ئێمە دەبێ رێی لێ بگیرێو هەموو حزبە سیاسیەکانیش هەوڵ بدەن کە ئەو سیاسەتە رسوا بکەن کە دەیانەوێ رەوشی ئازادو دیموکراتی کوردستان ئیستغلال بکەن.

*** دەنگی گەلی تورکمان: هەڵوێستتان بەرامبەر هەردوو جەمسەری بزوتنەوەی تورکمانی لەکوردستاندا چییە؟**

**- هەڤاڵ سەربەست مەحموود:** دوو جەمسەری بەقەناعەتی ئێمە ئەگەر پێش ئێستە بگوترایە شتێك بوو زۆر حزبی سیاسی کوردیش دەیانگوت هەیە، ئەو حزبانەی کە پشتگیری پەرلەمان و حکومەتی کوردستان دەکەن و ئەو حزبانەی کە دژی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان بوون، بەڵام لەدوای ئەوەی کۆمەڵێك هەڵس و کەوتی ناڕەوای بەناو (بەرەی تورکمانی) بینرا، بۆ هەموو خەڵکی کوردستان روون بۆوە کە دوو جەمسەری نییەو، بەبڕوای ئێمە تورکمان دوو جەمسەر نییەو حزبی تورکمانیش دوو جەمسەری نییە، بەڵکو یەك جەمسەرن، واتە ئەوانە حزبن کە هەڵقوڵاوی ناو ناخی کۆمەڵگاکەیانن، حزب پێویستە هەڵقوڵاوی جەماوەر بێت، حزبە تورکمانەکانیش کە پشتگیری حکومەتی کوردستان دەکەن، ئاشکران کە کێن و هەڵوێستی سیاسیشیان دیارە، وەك پارتی برایەتی تورکمان و کۆمەڵەی رۆشنبیری

تورکمانی‌و چەند حزبێکی تری تورکمانی کە هەن، ئەمانە حزبی تورکمانین و جەمسەرێکی روونی ولاتپارێزیان هەیە، بەلام بەناو (بەرەی تورکمانی) هیچ جەمسەرێکی تورکمانی پێك ناهێنێ‌و پێویستیش ناکات وەك جەمسەر بێتە ناوهێنان، چونکە ئەوانە چەند حزبێکن و لێرە دروست کراون و لەڕاستیشدا حزب نین بەڵکو کۆمەڵێ خەڵکی خیانەتکارن و، بەزۆر دەیانەوێت خۆ بکەنە حزب، واتە حزب نین چونکە ئەگەر حزب بن خیانەت لەجەماوەری خۆیان ناکەن، لەکاتێکدا ئەوان دێن خیانەت لەجەماوەری تورکمانی دەکەن، بۆ بەرژەوەندی مادی خۆیان و دەیانەوێ رەگێکی دوژمنکاری لەنێوان کوردو تورکمان چێ بکەن و لەو ئاژاوەیەشدا سوودێکی مادیان پێ ببڕێت و ولاتێکی ئیقلیمی پێیان بڵێ شتێکی چاکتان کردووە، لەکاتێکدا بڕوا دەکەم ئەو سوودەی کە ئەوان دەیبینن شتێکی کاتییەو کۆتایی دێت و دوا رۆژو ئایندەی سیاسی‌و شەخسیەتی سیاسیش بۆ ئەو حزبانەیە کە لێرە پشتگیری لەچارەنووسی میللەتی خۆیان و لەو ئەزموونە دیموکراتیەش دەکەن کە لێرە پیادە دەکرێت، چونکە زەحمەتە بەناو (بەرەی تورکمانی) بتوانێت جارێکی تر لەکوردستاندا سیاسەتی تورك چێتی بسەپێنێ، چونکە سیاسەت بەبوونی جەماوەر دەسەپێ، بەلام هەموو بەناو (بەرەی تورکمانی)و قاعیدەشیان لەچەند عائیلەیەك تێناپەڕن و دوا رۆژی جەماوەری بوونیش بۆ حزبەکانی ترە هەروەك دەبینین کە ئێستا لەحکومەتی کوردستانیش دا بەشدارن، خۆ ئەگەر ئەو سیاسەتە شۆفینیە نەبوایە، ئەوا دوور نەبوو ساڵی ١٩٩٢ تورکمانەکانیش لەپەرلەمان بەشدار بوونایە، بەلام چونکە بەناو (بەرەی تورکمانی) لەخەمی جەماوەردا نین، ئەوا چوونە ناو حکومەت و پەرلەمانی کوردستانی رەفز دەکەنەوە، لەکۆتاییدا هیواداریین کە رادیۆکەتان و هەموو لایەك هەوڵ بدەین سیاسەتی ناڕەوای ئەو خەڵکانە ڕوون بکەینەوەو لەجەماوەر بگەیەنین کە ئەوانە نوێنەری تورکمان نین، بەڵکو ئەوانە نوێنەری تورکمانن کە پشتگیری لەبوونی تورکمان لێرە دەکەن و خزمەتی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان دەکەن.

* ئەم چاوپێکەوتنە لەژمارە (٦٥)ی رۆژنامەی میدیا- ساڵی چوارەم- لەڕۆژی ٢٠٠٠/٥/١ بلاوکراوەتەوە.

# ڕوانینێك لەپەنجا ژمارەدا

سەرەتای مانگی ئەیلولی ١٩٩٩، ڕۆژنامەی میدیا، پەنجاهەمین ژمارەی خۆی دەخاتە بەردەست خوێنەرانی نەتەوەیی‌و ولاّتپارێز، لەڕاستیدا بێپێچ و پەنا دەتوانین بڵێین میدیا، هەر لەسەرەتاکانی دەرچوونی چەند ژمارەیەك لێی، توانی ڕێچکەی بوێرانەو ولاتپارێزانەی خۆی دیاری بکات و ئاماژەش بەهەموو لایەنێکی باش و خراپی ئەزموونەکەمان بکات و لەکات و سەردەمانی بوونی شەڕی ناوخۆشمان (میدیا) وەك زمانحاڵی YNDK زۆر بەجورئەتەوە شەڕخوازان و هەڵگیرسێنەرانی شەڕی ناوخۆی دەستنیشانکردووە.

هەروەها (میدیا) لەڕووی بیری نەتەوەیشەوە، داکۆکیکارێکی واقیعیانە بووەو (پەنجا) ژمارەی (میدیا)ش گەواهی ئەو ڕاستیەن، لەهەمان کاتدا (میدیا) توانیوویەتی خەوش و کێماسی ئەو بیرو ئایدۆلۆژیا قاڵب گرتووانە ڕەخنە بکات کە لەڕابردوو.. ئێستاماندا زیانیان بەبیری نەتەوەیی گەیاندووە، سەرەڕای ئەوەی کە (میدیا) لەو ماوە کورتەی تەمەنیدا توانیوویەتی، بەرهەم و نووسراوی پارچەکانی تری کوردستان بلاّوبکاتەوەو ڕاشکاوانەش سیاسەتی داگیرکارانەی هەر یەك لە (عێراق و ئێران و سوریا و تورکیا) بەرانبەر بەکوردستان ئیدانە بکات..

ئەگەر بەشێوەیەکی سەرپێی‌و خێراش بێت لەو چەند دێڕەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ڕۆژنامەی میدیا، کۆمەڵێك ئەرکی نەتەوەیی پیرۆزی لەئەستۆ گرتووەو بەپێی واقیعی ئامادەی ڕۆژنامەکەش دووچاری چەندین کۆسپی ماددی‌و مەعنەوی هاتووە، کەهەندێ جار مانگانەیا دووهەفتە جارێك.. دەربچێت، کە ئەمەش حەتمەن کاریگەری خۆی کردۆتە سەر ئامانج و سیستەمی کاری (میدیا) کە بۆ خۆی دایڕشتووە، چونکە ئاشکرایە کە میدیا ڕۆژنامەی هەواڵە نەتەوەیی‌و چالاکییەکانی YNDK و بیری نەتەوەیی‌و ئاستەنگەکانی بووە، کەئەمەش بۆ ڕۆژنامەیەکی مانگانە یاخود دووهەفتە جارێك زەحمەتە سەرەڕای ئەوەی کە (میدیا)ش وەك سەرجەم بواری کاری ڕۆژنامەیی لەکوردستاندا خاوەنی گرفتی هاوبەشن لە نەبوونی کادیری ڕۆژنامەوانی خاوەن بڕوانامەو.. بەلاّم بەهەر حالّ (میدیا) ئێستا خاوەنی خەسڵەت و سیمای نەتەوەییانەی خۆیەتی‌و توانیوویەتی لەناو خوێنەراندا بەبابەتە گەرمەکانی خۆی سەرنجیان ڕابکێشێت و جێگەی بڕواو متمانەشیان بێت.

لەکۆتایدا دەڵێین.. سلاّو.. ڕێز بۆ هەموو کارمەندان و ئەو قەڵەمە نەتەوەیی‌و بوێرانەی کە بەشداربوون لەکاروانی خەباتی ڕۆژنامەی میدیای تێکۆشەردا.

* ئەم ڕوانینە لەژمارە (٥٠)ی ڕۆژنامەی میدیا- ساڵی سێیەم- لەڕۆژی ١٩٩٩/٩/١ بلاّوکراوەتەوە.

# سەرخۆبوون لەدیدی
# شەهید سەربەست مەحموودا

کوردستانی کۆلۆنیالکراو رەوشێکی وەهای خولقاندووە کە ئەرکی گرنگی خەباتی رۆژنامەوانی بەتایبەتیو راگەیاندنی کوردی بەگشتی، دەبێت لەخزمەتی گۆڕینی واقیعی بندەستی کورد دابێت، بەرەو بنیات نانی کوردستانێکی سەربەخۆو ئازاد، واتە نووسراوو بیستراوی کوردی-ولاٚتپارێز دەبێت لەخزمەتی وشیاری نەتەوەییماندا بێت، دیارە رێگاکان و شێوازی گەیاندن و بلاٚوکردنەوەی ئەم وشیارییە بەپێی واقیع و قۆناغی ژیانکردنی هەر پارچەیەکی کوردستان گۆڕانی بەسەردا دێت، یاخود دەتوانین بلێین لەپارچەیەکی کوردستانیشدا لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر پێویستی بەگۆڕانکاری هەیە، بەتایبەت کەجیهانی ئەمرۆمان سەردەمی (ئایدۆلۆژیای چەقبەستوو)ی تێپەڕاندووە، تاك و کۆمەڵگەی کوردیش چیتر رێگەنادات دۆزی رەوای بکرێتە قوربانی ئایدۆلۆژیایەکی لەقاڵبدراو.

(سەرخۆبوون) گۆڤارێکە لەکاروانی رەوت و بیری کوردایەتی ولاٚتپارێزی لەکوردستانداو هەوڵدەدات لەپێناو دەوڵەمەند کردنی ئەم هزرەو دەرخستنی حەقیقەتەکانی گۆرەپانی هزریو کردنەوەی دەرگاکانی گفتوگۆ لەبەرامبەر هەر هزرو بیرێکی ئامادە لەگۆڕەپانی کوردستاندا بەگیانێکی دیموکراتییانەی هاوچەرخ. دیارە کردنەوەی دەرگاکانی گفتوگۆ قەناعەتێکی هزرییە، کە سەرچاوەکەی بیری کوردایەتییەو مێژووی (کوردایەتی)ش، ئەوەی سەلماندووە کەمرۆڤە نەتەوەییەکان لەناو برافی رزگاریخوازیماندا زیاتر لەهەر کەسێك و بیرێکی تر قبوڵی بیری جیاوازیان کردووەو بەشێوازێکی سەردەمانەش مامەڵەیان لەگەڵ کردووەو رەخنەی واقیعیانەشیان ئاراستە کردووە.

بەکورتی دەخوازین (سەرخۆبوون) بتوانێت ئەزەنگێك بدات بەبیری نەتەوەیی کوردیو بلاٚوکردنەوەی بیری سەربەخۆیی خوازیو ولاٚتپارێزی.

# راستیی کوردایەتیو ئەرکەکانی

واقیعی ئەمڕۆمان سەلماندویێتی (کوردایەتی) ئەو هزرەیە، کە کەموکورتیو بۆشاییەکانی رۆحیو عەقڵییەکانی مرۆڤی کورد پڕ دەکاتەوە. واتە هزری نەتەوەیی تەنیا لەسەر لایەنی سۆزو رۆح یاخود لەسەر لایەنی پابەند بوونی یەك لایەن بەعەقڵ دانەمەزراوە، بەڵکو بەو شێوەیە کە سەرتاپاگیر کێماسییە رۆحیو عەقڵانییەکانی مرۆڤ چارەسەر دەکات (ئەگەر بەشێوەیەکی زانستیانە پێڕەو بکرێو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ)، هەر بۆیەش لەمڕۆماندا هزری کوردایەتی زیاتر لەهەر بیرێکی تری سەر گۆڕەپانی سیاسیو جەماوەری کوردستان بەشێوەیەکی سەرتاپاگیر خۆی دەنوێنێو رۆژ لەدوای رۆژیش بەجەماوەریتر دەبێتەوە..

دەبینین ئەمڕۆ لەزۆر لاوە هەوڵدەدرێت کە نەتەوەکەمان دووچاری سەرگەردانی بکرێت، سەرگەردانی لەهەموو روویەکەوە (سیاسی- جەماوەری- کلتوری..)، بەلاّم تائێستا نەتوانراوە بە یەککگرتوویی بەرنگاری ئەم (سەرگەردانییە) ببینەوە، بەڵکو هەر کەسەو بەپێی هزری خۆی تێیدەڕوانیو هەوڵی چارەسەر کردنی دەدات و، هەندی کەس و لایەنی تریش بە (هۆشیاری یاخود ناهۆشیاری) پشتیوانی لەپرۆسەی (سەرگەردان) کردنی نەتەوەکەمان دەکەن، بۆ خۆپاراستن لەم حاڵەتە پێویستیمان بەوە هەیە، رەوشت (ئەخلاق)ی کار کردنی خۆمان بناسین و بزانین تاچ سنوورێك، تا چ رادەیەك و بە چ شێوەیەك کار کردنی سیاسیو جەماوەریو کلتوری دەبێتە نیشانەی رەوشت بەرزیو خزمەتکردن، دیارە ناساندنی رەوشت (ئەخلاق) لەبواری سیاسیو ئابووری.. پێناسەی جیاواز لەخۆ دەگرێت و گونجاویشە، کە بەپێی گۆڕانکارییەکانی سەردەمیش پێناسە کردنی هەر چەمکێکی کۆمەلاّیەتی-

سیاسی گۆڕانی بەسەردا بێت، بەڵام ئەمڕۆ لەپێناو پاراستنی دەستکەوتەکانی ڕاپەڕیندا حەقیقەتێك خۆی دەچەسپێنێ کە ڕەوشی سیاسیو کلتووریو کۆمەڵایەتیمان لەخزمەتی یەکتردا بن و ڕێگە نەدرێت بەهیچ بیانوویەك ناتەبایی لەناو لایەنەکانی ژیانی خەڵکی کوردستاندا دروست ببێت.

ئەگەر ئاوڕێك لەرابردوومان بدەینەوە دەبینین زۆر کەس و هەندێك لایەنی سیاسیش پێیان وابووە کە (کوردایەتی) بیرێکی (مەرحەلییە)، بەڵام واقیعی ژیان سەلماندی کە ئایدۆلۆژیا هێنراوو نامۆکان (مەرحەلیین)..، هەر بۆیەش ئەو هزرە نامۆیانە نەیانتوانی یاخود واقیعی ژیان ڕێی پێنەدان کە لەگەڵ ڕەوتی ژیان و خۆڕاگری (کوردایەتی)دا بەردەوام بن، هەر بۆ نموونە سەردەمانێك دەوترا کە دەبێ (بیری پرۆلیتاری) ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازییمان بکات، یاخود تەنیا لەڕێگەی ئایینەوە ڕزگارمان دەبێت..، کەچی ئەمڕۆ سەراپای هزرو ئایینەکانی کوردستان ئەگەر لەپێناو مانەوەی خۆشیاندا بێت، ئەوا پشتیوانی خۆیان بۆ هزری کوردایەتی دووپات دەکەنەوە.

لەڕاستەوە:

١. د.ئەلیاس- کەسایەتی ئێزیدی ٢. شەهید سەربەست مەحموود ٣. غەفوور مەخمووری

٤. د.ڕۆژ نوری شاوەیس (لەکاتی ئەم وێنە گرتنە سەرۆکی حکومەتی کوردستان) بوو.

شەهید سەربەست مەحموود

لەکاتی سەردانی ئەنجومەنی وەزیرانی حکومەتی کوردستاندا (١٩٩٩/٢/٩)

شەهید سەربەست مەحموود- لەکاتی پێشوازیکردن لە بەڕێز کاك مەسعود بارزانی
ڕێبەری بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانی کوردستان دا کە بەڕێزیان بۆ جەژنانە
سەردانی بارەگای مەکتەبی سیاسی یەکێتیمان YNDKی کرد (١٩٩٨/٢/٥)

شەهید سەربەست مەحموود لەسەردانی مەزاری نەمران
(بارزانی نەمر و کاکە ئیدریسی هەمیشە زیندوو) دا لەبارزان (١٩٩٩/٣/٢١)

شەهید سەربەست لەکاتی پێشوازیکردن لە بەڕێز شێخ ئەدهەم بارزانی
ڕێبەری حزب اللەی شۆڕشگێڕی کورد- کە سەردانی بارەگای یەکێتیمان YNDK ی کرد

لەچەپەوە:

١. شەهید سەربەست مەحموود ٢. غەفوور مەخمووری
٣. سەید جەلالەددین حوسێن- ڕابەری سازمانی خەباتی نەتەوایەتیو ئیسلامی کوردستان
(ڕۆژهەلات) ٤.بابەشێخ حوسێن- مەکتەبی سیاسی سازمان ٥. عەبدوڵلا عەدۆ
(٢٠٠٠/٥/٦)

بەڕێز کاک حاجی مەحموود فەتاح براخاس مۆریاسی
باوکی شەهید سەربەست
(٢٠٠٠/٧/١٠)

شەهید سەربەست لەگەڵ نوێنەری پارتەکانی باکووری کوردستان

شەهید سەربەست لەیادی رۆژی رۆژنامەگەری کوردی لەهاوینەهەواری جوندییان

( ٢٢ / ٤ / ٢٠٠٠ )

شەهید سەربەست مەحموود لەسێیەم ساڵیادی دامەزراندنی YNDK

لەڕاستەوە: ١.مام عەزیز- مامی کاک غەفوور مەخمووری ٢.شەهید سەربەست مەحموود

٣.هەڤاڵ غەفوور مەخمووری ٤.کاک فازل میرانی- ئەندامی مەکتەبی سیاسی PDK

٥.شەهید فرەنسۆ هەریری (١٩٩٨/٣/٢٠)

شەهید سەربەست لەکۆنگرەی سێیەمی YNDK دا (١٩٩٩/١/١٢)

شەهید سەربەست مەحموود لەچوارەم ساڵیادی دامەزراندنی YNDK دا (١٩٩٩/٣/٢٥)

شەهید سەربەست مەحموود لەکاتی گفتوگۆ کردن لەگەڵ حوسێنی یەزدانپەنا
سکرتێری یەکێتی شۆڕشگێڕانی گەلی کوردستان (رۆژهەڵات) لەچوارەم ساڵیادی YNDK دا
(١٩٩٩ / ٣ / ٢٥)

شەهید سەربەست لەگەڵ هەڤاڵ غەفوور مەخمووریو هەڤاڵانی هەرێمی سۆرانی YNDK دا

شەهید سەربەست مەحموود لەکۆنفرانسی یەکەمی یانەی وەرزشی میدیا- (١٩٩٩/٥/٥)

**شەهید سەربەست لەگەڵ هەڤاڵ ئاکۆ محەممەد لەگفتوگۆیەکی رۆشنبیریانە**
**لەگەڵ بەڕێز دکتۆر جەمال رەشید- مێژوونووسی ناوداری نەتەوەکەمان**

**لەڕاستەوە:**

**١. قەهار تاهیر ٢. دکتۆر جەمال رەشید ٣. شەهید سەربەست مەحموود**

لەڕاستەوە:

١. شاخەوان خالید ٢. شەهید سەربەست مەحموود ٣. غەفوور مەخمووری

٤. ئاکۆ محەممەد (لەگەشتێکدا بۆ پردی دەلال لەزاخۆ) ١٩٩٩

شەهید سەربەست لەگەڵ پۆلێك هەڤاڵ و خوێندەڤانانی

کۆلیژی ئاداب لەسەردەمی خوێندنی لەزانکۆدا (١٩٩٤/١١/٢١)

شەهید سەربەست لە پرسەی کارەساتی قوربانیانی تۆپبارانکردنی حاجی ئۆمەراندا

( ١٥ / ٧ / ١٩٩٩ )

ڕێورەسمی بەڕێ کردنی تەرمی پیرۆزی شەهید سەربەست مەحموود بۆ شاری سلێمانی

( ١ / ٦ / ٢٠٠٠ )

چلەی ماتەمینی شەهید سەربەست مەحموود

( ١٠ / ٧ / ٢٠٠٠ )

چلەی ماتەمینی شەهید سەربەست مەحموود

( ١٠ / ٧ / ٢٠٠٠ )

باوك و براكانى شەهيد سەربەست مەحموود لەگەڵ هەڤاڵانى YNDK دا ( ٣١ / ٥ / ٢٠٠١ )

پێرست